# یەکەمین و دوایین رزگاری

## (فەلسەفە/ دەروونناسی)

ج: کریشنامورتی

و . سەعید سەیدی



دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **یەکەمین و دواین رزگاری (فەلسەفە/ دەروونناسی)**
- نووسینی: ج: کریشنامورتی
- وەرگێڕانی: سەعید سەیدی
- نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسێن
- بەرگ: حەمیدە یوسفی
- ژمارەی سپاردن: (٢٣٤١)
- نرخ: (٢٥٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠٠٩
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

**زنجیرەی کتێب (٤١٨)**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

# فەسڵی یەکەم

## پێشەکی

تەنانەت ئەگەر بەچاکیش یەکتر بناسین پێکهێنانی پەیوەندی کارێکی دژوارە. لە وانەیە ئەو وشانەی کە من بەکاریان دەبەم بۆئێوە مانای تایبەتییان هەبێت. تێگەیشتن کاتێك بوونی دەبێت کە ئێمە، ئێوە و من، لە یەك کاتدا و لە یەك ئاستدا پێکەوە بەرەو ڕوو بینەوە. واتە لە نێوان جەماوەر، نێوان ژن و شوو و نێوان دۆستانی نزیك سۆزو خۆشەویستی بوونی هەبێت. بەشتێکی وەهادەڵێن گۆڕینەوەی ڕاستەقینەی هزرو سۆز. کەوابوو تێگەیشتنی گورج و دەستبەجێ کاتێك دێتەدی کە پەیوەندیمان هاوکات و هاوتەریب بێت.

گۆڕینەوەی سۆز و بیر بە شێوەیەکی ئاسان و کارێگەر و بەشێوازێکی پراکتیکی، تایبەت زۆر دژوارە. من لە وشە سادەکان کەڵك وەردەگرم، وشە ناتەکنیکییەکان، لەبەر ئەوە پێم وانییە وشە تەکنیکییەکان بتوانن لە چارەسەرکردنی گرفت و کێشەکاندا یارمەتیمان بدەن. کەوابوو لە هیچ زاراوەیەکی تەکنیکی دەروونناسی یان زانستی کەڵك وەرناگرم. بە خۆشییەوە هیچ جۆرە کتێبێکی دەروونناسی یان مەزهەبیم نەخوێندووەتەوە. حەزدەکەم بەیارمەتی ئەو وشە سادانەی کەلە ژیانی ڕۆژانەماندا کەڵکیان لێوەردەگرین چەمکێکی قووڵترتان پێ بڵێم؛ بەڵام ئەگەر ئێوە شێوازی گوێ گرتن نەزانن ئیشی من زۆر دژواردەبێت. بۆ ئەوەی کە بتوانین بەڕاستی گوێ بگرین دەبێت بە تەواوی دەست لە سەر دەمار- گیرییەکان و یاساو ڕێسای لە پێشدا داڕێژراو و چالاکیەکانی ڕۆژانە هەڵ بگرین.

کاتێ مرۆڤ لەدۆخی وەرگرتنی زەینی دابێت، کاروبارەکان بە ئاسانی فامدەکات. تاك کاتێ گوێ دەگرێت کە بە وردی سەرنجی دابێتە شتێك؛ بەڵام بەداخەوە زۆرێك لە ئێمە لە پشت دیواری وەستانەوە گوێ دەگرین. دیوارێ لە دەمار گیریمان هەیە، دیوارێ لە دەمارگیرییە دەروونناسی و زانستییەکان، دیوارێ لە نیگەرانییەکانی ڕۆژانە، ترس و ئارەزووەکان و بەم



دەمارگیریانەوە گوێ دەگرین؛ کەوابوو لە ڕاستیدا ئێمە گوێ لە دەنگە دەنگ و ژاوەژاوی خۆمان دەگرین؛ نەئەو شتەی کە دەگوترێت.

وەلاوەنانی ڕێنمایی، دەمارگیری، ئینتیما و بەرخودان و گەیشتن بەشتێ سەرەڕای دەربڕینی زارەکی بۆ گوێ گرتن بە جۆرێ کە دەستبەجێ تێبگەین، زۆر دژوارە ئەمە یەکێ لە گرفتەکانی ئێمەیە.

ئەگەر لە نێو ئەم باسەدا شتێ بگوترێت کە بە پێچەوانەی شێوەی بیروڕای ئێوە بێت، تەنیا گوێ **بگرن**؛ پێداگری و ملە چاوکێ مەکەن. لە وانەیە حەق بەئێوە بێت ومن هەڵە بکەم؛ بەڵام بەگوێدان و تێڕامان هەمووومان بە ڕاستی دەگەین. ڕاستی شتێ نییە کە کەسێ بیدات بە ئێوە. ئێوە خۆتان دەبێت

بیدۆزنەوە و بۆ دۆزینەوەشی دەبێت زەین لە دۆخێکدا بێت کە بتوانێت بە شێوەی ڕاستەوخۆ لێیتێبگات. هەرکات پێداگری و دیواری بەرگری بوونی هەبێت، تێگەیشتنی ڕاستەوخۆ مسۆگەر نییە. تێگەیشتن لە ڕێگای زانین لەوەی کە هەیە مسۆگەر دەبێت؛ لەبەرئەوەی پێگەین و تێگەین ورد بەوەی کە هەیە، بەڕاستی، بە دروستی، بەبێ شرۆڤەکردنی، بەبێ مەحکوم کردن یان بەشیاو زانین، بەبێ گومان سەرەتای ئاوزە. تەنیا کاتێ کە، لەسەر بنەڕەتی مەرجی بوونی زانیاری و دەمارگیرییەکانمان، دەستدەکەین بە شرۆڤە کردن و ماناکردن، ڕاستی لەدەست دەدەین. بە هەرجۆر، شتێکە وەك لێکۆڵینەوە. بۆزانینی هەبوون و زاتی هەرشتێ پێویستیمان بە لێکۆڵینەوەیە و ناتوانین لەسەربنەمای بارودۆخی ڕۆحی خۆمان وەریبگرین. هەربەم جۆرە ئەگەر بتوانین خەریکی سەیرکردن و ڕوانین و گوێدان بین و لەوەی کەهەیە ئاگاداربین، کێشە چارەسەر دەبێت و ئەمە هەر ئەو شتەیە کە ئێمە لە تەواوی ئەم باسەنەدا ئەنجامی دەدەین. من دەمەوێت ئێوە ئاگاداربکەمەوە کە ئەوەی کە هەیە، چییە و لەسەرئەساسی خەیاڵی خۆم وەرینەگێڕم؛ ئێوەش نابێت ئەوە لەسەر بنەڕەتی زەمینە و زانیاری خۆتان شرۆڤەبکەن و وەریگێڕن. کە وابوو ئایا ئاگاداربوون لە هەموو شتێ و بەو شێوەی کە هەیە مسۆگەرە؟

ئەگەر لێرەدا دەست پێکەین، بە دڵنیاییەوە بە تێگەیشتنێك دەگەین. ناسین، ئاگاداربوون، گەیشتن بەوەی هەیە، کۆتایی بەململانێ دێنێت. ئەگەر بزانم کە درۆزنم و ئەمە بۆمن ڕاستییەکی ئاشکراو دەرکەوتووبێت، ئیتر ململانێ تەواو بووە. ناسین،

ئاگاداربوون لەو شتەی کە تاك هەیە، بۆ خۆی سەرەتای ئاوزە، سەرەتای تێگەیشتنە، تێگەیشتنێ کە ئێوە لە چنگی زەمەن ڕزگار دەکات، چۆنیەتی زەمەن دێنێتە گۆڕێ _ زەمەن نەبە مانای زنجیرەی مێژوویی؛ بەڵکو وەك ئامرازێك یان ڕەوتێکی دەروونناسی یان ڕەوتێکی مەزهەبی — کارێکی تێکدەرانەیە و دەبێتە هۆی پشێوی.

کەواتە تێگەیشتنی ئێمە لەوەی وا هەیە، کاتێ ڕوودەدات کە ئەوە بێ مەحکووم کردن، بێ پاساو و بێ دیاری کردنی شوناسی بناسین. ئاگاداربوون لەمەی کە تاك لە هەلومەرجێکی تایبەت یان دۆخێکی تایبەتی دایە، بۆخۆی ڕەوتێکی ڕزگاربوونە؛ بەلاّم ئەو کەسەی کە لە هەلومەرجی خۆی و لەتێکۆشانی خۆی ئاگادارنییە، هەوڵدەدات جیا لەوشتەی بێت کە هەیە و ئەمەیش بۆی دەبێتە خوویەك؛ کەوابوو لە بیرتان بێت کەئێمە لە بۆچوونماندایە دەست بکەین بە توێژینەوەی ئەوەی هەیە، بە ڕوانین لەوەی کە ڕاستییە و ئاگاداری بوون لێی، بێ ڕاو بۆچوونی دەمارگیرانە و بێ هیچ چەشنە ڕاڤە و شرۆڤەیەك. ئەمە پێویستی بە زەینێکی لە ڕادەبەدەر وردبین هەیە، بەدڵێکی خۆ گونجێن، تابتوانییت لەوەی هەیە ئاگاداربیت و شوێنی بگریت؛ چونکە ئەوەی هەیە لە شوێن گرتن دەمێنێتەوە، لە چوون بەدوای جوولاّنی خێرایی ئەوەی هەیە، ڕادەوەستێت.

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ((ئەوەی هەیە)) جێگرتوونییە، جوولاّنی بەردەوامی هەیە و ئەمە شتێکە کە ئەگەر بەووردی بۆی بڕوانین، دەیبینین. بۆ بەدوادا چوونی پێویستیتان بە زەینێکی خێراو دڵێکی خۆ گونجێن هەیە؛ ئەو شتانەی کە بە هۆی جێگرتوو بوونی زەین و باوەڕی تەسك و تەنگ، هەبوونی دەمارگیری و دیاریکردنی شوناسی، مرۆڤ لێی بێ بەش دەکەن و زەین و دڵی وشك ناتوانێت بە ئاسانی و بە ئازایەتی ((ئەوەی هەیە)) شوێنی بگرێت.

بەڕای من، بێ هیچ باس و وتووێژێکی زۆر، بێ زیادە گوتن لەڕادەبەدەر، مرۆڤ لەم دۆزە ئاگادارە  کە لەلایەك تاك بوونی هەیە و لە لایەکی ترەوە شێواوی و داماوی و پشێوی، ئەمە تایبەت بە هیندستان نییە؛ بەڵکو لەسەرانسەری دونیا لەچین، ئەمریکا، بریتانیا، ئەڵمانیا، هەم شێواوی هەیە و هەم خەم و کەسەری زۆری ڕۆژانە. ئەم دۆزە میللی نییە، ئەمە تایبەت بێرە نییە؛ لە تەواو دونیادا هەیە. شتێ بەناو ئێش و ئازاری توند و کەم خایەن هەیە کە تایبەتی تاك نییە، بەڵکو هی کۆمەڵەکانە. کەوابوو سەروکارمان لەگەڵ بەلاّیەکی جیهانیدایە و ئەمەی کە بە ناوچەیەکی جوگرافیایی، بەشێکی ڕەنگ کراوی نەخشە بەرتەسکی بکەینەوە،



کەمتەرخەمییە؛ لەبەر ئەوەی ئەو کات بە گرنگی تەواوی ئەم بەلاّیەی سەرانسەری دونیا، هەروەها تاکیش تێناگات هەنووکە کەلەم شێواوییە ئاگاداربن، وەلاّمی ئەمڕۆی ئێمە دەبێت چی بێت؟ کاردانەوەمان دەبێت چی بێت؟

ئێش و ئازار هەیە، ئێش وئازاری سیاسی، چڤاکی، مەزهەبی، دەروونناسیمان بە تەواو بوونیەوە تووشی شێواوی هاتووە و تەواوی ڕێبەران، چ فەرهەنگی وچ سیاسی، کارێکیان لە دەست نەهاتووە، تەواوی کتێبەکان مانای خۆیان لە دەستداوە. ئەگەر بهاگاڤاد گیتا یان کتێبی موقەدەس یان ئاخرین نووسراوەکان  لە سیاسەت و دەروونناسیدا بخوێنینەوە. چۆنیەتی ڕاستیان لە دەستداوە و گۆڕاون بۆ کۆمەڵێك لە وشەکان. ئێوە خۆتان کە دووپات کەرەوەی ئەم وشانەن، لە گێژی و بێ دڵنیایدا دەژین و دووپات کردنەوەی ڕووتی وشەکان هیچ شتێ ناگەیەنێت؛ کەوابوو وشەکان و کتێبەکان بایەخی خۆیان لە دەستداوە؛ بە واتایەکی تر، کاتێ لە کتێبی موقەدەس، یان مارکس یان بهاگاڤاد گیتا شتێ دەگێڕنەوە، ئێوە خۆتان کە گوتراوەکان دەگێڕنەوە، لە نادڵنیایی و گێژیدا دەژین. دووپات کردنەوەتان وەك درۆی لێدێت؛ لەبەر ئەوە ئەوەی کە لەوێڕا نووسراوە، جەوهەری دەگۆڕێت بۆ بانگەشەیەکی ڕووت و ئەم بانگەشەش، ڕاستی نییە. کەوابوو کاتێ دووپات دەکەنەوە دەستان لە تێگەیشتن لەوەی کە هەن کێشاوە تەنیا کارێ کە کردووتانە، ئەمەیە کە بە پەردەیەك لە قسەی خاوەن ڕایان ڕووی گێژی خۆتان داپۆشیوە؛ بەلاّم ئەوەی کە نیشانەی هیمەتی ئێمەیە ئەوەیە کە لەم شێواوییە تێبگەین و بە گێڕانەوەی قسەکان دایان ئەپۆشین؛ سەرەنجام وەلاّمی ئێوە لەم بارەیەوە چییە؟ ڕاستی ئێوە بەم لە رادەبەدەر پشێوییە، بەم <u>شێواویە</u>، بەم نەبوونی دڵنیاییە، چۆن وەلاّم دەدەنەوە؟ کاتێ دەستدەکەین بە باسکردن لە بارەیەوە، لێی ئاگاداربن، شوێنی وشەکانی من مەگرن؛ بەڵکو شوێن بیرێك بکەون کە لە دەروونی ئێوەدا چالاکە. زۆرێك لە ئێمە بەتەماشاچی بوون و بەشداری کردن لە یاریدا عادەتمان هەیە. کتێب دەخوێنینەوە، بەلاّم هەرگیز کتێب نانووسین. ئەم تەماشاچی بوونە، تەماشاچی، یاری فوتبوڵ یان تەماشاچی سیاسەت مەداران و قسەکەران بۆ ئێمە جۆری نەریت بووە بە جۆرێ عادەتی نەتەوەیی و جیهانی. ئێمە تەنیا_بووین بە غەریبەی چاوەڕێ و بەهرەی داهێنەری خۆمان لە دەستداوە. بەم جۆرە دەمانەوێت فێربین و قازانج بکەین.

بەلاّم ئەگەر ئێوە تەنیا تەماشاچین، ئەگەر ئێوە تەنیا دەڕوانن، مانای ئەم باسە بەتەواوی لە دەستدەدەن؛ لەبەرئەوەی ئەمە لەو چەشنە قسەکردنانە نییە کە ئێوە بەزۆری خۆگرتن گوێی بۆبگرن. من نامەوێت زانیارییەك کە ئێوە دەتوانن لە ئینسوکلۆپیدیا بەدەستی بێنن، لەبەردەستان دابنێم. هەوڵ و تێکۆشانی ئێمە ئەوەیە کە بیروڕاکانی یەکتر، تا ئەو جێیەی کە بتوانین، بەهەرئاستێ کە مسۆگەربێت، بە دۆستی و نزیکایەتی، بە وەلاّمدانەوەی بەسۆزی خۆمان شوێن بگرین. کەوابوو، تکایە بزانن وەلاّمی ئێوە بەم هۆکارە، بەم نیگەرانییە چییە؛ نە ئەمەی کە ئەوانیتر لەم بارەیەوە چی دەڵێن؛ بەڵکو ئێوە خۆتان چۆن وەلاّم دەدەنەوە. ئەگەر ئێوە لەم نیگەرانییە، لەم پشێوییە قازانج بکەن، وەلاّمتان جۆرێ بێ لایەنییە، جا ئەم قازانجە دەتوانێت ئابووری، جڤاکی، سیاسی یان دەروونزانی بێت. ئیتر بەردەوامی ئەم پشێوییە بۆتان گرنگ نییە. بێگومان هەرچی لەدونیا گرفتاری زیاتربێت، پشێوی زیاترە و تاك زیاتر بە دوای ئاسایشەوەیە. ئایا ئێوە بەمەتان نەزانیوە؟ کاتێ لە دونیای شێواوی بوونی هەبێت جاچ دەروونزانی بێت یان هەرجۆرێکی تر، مرۆڤ خۆی لە جۆرێ ئاسایشدا، جا بە شێوەی حسابی بانکی (Bank) یان بە شێوەی جۆری ئیدوئولوژی، ڕادەگرێت؛ یان لەمەی گەرێتەوە ڕوو دەنێت لە دوعا و پاڕانەوە، دەڕوات بۆ عیبادەت خانە، کەلە ڕاستیدا دوورکەوتنەوەیە لەو شتەی کە لە دونیا ڕوودەدات. هەر ڕۆژ لە سەرانسەری دونیا هۆزو عەشیرە وئیزم جۆراوجۆر وەك قارچك لە زەوی سەردەردێنن؛ لەبەرئەوە هەرچی شێواوی زۆرتربێت، پێویستی بە ڕێبەر زیاترە، ڕێبەرێ کە دەستی ئێوە بگرێت و لەم پەرێشانییە ڕزگارتان بکات. کەوابوو ڕوو دەنێن لە کتێبە مەزهەبییەکان، یان یەکێ لە مامۆستایانی نوێ یان لەمە گەڕێتەوە، بە گوێرەی سیستەمێك وەلاّم دەدەنەوە کە بەڕواڵەت کێشەکە چارەسەر دەکات، سیستەمێکی بەستراوەبە چەپ یان ڕاست.

ئەمە راست هەر ئەو شتەیە کە دەیهەوێت رووبدات. هەرکەلە شێواوی، لەوەی کە بەڕاستی هەیە، ئاگاداربین هەوڵدەدەین لێی دووربکەوینەوە. ئەو گرووپانەی کەبۆ چارەسەری بەلاّ، بەلاّی ئابووری، کۆمەلاّیەتی یان فەرهەنگی، سیستەمێك پێشنیاردەکەن، خراپترین گرووپن. چونکە لەو حاڵەدا، سیستەمەکەیە کە گرنگ و بایەخ مەندتر دەبێت نە مرۆڤ؛ چ ئەم سیستەمە هزری بێت یان بەستراوە. بەڕاست یان بەچەپ، ئەوەی کە گرنگی بە دەست دێنێت سیستەم، فەلسەفە و ئیدییە، نە مرۆڤ. ئەوکات ئێوە لەبەر، ئیرەو



ئیدئۆلۆژی حازرن هەموو بوونەوەرێکی مرۆیی فیدابکەن، کەڕاست هەر ئەو شتەیە کە هەنووکە دەیەوێت لە دونیا ڕووبدات.

سیستەم کرنگ کراوە، کەوابوو بە گرنگ کردنی سیستەم مرۆڤەکان، ئێوەو من گرنگی مان لە دەستداوە و کۆنترۆڵچییەکانی سیستەم، چ مەزهەبی و چ جڤاکی، چ ڕاستی و چ چەپی بوونەتە خاوەن ئیختیار؛ بوونەتەخاوەن دەسەلاّت و سەرنجام ئێمەی تاکەکان قوربانی دەکەین. ئەمەڕاست هەرئەو شتەیە کە دەیەوێت ڕووبدات.

ئێستا بزانین هۆکاری ئەم شێواوی و داماوییە چییە؟ ئەم بێدەرامەتییە، ئەم ئێش و ئازارە، نەتەنیا ئێش و ئازاری دەروونی؛ بەڵکوئێش و ئازاری دەرەکیش، ئەم دڵە ڕاوکێ و چاوەڕێی شەڕکردنە، شەڕی سێیەم کەلە حاڵی بەرپابوون دایە، چۆن پێکهات؟ هۆکارەکەی چییە؟ گومانی تێدانییە کە ئەمە نیشاندەری داڕووخانی ئەخلاق، بایەخە مەعنەوییەکان وگەورەیی بایەخەکانی جنسی و بایەخی دروستکراوەکانی دەست و مێشکە.ڕاستی کاتێ ئێمە بایەخەکانی جگە لە بایەخی تەنەکان و هەستیارەکان، بایەخی دەستکەوتەکانی زەین و دەست و ماشینمان نییە، چی ڕوودەدات. هەرچی گرنگی زۆر بەلایەنەکانی دونیای کاروباربدەین، شێواوی زیاترە، مەگەر جیا لەمەیە؟ دووبارە دەڵێم کە ئەمە بیرۆکەی من نییە. بۆ ئەوەی کە تێبگەن بایەخەکان، دەسەلاّت، بوونی ئابووری و کۆمەلاّیەتی ئێوە پەیوەندی بەو شتانەوە هەیە کە دروستکراوی دەست یان مێشکن، پێویستی بە گێڕانەوەی گوتراوی ناو کتێبەکان نییە. کەوابوو دەوست بەکارو ژیان دەکەین و بوونمان هەردەم لەبایەخەکانی دونیادا نوقم دەبێت. ماناکەی ئەوەیە کە تەنەکان، تەنەکانی زەین، تەنە دەستییەکان و ماشێنەکان گرنگیان پەیداکردووە و کاتێك تەنەکان گرنگی و بایەخ پەیدا دەکەن، باوەڕ و بایەخێکی سەرکەوتووی دەبێت و ئەمە ڕاست هەر ئەو شتەیە کە لە دونیا دەیەوێت ڕووبدات، مەگەر جیا لەمەیە؟

لەم ڕووەوە گرنگیدانی زیاتر بە بایەخەکانی دونیایی دەبێتە هۆی شێواوی؛ کاتێ دەکەوینە ناو شێواوی، هەوڵدەدەین بە ڕێگاو شێوازی جۆراوجۆری مەزهەبی، ئابووری یان کۆمەلاّیەتی یان لە ڕێگای فراوانخوازی، دەسەلاّت و گەڕان بە دوای ڕاستیدا، لێی دووربکەوینەوە؛ بەلاّم ڕاستی دوور نییە، چوون بەدوایدا پێویست ناکات و مرۆڤێ کە بە دوای ڕاستیدا بگەڕێت، هەرگیز نایدۆزیتەوە. ڕاستی لە "ئەوەی وا هەیە" دەدۆزرێتەوە و جوانیشی لەمەدایە؛ بەلاّم

هەر کە هەستتان پێکرد، هەرکە گەڕان بە دوایدا، تێکۆشان دەستپێدەکەن و مرۆڤیێ کە تێدەکۆشێت، ناتوانێ تێبگات. لەبەر ئەم هۆیەیە کە دەبێت هێمن، وەکو سەیرکەرو بەشێوەی پاسیڤ، ئاگاداربین. دەبینین کەژیان و کردەوەمان بەردەوام لە ناوچوارچێوەی خەم و وێرانیدایە؛ شێواوی و پشێوی بەردەوام وەك شەپۆلێك تێدەپەڕێت و دەیەوێت پێشمان کەوێت، شێواوی دەروون هیچ کات پشوو نادات.

ئەوەی کە ئێستا ئەنجامیدەدەین، گۆیا بە پشێوی کۆتایی دێت، گۆیا بە خەم و کەسەرو بەڕۆژی ڕەش دەگات، بڕوانن بۆ ژیانی خۆتان، دەبینین کە ژیانمان گشت وەخت لە سنووری خەم و کەسەردایە. کاری ئێمە و چالاکی جڤاکیمان، سیاسەتمان، کۆبوونەوەی جۆراوجۆری میللەتان بۆ ڕاگرتنی شەڕ، هەموو دەبنە هۆی شەڕی زیاتر.

لە ناوچوویی بە دوای ژیانەوە لە جوولّە دایە؛ ئەوەی ئەنجامیدەدەین، بە مەرگ کۆتایی پێدێت. ئەمە هەر ئەوشتەیە کە بە کردەوە خەریکە ڕوودەدات. ئایا دەکرێت ئەم ڕۆژە ڕەشە دەستبەجێ ڕاگیردرێت و بەردەوام لەدوای شەپۆلی شێواوی کەسەردا گرفتارنەبێت؟ بە واتایەکی تر، گەورەمامۆستایانی وەك بووداو مەسیح هاتوون؛ ئەوان باوەڕیان قەبوولّکردووە و لەوانەیە خۆیان لە دەست شێواوی و خەم ڕزگارکردبێت؛ بەلاّم هەرگیز بەر خەمیان نەگرتووە، پێش شێواویان نەگرتووە شێواوی و خەم هێشتا درێژەی هەیە. ئەگەر ئێوە بە بینینی ئەم شێواوی و ئابووری وجڤاکی، پشێوی و داماویە پەنابەرنە بەر ئەو شتەی کە پێی دەلّێن ژیانی مەزهەبی و ڕوو لە دونیا وەرگێڕن، دوورنییە کە ئێوەش هەستبکەن دەتانەوێت بەم گەورە مامۆستایانە پەیوەست بن؛ بەلاّم دونیا بە پشێوی، ڕۆژی ڕەشی و وێرانکاری خۆی درێژە بەڕێگای خۆی دەدات و ئێشو ئازاری بەردەوامی هەژارو دەولّەمەندی، لەبەردەوامی ناوەستێت. کەواتە، گرفتی ئێمە — گرفتی ئێوە ومن - ئەمەیە کە ئایا دەکرێت دەسبەجێ و خێرا لەم ڕۆژە ڕەشە رزگارمان بێت؟ ئەگەر ئێوەیەك کە لەم دونیا ژیان دەکەن خۆتان بەبەشێك لەو نەزانن، لە ڕزگاری کەسانی تر لەم پشێوییە یارمەتیان دەدەن؛ نەسبەی، نەدوا ڕۆژ؛ بەلّکو هەرئێستا. بەدلّنیاییەوە گرفتی ئێمە ئەمەیە. لەوانەیە شەڕ دروستببێت، بەشێوەی ڕووخێنەترو ترسێنەرتر، گومانێك نییە کە ئێمە توانای بەرگری کردنمان لێی نییە؛ لەبەرئەوە گیروگرفتی جێی باس، زۆر زۆر گەورەو زۆر زۆرنزیکن. بەلاّم ئێوە و من شێواوییەکان و ڕۆژە رشەکان دەسبەجێ فام دەکەین،



هەستدەکەین ناتوانین؟ دەبێت ئەوانە تێبگەن، ئەوجا دەکەوینە هەلومەرجێکەوە کە دەتوانین هەر ئەم تێگەیشتن لە ڕاستییە. لەوانی تردا زیندوو بکەینەوە. بە واتایەکی تر، ئایا دەتوانن دەسبەجێ بەڕزگاری بگەن؟ لەبەر ئەو تەنیا ڕێگەی هەلاّتن لەم ڕۆژە ڕەشی و داماوییە هەرئەمەیە. تێگەیشتن تەنیا لە زەمانی ڕانەبردوودا مسۆگەر دەبێت. بەلاّم ئەگەر بلّێین؛ ((سبەی ئەم کارە دەکەم)) شەپۆلی شێواوی دەکەوێتە پێشمانەوە و ئەوجا بەردەوام لەگەلّ شێواویدا دەستە و داوێن دەبین.

کەوابوو ئایا ئەم دەرفەتە هەیە کە بە هەلومەرجێك بگەین کە خۆمان دەسبەجێ ڕاستییەکان فام بکەین و کۆتایی بەم شێواوییە بێنین؟ من دەلّێم ئەریّ، ئەم دەرفەتە هەیە و تەنیا ڕێگەشە کە دەبێت. من دەلّێم ئەم ئیشە دەکرێت و دەبێت جێبەجێ ببێت ئەویش نەلە ڕووی گومان و باوەڕەوە. تەنیا گرفتی ئێمە پێکهاتنی ئەم شۆڕشە نائاساییە — کە شۆڕشێك بۆڕزگاری لەشەڕ کاپیتالیسم و دامەزرانی گرووپێکی دیکە نییە — پێکهێنانی ئەم گەشە کردنە گەورە و بە هەیبەتەیە کە تەنیا شۆڕشی ڕاستەقینەیە، ئەوەی کە بەزۆری بەشۆڕشی دەزانین، تەنیا هاوسەنگکردن یان بەردەوامی ڕاستخوازییە بەپێی ئیدە کانی چەپ خوازی، بە هەر حالدا چەپ خوازیش بەردەوامی راست خوازییە بە جۆرێکی هاوسەنگکراو. ئەگەر ڕاستخوازی لەسەربنەمای بایەخی دونیای نییە، چەپ خوازیش شتیێ جگە لە بەردەوامی هەمان بایەخی دونیای کە تەنیا لە ڕووی ئاست و دەربڕینەوە جیاوازیان هەیە، نییە. کەوابوو، شۆڕشی ڕاستەقینە تەنیا کاتیێ ڕوودەدات کە ئێوە وەك تاکیێ، لە پەیوەندی خۆتان و ئەوی تر ئاگاداربن. بێگومان، ئەوەی ئێوە لە پەیوەندی لەگەلّ ئەوی تردا — لەگەلّ هاوسەر، منداڵ، بەرپرس، جیران — هەتانە، هەمان کۆمەلّگای ئێوەیە. کۆمەلّ خۆی لە خۆیدا بوونی نییە. کۆمەلّگا هەرئەو شتەیە کە ئێوە و من لە پەیوەندییەکانمان پێکەوە خولّقاندوومانە؛ کۆمەلّگا ڕووی دەرەوەی تەواو بارودۆخەکانی دەروونناسی دەروونی خۆمانە. کەوابوو ئەگەر ئێوە و من لە خۆتێنەگەین و تەنیا ئالّو گۆڕخوازی دونیای دەرەوەبین کە ڕووی دونیای دەروونە، کۆمەلّگا بە هیچ جۆر مانای نابێت؛ یانی تاکاتیێ کە من خۆم لە پەیوەندی لەگەلّ ئێوەدا فام نەکەم، ئالّوگۆڕێکی گرنگ لە کۆمەلّگا پێکنایەت، گێژیم سەبارەت بە پەیوەندی خۆم دەبێتە هۆی ئەوەی کە کۆمەلّگایەك پێکبێنم کە ((ئەلموسەنا)) یە، دیمەنی دەرەکی هەر ئەوشتەیە کە من هەم.

ئەمە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە کە دەتوانین لە بارەیەوە باسبکەین. باسەکە ئەوە دەبێت کە ئایا ئەم کۆمەڵگا، ئەم دیمەنە دەرەکییە، منی پێکهێناوە یان ئەوەی کە من پێکهێنەری کۆمەڵگام. ئایا لەم حاڵەدا، ئەم ڕاستییە ڕوون نییە کە ئەوەی من لە پەیوەندی لەگەڵ ئەویتردا هەم، پێکهێنەری کۆمەڵگایە و بێئەوەی کەمن خۆم لە بنچینەوە بگۆڕم، گۆڕانێك لە نەخشی بنەڕەتی کۆمەڵگا پێکنایەت؟

کاتێ بۆ گۆڕانی کۆمەڵگایەك لە سیستەمێك، ورد دەبینەوە، لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە خۆیان دەدزنەوە؛ لەبەر ئەوە ئەمە سیستەم نییە کە توانایی گۆڕان کاری لە مرۆڤدا هەیە؛ بەڵکو مرۆڤە کە هەردەم سیستەم دەگۆڕێت و ئەمە شتێکە مێژوو شایەتیەتی. تا ئەوکاتەی کە من خۆم لەپەیوەندی لەگەڵ ئێوەدا فام نەکەم، هۆکاری پشێوی، ڕۆژڕەشی، وێرانی، ترس و دڕندە خۆیی دەبم. تێگەیشتنی خۆ پەیوەندی بە زەمانەوە نییە، من دەتوانم هەر ئەم چرکە لە خۆتێبگەم؛ ئەگەر بڵێم: ((سبەی خۆم فام دەکەم)) بوومەتە هۆی شێواوی ڕۆژ ڕەشی و کردەوەی من وێران کەرانەیە. هەر ئەو ساتەوەختەی کەبڵێم : ((فام دەکەم))، توخمی زەمانم هێناوەتە ناو و سەرەنجام هەر ئەو کاتە لە شەپۆلێکی شێواوی و ڕووخێنەردا خۆم گیرداوە.

تێگەیشتن هەرئێستایە، نەسبەی. سبەی بۆمێشکی تەمەڵە، بۆمێشکی وەك لوول پێچە، بۆ مێشکێکە کە ئۆگری تێدا نییە. کاتێ مرۆڤ ئۆگری شتێکە، گورج و دەسبەجێ ئەنجامیدەدات، فامکردن دەسبەجێ پێکدێت، ئاڵو گۆڕو گورج و خێرایە. ئەگەر هەرئێستا نەگۆڕیەن، هەرگیز ناگۆڕیەن؛ لەبەرئەوە گۆڕانێك کەسبەی ڕوو دەدات ئاڵو گۆڕنییە؛ بەڵکو جۆرێك هاوسەنگییە. شۆڕش ئێستایە، نەك سبەی.

ئەگەر ڕووداوێکی لەم جۆرە ڕوبدات، ئێوە ئیدی هیچ گرفتێکتان نییە، لەبەرئەوە خود ئیتر نیگەرانی خود نییە؛ ئەو کات ئێوە لەسەرەوەی شەپۆلی ڕووخێنەرو وێران کەر دەوەستن.

# فەسڵی دووەم

## بە دوای چیا دەگەڕێین؟

بەڕاستی زۆربەی ئێمەی خەڵك بە دوای چیدا دەگەڕێین؟ چ شتێك داوادەکەین؟ گومانێك نییە کە، بە تایبەت لەم دونیا بێقەرارە و دونیای کە هەرکەس هەوڵیەتی لەودا جۆری ئاسودەیی، بەختەوەری و ئاسایش بەدەست بێنێت، دۆزینەوەی شتێکی وا زۆر بایەخی هەیە؛ جیالەمەیە؟ بەلاّم دەبێت بزانین کە ئێمە بە شوێن چیا دەگەڕێین و چی بدۆزینەوە. کەواتە زۆربەی ئێمە لەم دونیا پڕلە ئاژاوە و شێواوی و شەڕ،دژبەری و ململانێدا، بەدوای جۆری بەختەوەری یان خۆشکاییدا دەچین و داوای شوێن و پەنایەك دەکەین کە لەودا سولحو سەفایەك هەبێت. خەیاڵ دەکەم ئەوشتەیە کە زۆربەی ئێمە خوازیارین؛ کەوابوو دەست لە داوا هەڵناگرین؛ لەڕێبەرێکەوە بۆ ڕێبەرێکی تر، لە دامەزراوێکی مەزهەبییەوە بۆ ڕێکخراوێکی دیکەی مەزهەبی و لە مامۆستایەکەوە بۆ مامۆستایەکی دی ڕوودەنێین.

هەنووکە ئایا ئێمە بەدوای خۆشبەختییەوە دیێن یان بەدوای جۆری ڕەزامەندییەوە کە هیوادارین خۆشبەختی لێوەربگرین؟ خۆشبەختی و ڕەزامەندی پێکەوە جیاوازییان هەیە. ئایادەکرێت بکەویتە شوێن خۆشبەختی؟ لەوانەیە بکرێت بە ڕەزامەندی بگەین، بەلاّم بەدڵنیاییەوە بەختەوەری گیرنایەت. بەختەوەر لە شتێکی دیکە وە وەردەگیرێت، بەرهەمی لاوەکی شتێکی دیکەیە، کەوابوو بەرلەوەی کە ڕوحو دڵمان بەشتێ بدەین کەبە تەقەلا، سەرنج، بیرو تێڕامانی زور پێویستی هەیە. دەبێت بۆمان ڕوون بێتەوە بە دوای چییە وەین؟ ئایا بەدوای خۆشبەختیەوەین یان ڕەزامەندی. بە داخەوە دەبێ بڵێم کە زۆربەی ئێمە بە دوای ڕەزامەندییەوەین. ئێمە دەمانەوێت ڕازی بین، ئێمە دەمانەوێت لە کۆتایی توێژینەوەماندا، بە جۆرێ هەستی کەیل و پڕبوون بگەین بەهەرجۆر، هەرکات کەسێ بەشوێن هێمنییەوە بێت، دەتوانێت بە ئاسانی پێیبگات. هەرکەس دەتوانێت کوێرانە خۆی بسپێرێت بە هۆکارێك یان بیرۆکەیەك و لەودا بکەوێتە شوێن ئاسایش و هێمنی. بێگومان کە ئەمە کێشەکە چارەسەرناکات. گۆشەگیری تەواولە بیرۆکەیەکی چوارچێوەداردا، ڕزگاری لە پارادۆکس نییە.



کەوابوو ئێمە دەبێت بزانین کە داخوازی دەروونی و دەرەکی هەریەکە لە ئێمە چییە؟ ئەگەر ئەم پرسە بۆئێمە ڕوون بێت، ئیتر پێویست ناکات بڕۆین بۆ شوێنێك یان لە مامۆستایەك، کلێسایەك یان ڕێکخراوێك سەربدەین. کەوابوو کێشەی ئێمە ئەوەیە کە نییەت و مەبەستمان بۆخۆمان ڕوون و ئاشکرابێت. ئایا ئەم شتە مسۆگەرە؟ ئایا بەدەستهێنانی ئەو ڕوونی و بێ پەردەیە لە ڕێگای گێرایشەوە مسۆگەرە، یان لە ڕێگای هەوڵدان لە تێگەیشتن لەوەی ئەوانیتر دەیکەن؟ چ ئەم ئەوان ترە پایە بەرزترین مامۆستایان بن، چ وتاربێژێکی ئاسایی کلێسایەکی گچکە؟ ئایا بۆ دۆزینەوە بێت بۆلای کەسێ بڕویت؟ ئەمە هەرئەو ئیشەیە کە ئێمە دەیکەین؛ وانییە؟ کتێبی بێشومار دەخوێنینەوە، بەشداری کۆبونەوەی زۆر دەکرێت و باس دەکەین و بە ڕێکخراوی جۆراو جۆر. پەیوەست دەبین بەوجۆرە هەوڵدەدەین دەرمان و چارەسەرێك بۆدژبەری لەگەڵ داماوی و ڕۆژە ڕەشەکانی ژیانمان بدۆزینەوە یان ئەگەر ئەم ئیشانە نەکەین، هەستدەکەین کە لێی تێگەیشتووین؛ بە واتایەکی تر دەڵێین کە ڕێکخراوێکی تایبەت، مامۆستایەکی تایبەت، یان کتێبێکی تایبەت ئێمە رازی دەکات؛ ئەوەی کە دەمانەوێت لە ودا بەدەستمان هێناوە، لەوڕا دێڕ دەکەین، وەك بلوورمان لێدێت و گەمارۆدەدرێین.

مەگەر ئەمە نییە کە لە نێوان ئەم هەموو شێواویەدا، هابین بە شوێن شتێکی دایمەوە؟ شتێکی لەنێونەچوو، شتێ کە پێدەڵێین ڕاستی؛ خوا، ڕاستی، ئەوەی کە خۆشمان دەوێت، ناو گرنگ نییە؛ بێگومان وشە، خودی تەن نییە. کەوابوو مەهێڵن دەرگیری وشەکان بین. ئەم باس و بابەتە دابنێن بۆقسەکەرانی کارامە. گەڕان بەدوای شتێکی هەتاهەتایدایە. بۆ زۆربەی ئێمە شتێکە کە دەتوانین ئاوێزانی بین، شتێ کە بە ئێمە دڵنیایی، ئارەزوو، شەوق، متمانەی بەردەوام بدات. لە بەرئەوە ئێمە لە ناوەوە بەزۆری نادڵنیاین و خۆمان چاك دەناسین. ئێمە سەبارەت بە ڕاستییەکان، ئەوەی کە کتێبەکان گوتوویانە، زۆر دەزانین. بەلاّم ئەمە زانستی ئێمە خۆمان نییە، یانێ خۆمان تەجروبەی ڕاستەوخۆمان نییە.

بزانین ئەوەی کە ئێمە بە هەتا هەتایی دەزانین چییە؟ ئێمە بەدوای چیدا دەگەڕێین؟ شتێکە یان بە ئێمە هەتاهەتایی دەدات وەیان ئێمە هیوادارین کە بیدات. ئایا ئێمە بەدوای بەختەوەری سەقامگیر، ڕەزامەندی سەقامگیر و دڵنیایی سەقامگیرییەوە نین؟ ئێمە شتێکمان دەوێت کەبەردەوام بمێنێتەوە و ئێمە ڕازی بکات. بەمەرجێك تەواو واتاو وشەکان بنێینە لاوە و بە کردەوە لێی بڕوانین. ئەمە ئەو شتەیە کە ئێمە دەمانەوێت. ئێمە خوازیاری لەزەتێکی هەردەمی و ڕەزامەندییەکی بەردەوامین. شتێ کە ناوی ڕاستی، خوا

یان هەرچی دڵمان بخوازین دەینین. زۆر چاك، ئێمە خوازیاری لەزەتین. لە وانەیە شێوازی باسکردنی پرسەکە، تۆزێك بێباکانەبێت؛ بەلاّم ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئێمە هەر ئەمەمان دەوێت. زانستێك کە چێژ و لەزەت بدات، ئەزموونێك کەبە ئێمە لەزەت بدات، ڕەزامەندییەك کەتا سبەی سیس نەبێت؛ زۆر لەم ڕەزامەندییانەمان تاقیکردۆتەوە؛ بەلاّم هەرهەمووی ژاکاون و ڕەنگیان لە دەستداوە و هەنووکە هیوامان بەوەیە کە ڕەزامەندی لە ڕاستی و خواوەندا بدۆزینەوە. بێگومان هەموومان لە گەڕان بەدوای شتێکی لەم جۆرەوەین. هەم بیرتیژان و هەم بیرکۆڵ و تیۆروان و هەم لایەنگرانی ڕاستی کە بەدوای شتێکی نەوەستاوەن ئایا شتێ بەناو ڕەزامەندی هەتا هەتایی هەیە؟ ئایا شتێ بوونی هەیە کە بمێنێتەوە؟ لەهەرحاڵدا، ئەگەرهابین بەشوێن ڕەزامەندی هەتاهەتاییەوە، چ ناوی خوایی لێبێنین، چ ڕاستی یان هەرچی کە ئێوە دەتانەوێت — ناوگرنگ نییە — گومانی تێدا نییە کەدەبێت ئەوەی کە بەدوایدا دەگەڕێین تێبگەن؛ ئایا ئەمەتان قبووڵە؟ کاتێ دەڵێین: ((من بەدوای بەختەوەری بەردەوامدا دەگەڕێم)) — خوا، ڕاستی یان هەرشتێ کەهەیە — مەگەرجیا لەمەیە کە دەبێت ئەو شتەیش کە دەگەڕێت؛ یانی توێژەر یان گەڕۆکیش، فام بکەن؟ لەبەر ئەوە لەوانەیە شتێ بەناو ئاسایش و بەختەوەری سەقام گیربوونی نەبێت؟ شایەت ڕاستی شتێکی بە تەواوی جیاوازبێت و من هەست دەکەم کە لەگەڵ ئەوەی کە پیاو دەتوانێت ببینێت، هەستیبکات و ڕێکوپێکی بکات بەتەواوی جیاوازی هەیە. کە وابوو بەرلەوەی کەبەدوای شتێکی نەمردا بگەڕێن، ئایا پێویستی تێگەیشتن لە توێژەر و فام کردنی مەسەلەیەکی ڕوون و ئاشکرا نییە؟ ئایا بەدوادا گەڕان لەگەڵ ئەوەی کە بەدوایدا دەگەڕێین جیاوازی هەیە؟ کاتێ دەڵێین: ((من لە گەڕان بەدوای بەختەوەریدام))، ئایا توێژەر لە باسی جێی توێژینەوە جیایە؟ ئایا بیرەوەر و بیر لێك جیان؟ ئایا ئەمانە بە جێی ئەوەی کە ئاڕاستەی جیالەیەك بن، ڕووداوی ئاوێتە نین؟ کەوابوو فامی توێژەر بەرلە تێکۆشان بۆ دۆزینەوەی ئەوەی کە بە دوایدا دەگەڕێت، پێویستە؛ وانییە؟

کەوابوو دەگەینە ئەو جێی کە ئارەزوومەندانە و دۆستانە و لە ناخی دڵەوە لە خۆمان دەپرسین کەئایا ئەوانی تر دەتوانن هێمنایی، بەختەوەری، ڕاستی، خوا یان هەرشتێ کە ئیرادەی بکەین، بدەن پێمان؟ ئایا ئەم بەدوادا گەڕانی بێ وەستانە و ئەم شەوقە دەتوانێت ئەو هەستی بێ ّوێنەی ڕاستییە؟ ئەو بوونە داهێنەرە. بوونێ کە بەرهەمی فامی ڕاستەقینەی ئێمەیە لە خۆمان بدات بە ئێمە؟ ئایا وشیاری لە ڕێگای توێژینەوە، لە



ڕێگای چوون بە دوای ئەویتردا، لەڕێگای بەستراوەی بە ڕێکخراوێکی تایبەت، لەڕێگای خوێندنەوەی کتێبەکان و لەم جۆرە کارانە دێتەدی؟ بەهەرجۆر، مەسەلەی سەرەکی جێی باسکردن ئەمەیە: تا کاتێك من خۆم فام نەکەم، پاڵپشتێکم بۆبیرکردنەوەم نییە و تەواو بەدوادا چوونەکانم بێهودەیە. من دەتوانم ڕووبنێم لە هەڵە هەستیارەکان، دەتوانم لە دژایەتی، لە ململانێ و شەڕدووری بکەم، دەتوانم ئەویتر پەرستم، دەتوانم ڕزگاری خۆم لە دەستی ئەوانیتردا بزانم، بەلاّم تاکاتێك سەبارەت بە خۆم نەزانم، تاکاتێك کە لە تەواو ڕوندی خۆم بێ خەبەرم، پاڵپشتێکم بۆ بیرکردنەوە، بۆ خۆشەویستیکردن و بۆ کردەوە نییە.

بەلاّم ئەم زانینە، بۆخۆی دوایین داخوازیمانە؛ گەرچی گومانێك نییە کە ئەمە تەنیا بنەڕەتێکە کە دەکرێت بینا لەسەری دروستکرێت. هەڵبەت بەرلەوەی کە بتوانین دروستی بکەین، بەرلەوەی کە بتوانین ئاڵوگۆڕ پێك بێنین و بەرلەوەی کە بتوانین مەحکووم یان وێران بکەین، دەبێت لەوەی کەهەین ئاگاداربین. توێژینەوە، گۆڕینی مامۆستا یان ڕێبەر، مەشقی یۆگا کردن، قووڵ هەناسە کێشان جێبەجێ کردنی کاروباری مەزهەبی، بە گوێ کردن و دواکەوتنی ئۆستادان و هتد.... لەبنوبێخەوە بێ سوودە، بێ مانایە، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسانەی کە ئێمە بە دوایانەوەین، بڵێین: "خۆتان موتالا بکەن"؛ لەبەر ئەوە ئێمە هەر ئەوەین کە دونیاش هەیە. ئەگەر ئێمە خۆخواز، بەرچاوتەنگ، خۆپەسەن و چاوچنۆك بین ئەمە هەرئەو شتەیە کە لە دەوروبەری خۆماندا پێکی دێنین و ئەمە هەرئەو کۆمەڵگایەیەکە تێیدا ژیان دەکەین.

واهەست دەکەم بەرلە سەفەر کردن بەمەبەستی دیتنەوەی ڕاستی، بەرلەوەی کەبتوانین کردەوەیەك ئەنجامبدەین، بەرلەوەی کە بتوانین لەگەڵ ئەوانیتر — کۆمەڵگا — پەیوەند یمان هەبێ، پێویستە کە سەرەتا خۆمان بناسین. من ئەو کەسەی بەدۆست ونزیك دەزانم کە تەواوەن، سەرەتا، تێڕامان لەم بابەتە بکات نەئەوەی کە چۆن بە ئامانجێکی تایبەت بگات. لەبەرئەوە ئەگەر ئێوە و من لە خۆمان تێنەگەین، چۆن دەتوانین بە کردەوە لە کۆمەڵگا، لە پەیوەندی، لەهەرشتێ را کە ئەنجامی دەدەین، ئاڵو گۆڕ پێکبێنین؟ مانای ئەم قسە، ڕاشکاوانە ئەوەنییەکە وشیاری لە پەیوەندی جیایە یان دژیەتی، ماناکەی، بەڕوونی، ئەوەنییە کە پشت بەستن بەتاکە، بە منە لەهەمبەر خەڵك و ئەویتر.

کەواتە، بێئاگا بوون لە خۆ، بێئاگا بوون لە شێوازی بیرکردنەوەی خۆتان و ئەوەی کە بۆ چی بیری تایبەت بە خۆتان هەیە بێئاگا بوون لە رابردووی مەرجی بوونتان و هۆکاری هەبوونی

باوەڕی تایبەت  سەبارەت بە هونەر، مەزهەب، وڵاتی خۆ، دراوسێ و خودی خۆتان، چۆن مرۆڤ دەتوانێت سەبارەت بە شتێکی ڕاستەقینە بیر بکاتەوە؟ بێناسینی بواری هزری، بێئەوەی کە بزانن جەوهەری هزری خۆتان چییە و سەرچاوەکەی لە کوێوەیە؟ بێگومان توێژینەوە و بە دواداچوونی ئێوە بە تەواوی بێئاکامە و کردەوەتان بێمانایە؛ جیا لەمەیە؟ ئەمریکایی بوون، هیندی بوون یا هەبوونی هەرئاینزاییێکی دیکەش بێمانایە.

بەرلەوەی کە بە ئامانجی کۆتایی ژیان بزانین وبزانین کە مانای شەڕەکان، دوژمنایەتییەکانی نەتەوەیی، دژبەریەکان و ئەم هەموو شێواوی و پشێوییە  چییە،دەبێت لە خۆمانەوە دەست پێبکەین؛ وانییە؟

بە ڕواڵەت ئاسان بە بیردەگات، بەلاّم لە ڕادەبەدەر دژوارە. بۆ ئەوەی کە لەگەڵ خۆماندا بڕۆین و بزانین کە هزری مرۆڤ چۆن ئیشدەکات، دەبێت لە ڕادەبەدەر وشیاربین. لەبەر ئەوە هەرچی وشیاری مرۆڤ زیاتربێت. زانیاری ئەو دەربارەی پێچەوانەکانی هزرو سۆزو وەلاّمەکانی خۆی زیاتر دەبێت، ئەڵبەت نەتەنیا بەخۆی بەڵکو بە وی تریش؛ یانێ ئەو کەسەی کەلەگەڵ ئەودا پەیوەندی هەیە. ناسینی خۆت، یانێ خوێندنەوەی خۆت بە کردەوە، هەر ئەوشتەی کەناوی پەیوەندییە. گرفتی ئیشەکە ئەوەیە کە ئێمە بێتاقەتین، ئێمە دەمانەوێت درێژە بە ڕێگای خۆمان بدەین، دەمانەوێت کارەکە بە کۆتایی بگەیەنین، لەم ڕووەوە نەدیقەت و نەدەرفەت ئەوە هەیە کە چارەنووسی خوێندنەوە و ڕوانین لەبەر دەست خۆماندا دابنێین. لە لایەکی ترەوە خۆمان تەرخانکردووە بە چالاکی جۆراوجۆرەوە — دابینکردنی بژێوی ژیان، بارهێنانی منالاّن — یان بەرپرسیاریەتی ڕێکخراوە جۆراو جۆرەکانمان گرتووەتە ئەستۆ؛ بەم جۆرە خۆمان بە شێوازی جۆراو جۆر، گیرداوە، بە جۆرێ کە ئیترزۆر بە کەمی کاتمان بۆ خۆخستنە ڕوو و ڕوانین و خوێندنەوەی ماوەتەوە؛ کەوابوو لەڕاستیدا بەرپرسیاریەتی کاردانەوە پەیوەندی بە خودی تاکەوە هەیە. نە ئەویتر. گەڕان لە تەواوی دونیا بە دوای ڕێبەران و سیستەم و خوێندنەوەی نوێترین کتێبەکان و چی وچی بە ڕای من شتێکی بێهودەیە و خۆڕایە. بە تەواوی خۆڕایی، لەبەرئەوە لەوانەیە مرۆڤ تەواوی دونیا بگەڕێت، بەلاّم دووبارە لەڕووی ناچارییەوە بگەڕێتەوە بۆلای خۆی و بە سەرنجدان بەوەی کە زۆرێك لە ئێمە بەتەواوی لە خۆ دووریـن، بە ڕوون و ئاشکرا دیتنی شێوازی بیرکردنەوە، هەستکردن و کارکردنمان لە ڕادەبەدەر دژوارە.



هەرچی زیاتر خۆتان بناسن پاکی زیاتر دەبێت، خۆناسین بێکۆتایە کەسێ بە ئەنجام یان سەرەنجامێك ناگات. ڕووبارێکی بێکۆتایە. بە خوێندنەوەی و چوونە ناوناخییەوە، مرۆڤ بە هێمنایی زیاتر دەگات. تەنیا کاتێ کە--، لە ڕێگای وشیاری، نەلە ڕێگای پەروەردەکردنی دەروونی داسەپاو----مێشك ئۆقرەی گرتووە، تەنیا لەو کاتەو لەو هێمنایی و بێدەنگییە دایە کەڕاستی دەتوانێت لە دایك بێت. تەنیا لەو کاتەدایە کە بەختەوەری نەمرو چالاکی داهێنەرانە دەتوانێت بوونی هەبێت و من وای بۆدەچم کە بەبێ ئەم تێگەیشتنە، بێ ئەم ئەزموونە، تەنیا خوێندنەوەی کتێب، بەشداری لە وتوێژو پڕوپاگەندە بە ڕێکخستن، کارێکی منالاّنەیە و چالاکییەکە مانایەکی ئەوتۆی نییە. لە حاڵێکدا ئەگەر مرۆڤ توانای فامکردنی خۆی هەبێت و لە ڕێگای ئەوەوە ببێتە هۆی ئەو بەختەوەرییە  داهێنراوانە و دەستبردن بۆ ئەو ئەزموونەی کەلە زەین مانەوە سەرچاوە ناگرێت، پێدەچێت ئەوکات لە پەیوەندی نەپچڕاوی دەوروبەرمان و بە هەوڵدان بۆبینینەوە لە دونیایەکدا کەلێی دەژین گۆڕانێك پێکبێت.

# فەسڵی سێیەم

## تاك و کۆمەڵگا

گرفتێ کە لە بەرامبەر زۆرێك لە ئێمەدا دەوەستێت. ئەمەیە کە تاك تەنیا ئامرازی کۆمەڵگایە یان ئامانجی کۆمەڵگا؟ ئایا وابڕیارە کە کۆمەڵگا و دەسەڵات، ئێمە وەك تاك ڕێنوێنی، پەروەردە کۆنترۆڵ بکات و بە قاڵبێکی تایبەتی دەری بێنین یان ئەمەی کەبوونی کۆمەڵگاو وڵات لەبەر تاکە؟ ئایا تاك ئامانجی کۆمەڵگایە یان ئەمەی کە تەنیا ئامرازی گاڵتە و سەرگەرمییە کە دە بێت شتی پێ فێرکرێت، کەڵکی لێوەربگرێت و ئەو وەك ئامرازێك بۆشەڕ، قەسابی بکەیت؟ ئەمە گرفتێکە کە لە بەرامبەر زۆربەی ئێمەدا هەیە. ئەمە گرفتی دونیایە چ تاك تەنیا ئامرازی کۆمەڵگا بێت و جۆری ئامرازی گاڵتە و سەرگەرمی کاریگەرییەکان کە دەبێت قالب بگرێت و چ بوونی کۆمەڵگا لەبەر تاك بێت.

چۆن دەتانەوێت لەم پرسە تێبگەن؟ ئایا ئەم گرفتە جددییە؟ ئەگەرتاك تەنیا ئامرازی کەرەستەی کۆمەڵگا بێت، ئەوجا، کۆمەڵگا لەتاك زۆرگرنگترە. ئەگەرئەمە ڕاست بێت، ئیتر ئێمە دەبێت تاك بوونمان ڕەهابکەین و بکەوینە خزمەت کۆمەڵگا؛ تەواوسیستەمی پەروەردە فێرکردنمان دەبێت بگۆڕدرێت وتاك بگۆڕدرێت بۆ ئامرازێك کە دەبێت کەڵکی لێوەربگرن، دایڕوخێنن، لەنێوی ببەن و لەشەڕی ڕزگاریان بێ؛ بەڵام ئەگەربوونی کۆمەڵگا لەبەرتاکە، ئیتر دەور و ڕۆڵ — دەوری کۆمەڵگا — ئەمەنییە کە ئەو ناچاربە سازان لەبەرامبەرپێوەرو نموونەکاندا بکەین؛ بەڵکو دەبێت بۆئەو هەست و پێویستی ئازادی بەدیاری بێنین؛ کەوابوو ئەرکی ئێمە ئەوەیە کە بزانین کامیان ناڕاستە.

چۆن دەتانەوێت توێژینەوەی ئەم گرفتە بکەن؟ ئەمە گرفتێکی حەیاتییە؛ وانییە؟ ئەم گرفتە بە ئایدۆلۆژییەوە نەبەستراوە، نەئایدیالۆژی چەپ. نەئایدۆلۆژی ڕاست، ئەگەریش بە جۆرێ ئایدۆلۆژییەوە بەسترابێت، شتێکە کە تەنیا پەیوەندی بە باوەڕەوە دەبێت، باوەڕەکان بەردەوام پێکهێنەری دوژمنی، شێواوی و دووبەرەکی و نەسازانن. ئەگەرکەسێ بەستراوە بە کتێبە چەپیەکان، ڕاستییەکان یان کتێبە موقەدەسەکان بێت، لەو حاڵەتەدا تەنیا پێبەندی



باوەڕە، ئەم باوەڕە دەتوانێت باوەڕی بوودا بێت یان مەسیح، کاپیتالیزم، کۆمۆنیزم یان هەرباوەڕێکی تر. هەڵبەت ئەمانە باوەڕن، نەڕاستی. راستی هەرگیز حاشای لێناکرێت. باوەڕ لە بارەی ڕاستییەوە دەکرێت حاشای لێبکرێت. ئەگەر بتوانین ڕاستی باس و بابەتەکان بدۆزینەوە، ئەوکات دەتوانین بێ پشتبەستن بە باوەڕ، ئیش بکەین. لەم ڕووەوە ئایا پێویست ناکات ئەوەی کە کەسانی تر گوتوویانە، بنێینە لاوە؟ باوەڕە چەپ خوازەکان یان ڕێبەرانی دیکە، ئاکامی مەرجی بوونەوەی ئەوانە. کەوابوو، ئەگەر ئێوە لە دۆزینەوە و دەرخستنی خۆتاندا بەوەی کە لەکتێبەکاندا دەدۆزریتەوە ئۆگری بنوێنین، تەنیا خۆتان بە باوەڕ ڕازی هێشتووەتەوە و ئەوە پێی ناڵێن زانست.

چۆن مرۆڤ دەتوانێت ڕاستی ئەم گرفتە بدۆزێتەوە؟ لەم بارەوە کارئاکامی کردەوەیە. بۆ دۆزینەوەی ڕاستی پرسەکە، دەبێت لە هەموو پڕوپاگەندەیەك دووربین، مانای ئەم قسەیە ئەوەنییە کە ئەوکات، دەکرێت بێ بەستراوەیی بە باوەڕ سەیری گرفتەکە بکرێت. ڕۆڵی بنچینەیی فێرکردن و باوەڕهێنان، خەبەرکردنەوەی تاکە، بۆدیتنی ڕاستی ناو ئەم باسە، تاك دەبێت بە تەواوی ڕوون بێت و ماناکەی ئەوەیە کە ناکرێت بەمورشیدێك بە ستراوەبێت.

کاتێ سەرمەشقێك هەڵدەبژێرن، ڕاست بەم کارە شێواوی دروستدەکەن، کەواتە سەرمەشقەکانیش شێواون و ئەمە شتێکە لە دونیا خەریکە ڕوو دەدات، لەم ڕووەوە ئێوە ناتوانن لە نموونەکانتان هیوای ڕێنوێنی و یارمەتیتان بێت. زەینێ کە دەیەوێت گرفتەکە تێبگات، نەتەنیا دەبێت گرفتەکە بە تەواوی تێبگات؛ بەڵکو دەبێت بتوانین بە خێرایی شوێنی بکەوێت؛ لەبەرئەوە گرفت هیچ کات ناوەستێت. گرفت بەردەوام تازەیە، چ گرفتێ مردن لە برسی بێت، چ گرفتی دەروونناسی یان هەرشتێکی تر. هەموو قەیرانێك بەردەوام تازەیە، کەوابوو، زەین بۆ فامکردنی، دەبێت بەردەوام ڕوون و تازەبێت و لەشوێن کەوتندا پەلە و خێرایی لە خۆسیان بدات.هەست دەکەم زۆربەی ئێمە هەستمان بەپێویستی شۆڕشێکی دەروونی کردبێت. شتێکە بە تەنیایی دەتوانێت ئاڵووگۆڕێکی بنچینەیی دەرەکی و کۆمەڵایەتی پێکبێنێت. ئەمە گرفتێکە کە خودی خۆم و هەموو تاکەکان بە شێوەیەکی جیددی گرفتارین. گرفت ئەوەیە کە چۆن دەبێت لە کۆمەڵگا ئاڵوگۆڕێکی بنەڕەتی پێکبێت، ئەم ئاڵو گۆڕە دەرەکییە بێ شۆڕشی دەروونی نایەتەدی. بەسەرنج دان بەوەی کە کۆمەڵگا بەردەوام وەستاوە، هەرپراکتیك. هەر چاکسازییەك کە بەبێ ئەم شۆڕشە دەروونییە بێتە ئاراوە هەر بەو پێیە وەستاو دەبێت. کەوابوو بێ ئەم شۆڕشە

هەمیشەییەی ناوەوە جێی هیچ ئومێدێك نییە. چونكە بێ ئەو، كرداری دەرەكی دەبێتە شتێكی ڕۆتین. كرداری پەیوەندی نێوان ئێوە و ئەویتر، نێوان تۆ و من، لە كۆمەڵگا دروستدەبێت و تا ئەو كاتەی ئەم شۆڕشە هەمیشەییەی ناوەوە و ئەم ئاڵو گۆڕە دەروونناسییە داهێنەرە پێك نەیەت، كۆمەڵگا وەستاو دەبێت و چۆنیەتی ژیان بەخشی خۆی لەدەستدەدات. نەبوونی ئەم شۆڕشە بەردەوامی دەروون، كۆمەڵگا مەند و وەك بلوور لێدەكات و لەم ڕووەوە دەبێت بەردەوام لەت لەت ببێتەوە.

پەیوەندی نێوان خوای خۆتان و ڕۆژڕەشی و شێواوی دەروون و دەوروبەرتان چییە؟ بێگومان ئەم شێواوی و ئەم ڕۆژڕەشییە. خۆی لە خۆیدا پێك نەهاتووە. ئێوە من پێكمان هێناوە، نەكۆمەڵگای كاپیتالیتەكان، كۆمۆنیستەكان فاشیستەكان؛ بەڵكو ئێوە و من لە پەیوەندییەكانماندا لەگەڵ یەكتر هۆكار و موسەببین. ئەوەی كە لە دەروونـدا هەن بەدەرەوە — بەدونیا — هاوێژراوە، ئەوەی كەهەن ئەوەی كە بیردەكەنەوە، ئەوەی كە هەستی دەكەن، ئەوەی كە لە ژیانی ڕۆژانەتان ئەنجامی دەدەن، دەهاوێژرێتەوە دەرەوە و جیهان دروستدەكات. ئەگەر ئێمە لە ناوەوە شێواو و داماو تووشی ئاڵۆزی و پشێوی هاتبین، دانەوەی ئەم دۆخە بەشێوەی هەرئەم دونیا و هەرئەم كۆمەڵگا دەدرێت. لەبەرئەوەی پەیوەندی نێوان ئێوە و من و ئەویتر، كۆمەڵگا پێكد ێنێت. كۆمەڵگا بەرهەمی پەیوەندی ئێمەیە — ئەگەر پەیوەندی ئێمە شێواو، خۆخواز، بیرتەسكانە — بەرتەسك و نەتەوە خوازیارانە بێت، ئەمانە دەدەینە دەرەوە و دەبێتە هۆی بشێوی لە جیهاندا.

دونیا هەر ئەوەتە كە ئێوە هەن؛ كەوابوو، كێشەی ئێوە كێشەی دونیایە. گومانتان نەبێت. ئەمە ڕاستییەكی بنچینەیی و سادەیە. ئێمە لە پەیوەندییەكانماندا لە گەڵ تاكێك یان كەسانێكی زۆر، گۆیا تارادەیەكی زۆر ئەم خاڵە لەبەرچاو ناگرین. بۆچوونی ئێمە ئەوەیە كەلەڕێگای سیستەمێكەوە یان لە ڕێگای شۆڕشێكەوە لە ئیدەكاندا، یان ئەو بایەخەیانەی كەلەسەر بنەمای سیستەمێكە، گۆڕان پێكبێنن، ئەمە لە بیردەبەینەوە كە خولقێنەری كۆمەڵگا، من و ئێوەین، منو ئێوە ین كە شێوازی ژیان كردنمان دەبێتە هۆی ڕێكوپێكی یان شێواوی؛ كەوابوو دەبێت لە نزیكەوە دەستی پێبكرێت؛ بەواتایەكی تر، ئێمە دەبێت بەرامبەربەبوون، بەرامبەر بە سۆز و هزر و كارەكانی ڕۆژانە كەلە شێوازی بەڕێوەچوونی ژیان و لە پەیوەندی لەگەڵ ئیدە و باوەڕەكاندا بەرجەستە دەبێت، پابەندبین. بەمە دەڵێین بوونی ڕۆژانەی ئێمە، مەگەر جیالەمەیە؟ ئێمە بەرامبەربە گوزەران،



بەرامبەربە پیشە، بەرامبەربە داهات، بەرامبەر بە پەیوەندیمان لەگەڵ دراوسێكان، هەروەها بەرامبەربە بڕواو باوەڕەكان پابەندین.هەنووكە ئەگەر لە پیشەی خۆماندا دەستبە لێكۆڵینەوە بكەین، دەبینین كە لە بنەڕەتدا لەسەر بنەمای بەخیلی و بەرچاو تەنگی دامەزراوە و تەنیا ئامرازێك بۆ گوزەران نییە.

كۆمەڵگا بە جۆرێ دروستبووە كە ئاڕاستەیەكی بەردەوامی دژیەتی و بوون پێكدێنێت شتێكە لەسەربنەمای بەرچاوتەنگی و بەخیلی، بەرچاوتەنگی بەرامبەربە لە خۆسەرتر، كاتێ سكرتێرێك دەیەوێت ببێتە بەڕێوەبەر، ڕوونە كەتەنیا پابەندە بە گوزەران كە ئامرازێكە بۆمانەوە، نییە؛ بەڵكو لەبۆ بەدەستهێنانی پلەو پایەدا.

ڕوانگەیەكی بەم جۆرە، بەشێوەی سروشتی لە كۆمەڵگاو لە پەیوەندییەكاندا تالاَن و چەپاوی پێكدێنێت، بەلاَم ئەگەرئێوە ومن تەنیا پابەندی گوزەران دەبووین، دەبووا ڕێگەی ڕاست پێگەیشتنمان بدۆزیبایەتەوە. ڕێگایەكی ڕاست كە ڕەگی لە بەخیلیدا نەبێت. بەرچاوتەنگی و بەخیلی یەكێ لە ڕوخێنەرترین هۆكارەكانە لە پەیوەندیدا، لەبەر ئەوە بەخیلی نیشاندەری حەز لە دەسەلاَت و حەزلە پلە و پایە و سەرئەنجام بە زانستی سیاسەت دەگات كە هەردوو بە توندی پێكەوە بەستراون. سكرتێرێك كەبە دوای بەڕێوەبەربوونەوەیە، دەبێتە هۆكارێك لە پێكهێنانی سیاسەتەكانی دەسەلاَتدا كە هەڵئایسانی شەڕ پێكدێنێت. لەم ڕووەوە ئەو بەرپرسی ڕاستەوخۆی شەڕە.

پەیوەندیمان لەسەربنەمای چ شتێكە؟ پەیوەندی نێوان ئێوە و من و ئێوە و ئەویتر- كە ناوی كۆمەڵگایە — لەسەر بنەمای چییە؟ بێگومان لەسەر بنەمای خۆشەویستی نییە، بڕۆین كە لەوبارەیەوە قسەدەكەین. لەسەربنەمای خۆشەویستی نییە، لەبەرئەوە ئەگەر لەسەر بنەمای خۆشەویستی بوایەت. ڕێكوپێكی بوونی هەبوو، هیمنائێیك بوونی هەبوو بەختەوەریش لە نێوان ئێوە و مندا، بەلاَم لەم پەیوەندییەی نێوان ئێوە و مندا خراپ خوازی زۆر هەیەكە شێوەی ئیحترام دەگرنە خۆیان. ئەگەر هەردوو كەسمان لە ئەندێشەوە هەستا یەكێ بواین. ئیحترامێك بوونی نەبوو، خراپە خوازی بوونی نەبوو لەبەر ئەوە ئەوكات ئێمە دوو كەسێك دەبووین كە جوولاَنەوەمان بەرامبەریەكتر نەدەچووە ناو چوارچێوەی مامۆستاو قوتابی و نە شوویەك كە بەدوای دەست ڕۆیشتن بەسەرژندایە و نەژنێك كەبەدوای دەستەلاَت بەسەرشوودایە. كاتێ خراپە خوازی هەیە، حەز بەدەست ڕۆیشتوویی هەیە كە بۆخۆی پێكهێنەری بەخیلی، ڕك هەستان و ئیشتیای جنسی كە هەمووئەمانە لە پەیوەندییەكانماندا

ناکۆکی بەردەوام پێکدێنێت. شتێکە هەوڵی ئێمە ئەوەیە کە لێی دووربکەوینەوە، ئەمەش دووبارە دەبێتە هۆی پشێوی و ڕۆژرەشی زیاتر.

بەڵام دەربارەی ئەو باوەڕانەی کە بە شێکن لە ژیانی ڕۆژانەمان، باوەڕو داڕێژراوەکان ئایا ئەوانە هۆکاری شێواندنی زەینی ئێمە نین؟ گەمژەیی چییە؟ گەمژەیی بریتییە لە دانی بایەخی هەڵە بەو شتانەی کە زەین دروستیاندەکات، یان بەو شتانەی کە دەسکردن. زۆربەی بیرکردنەوەکانمان لە حەزی پێشوازی کردن لەخۆ، سەرچاوە دەگرێت. زۆرێك لە باوەڕەکانمان چەمکی هەڵە لەخۆدەگرن، چەمکێ کە لەخۆدا نییانە. کەواتە کاتێ بەچوارچێوەیەك باوەڕمان هەیە، چ مەکتەبی، چ ئابووری یان کۆمەڵایەتی، کاتێ باوەڕمان بە ماورا هەیە، بەباوەڕ، بەسیستەمێکی کۆمەڵایەتی کە مرۆڤ جیادەکاتەوە، بە ناسیۆنالیزم و هتد. گومانی تێدانییە کە بە باوەڕچەمکی هەڵە دەدەین کە نیشاندەری گەمژەییە. لەبەرئەوە باوەڕی تاکەکان لێك جیادەکاتەوە و هۆکاری نزیکی نییە، کەوابوو دەیبینین بەو شێوەی کە ئێمە دەژین، هەم دەکرێت هۆکاری ڕێك و پێکی بێت و هەم بشێوی، هەم هێمنایی و هەم ناکوکی ،هەم بەختەوەرو هەم ڕۆژڕەشی.

کەواتە پرسی ئێمە ئەوەیە کە ئایا کۆمەڵگایەکی وەستاومان هەبێت و هاوکات کەسانێکیش کە ئەم شۆڕشە هەمیشەییەیان تێدا بەردەوام بێت؟ بەواتایەکی تر، شۆڕش لە کۆمەڵگادەبێت بە ئاڵوگۆڕی دەروونی و دەروونناسی تاك دەستپێبکات. زۆربەی ئێمە دەمانەوێت شایەتی ئاڵوگۆڕێکی بنچینەیی لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتیدا بین. تەواو ئەوشەڕانەی کە لە دونیا بڵێسەی کێشاوە، هەرئەوەیە، پێکهێنانی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی لە ڕێگای ئامرازی کۆمۆنیزمی یان لە ڕێگایەکی دیکەوە.

ئێستا ئەگەر شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی بوونی هەبێت، ئیشێکە تایبەت بە پێکهاتەی دەرەوەی مرۆڤ و ئەگەر شۆڕشی دەروونی تاك و ئاڵوگۆڕی دەروونناسی بوونی نەبێت، زات و ناوەڕۆکەکەی وەستاوی و مەندییە، کەوابوو بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی کە نەدووپاتکراو بێت و نەلەبەریەك هەڵوەشاو، کۆمەڵگایەك کە ژیانی بەردەوامی هەبێت، پێویستە لە پێکهاتەی دەروونزانی تاکدا، شۆڕشێك ڕوربدات. لەبەرئەوە بێ ئەم شۆڕشە دەروون زانییەی ناوەوە، ئاڵو گۆڕی تاکو تەنیای دەرەوە گرنگی ئەوتۆی نابێت. بە دەربڕینێکی تر کۆمەڵگا هەردەم بلوور ئاسا وەستاو دەبێت و بەردەوام لەت لەت. هەرچی یاسای زیاتر و بەهێزتریش دابنرێت.



کۆمەڵگای بێ ڕاوەستان ئاراستەی گەندەڵی دەگرێتە بەر. لەبەرئەوە شۆڕش دەبێت لە دەروونەوە ڕووبدات نەتەنیا لە دەرەوە.

هەستدەکەم تێگەیشتنی ئەم بابەتە و سادە تێنەپەڕین لێی، بایەخی هەبێت. کاتێ ئیشی دەرەوە ئەنجام بوو، تەواوە، وەستاو و مەندییە، ئەگەر پەیوەندی نێوان تاکەکان کە هەمان کۆمەڵگایە، ئاکامی شۆڕشی دەروونی نەبێت ئەو کات پیکهاتەی دەروونی بە هۆی وەستاوی، تاك دەسوێنێت، بەم جۆرە ئەویش هەربەم شێوە وەستاو و دووبارە دەکات. بە تێگەیشتنی ئەم باسە و فامی گرنگی لە رادەبەدەری ئەم ڕاستییە، ئیدی پرسیارێك بۆ رازی بوون و ڕازی نەبوون نامێنێتەوە. ئەمە ڕاستییەکە کە کۆمەڵگا بەردەوام خەریکی بلوور ئاساکردن و سواندنی تاکە، ئەم شۆڕشە بەردەوام و داهێنەرە، تەنیا لە تاکدا دەتوانێت پێکبێت، نەلە کۆمەڵگاو نەلە دەرەوە؛ یانی شۆڕشی داهێنەر تەنیا دەتوانێت لە پەیوەندی تاکدا کە کۆمەڵگایە، روو بدات دەیبینین کە چۆن پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ئیمرۆژەی هیند، ئەوروپا، ئەمەریکاو هەموو شوێنێکی دونیا بە خێرایی لە حاڵی لەت لەت بووندایە، هەروەها ئەوەیش لە دووتوێی ژیان — ماندا دەیبینین. هەربەم جۆرەی کە بە شەقامدا دەگەڕێین، ئەوە دەبینین، پێویست ناکات کە مێژووناسانی گەورە پێمان بڵێن کۆمەڵگا لە حاڵی لێك ترازان و لەت لەت بووندایە و پێویستی بە میعماران و بنیاتنەرانی نوێ بۆ دروستکردنی کۆمەڵگایەکی تازە هەیە. ئەم پێکهاتە نوێیە دەبێت لەسەر بنچینەیەکی نوێ و لەسەر ڕاستی و بایەخە نوێیەکان دامەزرێت و ئەم جۆرە میعمارانەش تا ئێستا نین.

دروستکەرانێ کە بەبینینی ئەم ڕاستییە بزانن کە ئەم پێکهاتە لە حاڵەتی ڕووخاندایە و خۆیان بکەنە میعمار، بەهیچ جۆربوونیان نییە. گرفتی ئێمە ئەوەیە بە چاوی خۆمان دەیبینین کە کۆمەڵگا لە حاڵی لەت لەت بوون ولێکترازاندایە و ئەمە ئێمەین — ئێوە ومن — کە دەبێت میعمارانی کۆمەڵگا بین. ئێوە ومن دەبێت بایەخەکان لە ئەوەڵەوە گیربێنینەوە و بیناکە لەسەر بناغەیەکی قایم ترو هەرمانی تربنیات بنێین، لەبەر ئەوە ئەگەر چاولە میعمارانی کارامە و سازندەگان سیاسی و مەزهەبی بکەین ڕاست تووشی هەرئەو بارودۆخە دەبین کە پێشتر بوومان.

لەبەرئەوە ئێوە و من داهێنەرنین، کۆمەڵگامان تائاستی ئەم پشێوییە دابەزاندووە کەوابوو ئێوە و من دەبێت داهێنەربین، لەبەر ئەوە گرفتەکە نابێت وەدرەنگ بخرێت؛ ئێوە ومن دەبێت لە هۆکانی داڕووخانی کۆمەڵگا ئاگاداربین و پێکهاتەیەکی نوێ پێکبێنین. پێکهاتەیەك لە سەربناغەی فام و تێگەیشتنی داهێنەرانەی خۆمان، نەلاسایی کردنەوەی ڕووت. شتی واپێویستی بە نەرێنی بیرکردنەوەیە. نەرێنی بیرکردنەوە بانترین شێوەی فامکردن و تێگەیشتنە. بە واتایەکی تر، بۆ فامکردنی ئەوەی کە بیرکردنەوەی داهێنەرانەی پێدەڵێین، دەبێت لەگەڵ گرفتەکەدا بە شێوازێکی نەرێنی بجووڵێینەوە. لەبەر ئەو جووڵانەوەی ئەرێنی لەگەڵ گرفتدا — کەماناکەی ئەوەیە ئێوەومن بۆ دروستکردنی پێکهاتەیەکی نوێی کۆمەڵایەتی، دەبێت ببینە داهێنەر — شتێکە دووبارەکراو بۆفام کردنی ئەوشتەی کە لە حاڵی لەت لەت بووندایە، دەبێت لەودا توێژینەوە بکرێت، دەبێت بە شێوەیەکی نەرێنی لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت، نەبە سیستەمێکی ئەرێنی، فۆرمۆلێکی ئەرێنی و دەرئەنجامێکی ئەرێنی، بۆچی کۆمەڵگا لەحاڵی لەت لەت بوون و لێکداکەوتن دایە؟ کەلەڕاستیشدا وایە یەکێ لە هۆکارە بنچینەییەکانی ئەمەیە کەتاك — ئێوەومن — ئیتر داهێنەرنین. مەبەستەکەم باسدەکەم: ئێوە ومن بووینەتە چاولێکەر، ئێمە کۆپیکەرین، چ لە دەروون وچ لە دەرەوە. لە دەرەوە کاتێ تەکنیکی فێردەبین، کاتێ لەگەڵ یەکتردا لە ئاستی قسەدا پەیوەندی پێکدێنین، بێگومان دەبێت لاسایی و کۆپی بوونی هەبێت. بۆئەندازیار بوون دەبێت سەرەتا تەکنیکەکەی فێرببین، سەرەنجام بە کەڵك وەرگرتن لەو تەکنیکە، پردێ دروستبکەین. لە تەکنیکی دەرەوە دەبێت ئاستێکی دیاریکراولە لاسایی کردنەوە و کۆپی هەبێت؛ بەلاّم لە جێیەکدا کە لاسایی دەرون زانینی دەروونی بێت، ئیتر داهێنەرنابین. فێرکردن و پەروەردەکردنی ئێمە، پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ئێمە، ژیانی بەناو مەزهەبی ئێمە. هەموویان لەسەر بنەمای لاسایی کردنەووەن. یانێ من خۆم دەدەم بە دەست فورمۆلێکی کۆمەڵایەتی یان مەزهەبی تایبەتەوە. من لەمەی کە تاکێکی ڕاستەقینەبم، تێداماومەتەوە، لەڕووی دەروون زانییەوە من بووم بە ماشینێکی دووبارە کراو بەوەلامی دیاریکراوی عادەتییەوە. چ ئەم وەلاّمانە لە لایەك هیندەکان، مەسیحەکان، بوودابیەکان، ئالمانییەکان یان ئینگلیزەکانەوە بێت وەلاّمەکانی ئێمە لەسەر بنەمای سەرمەشق و نموونەی کۆمەڵگا - چ ڕۆژهەلاّتی،چ ڕۆژئاوایی، چ مەزهەبی یان



ماتریالیت — داڕێژراوە. کەوابوو، یەکێ لە هۆکارە سەرەکییەکانی شیبوونەوەی کۆمەڵگا لاسایکردنەوە و یەکێ لە هۆکارەکانی داڕووخانی، سەرمەشقە. سەرمەشقێکە کە زات و بنەمای بوونی لاسایکردنەوە پێکیدێنێت. بۆ تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی کۆمەڵگا لە حاڵی شیبوونەوەدا، ئایا ئەم پرسە گرنگ نییەکە بپرسین ئایا ئێوە من — وەك تاکەکان — دەتوانین داهێنەربین؟

دەبینین کاتێ لاساییکردنەوە هەیە، شیبوونەوەش دەبێ ببێت، کاتێ دەسەلاّت هەیە، کۆپیکردنیش دەبێ ببێت، لەو ڕووەوە کە تەواو پێکهاتەی زەینی و دەروونی ئێمە لەسەر بنچینەی دەسەلاّتە، دەبێت ڕزگاری لە دەسەلاّت و داهێنەربوونیش هەبێت. ئایا پێتان نەزانیوە کە لە ساتەوەختەکانی داهێنان، لەساتە وەختەکانی دڵخۆشی دوای ئەویندارى، شتێ بە ناوی دووپات کردن، بەناوی کۆپی کردن نییە؟ ئەم ساتانە هەردەم تازە، داهێنەر و هاوڕێ لەگەڵ شایی و خۆشیدان. کەوابوو، دەیبینین کە یەکێ لە هۆکارە سەرەکییەکانی شیبوونەوەی کۆمەڵگا، لاسایکردنەوە، یانێ پەرستنی خاوەن دەسەلاّتەکانە.

# فەسڵی چوارەم

## خۆناسی

گرفتەکانی دونیا ئەوەندە گەورە و پێچاوپێچن کە بۆ تێگەیشتنیان و چارەسەرکردنیان دەبێت بە شێوەیەکی سادە و سەر ڕاست لەگەڵیان بجووڵێینەوە؛ ئەم سادەیی و سەر ڕاستییە نەبە هەلومەرجی دەرەکییەوە پەیوەندی هەیە نەبە دەمارگیری و نەبە بارودۆخی خودی خۆمانەوە. هەروا کە ئاماژەم پێکرد، ڕێگە چارەکەی نە دەبێت لە کۆنفرانس و گەلاڵەکاندا بدۆزرێتەوە و نە لە ڕێگای دانانی ڕێبەرانی نوێ لە جیاتی ڕێبەرانی کۆن و نەلەم جۆرە کارانە. ئاشکرایە کە ڕێگەچارە لە پێکهێنەرانی گرفت و لە پێکهێنانی خراپە کاری، ڕقولێك تێنەگەیشتن و ناکۆکی بێژماری نێوان بوونەوەرانی مرۆیی حەشاردراوە. بەڵێ پێکهێنەری ئەم خراپە کاری و گرفتانە، تاکە — ئێوە من، نەدونیا — بەو جۆرەی کە ئێمە هەستدەکەین. دونیا، پەیوەندی ئێوەیە لەگەڵ ئەوانیتردا. دونیا شتێکی جیا لە من و تۆنییە. دونیا و کۆمەڵگا پەیوەندییەکە کە ئێمە دروستیدەکەین یان لەبەردایین لە نێوان یەکتردا پێکیبێنین.

کەواتە، گرفت، من و ئێوەین، نەدونیا، لەبەرئەوە دونیا ڕەنگدانەوەی ئێمەیە و بۆتێگەیشتن لە دونیا دەبێت لە خۆمان تێبگەین.دونیا جیا لە ئێمە نییە، ئێمە دونیاین و گرفتەکانمان گرفتی دونیایە. ئەمە شتێ نییە کەبکرێت زۆر دووبارە بکرێتەوە. لەبەر ئەوە ئێمە ئەوەندە بیرکۆڵین کەخەیاڵ دەکەین گرفتەکانی دونیا پەیوەندی بە ئێمەوە نییە، ئەم گرفتانە دەبێت ڕێکخراوی نەتەوەکان چارەسەری بکات، یان دەبێت ڕێبەرانێکی تازە لە جیای ڕێبەرانی کۆن دابنێن. ئەو کەسەی کە بەم جۆرە بیردەکاتەوە، بۆچوونێکی لێڵی هەیە؛ لەبەرئەوە ئێمە لەم بێدەرەتانییە ترسێنەروشێواوییەی دونیاو لەم شەڕەی کە بەردەوام هەڕەشەمان لێدەکات، بەرپرسیایەتیمان هەیە. بۆ گۆڕینی دونیا، دەبێت لە خۆوە دەستپێبکەین و ئەوەی کە لەم لەخۆ دەستپێکردنەوە گرنگە، نییەتە، دەبێت نییەتی ئێمە ئەمەبێت کەخۆمان بناسین و نەهێڵین کە ئەوانیتربۆ گۆڕانی خۆ وپێکهێنانی ئاڵوگۆڕی گونجاو، دەست بدەینە شۆڕشی چەپی یان ڕاستی. ئەوەی کە گرنگە ئەمەیە بزانین کە ئەم



بەرپرسیاریەتییە لە ئەستۆی ئێمەیە — ئێوە و من — لەبەر ئەوە دونیایەکە ئێمە تێیدا دەژین هەرچەندە بچوکیش بێت، ئەگەر ئێمە خۆمان بگۆڕین و لە ژیانی ڕۆژانەماندا بۆچوونێکی تەواو جیاواز پێکبێنین، لەوانەیە لە تەواوی دونیا، کەپەیوەندییەکی بەربلاّوە لەگەڵ ئەوانیتردا، کاریگەریمان هەبێت.

هەربەوجۆرەی کەگوتم، ئێمە دەبێت لە هەوڵدابین کە ئەم ئاڕاستەی فامکردن و تێگەیشتنەی خۆمان دەسنیشانی بکەین، ئەمە، ئاڕاستەیەك نییە گۆشەگیر بکات، ئەمە ناوی پاشەکشێ لە دونیا نییە، لەبەر ئەوە هیچ کەس ناتوانێت لە تەریکی ودوورە پەرێزیدا ژیان بکات. بوونی یانێ لەپەیوەندی دابوون و شتێ بەناوی ژیان لە گۆشەگیریدا بوونی نییە. ئەوەی کە دەبێتە هۆی دژیەتی، شەڕ، چارەڕەشی، نەبوونی پەیوەدیەکی دروستە.

دونیای ئێمە هەرچەندە پچوکیش بێت، ئەگەر ئێمە بتوانین لەم دونیا تەنگەدا ئاڵو گۆڕ بەسەر پەیوەندییەکانماندا بێنین، دەبێتە وەك شەپۆلێك کە دامێنەکەی بۆ دەرەوە بەرین دەبێتەوە. هەستدەکەم تێگەیشتنی ئەم خاڵە گرنگی هەیەکە دونیا، هەرچەندەش تەنگ بێت، یانێ پەیوەندی ئێمە و ئەگەرئێمە بتوانین لەودا ئاڵوگۆڕێك پێکبێنین. ئەوجا دەتوانین بە شێوەیەکی چالاکانە ئاڵوگۆڕ لە دونیا پێکبێنین. شۆڕشی ڕاستەقینە بەبێ هیچ سەرمەشقە دیاریکراوێکی - چەپ یان ڕاست — نییە.

بەڵکو شۆڕشی بایەخەکانە، شۆڕشێکە کە لە بایەخە هەستیارەکانەوە دەستپێدەکات و بەبایەخە ناهەستیارەکان، یان ئەو بایەخانەی کەلەژێرکاریگەری شوێن و دەوروبەردا پێك هاتوون، تەواودەبێت. بۆبەدەست خستنی ئەم بایەخە ڕاستەقینانە کەدەبێتە هۆی شۆڕشێکی پنچینەیی، یانێ ئاڵوگۆڕێك یان دروستبوونێکی نوێ، دەبێت خۆبناسین. خۆناسی، دەسپێکی ئاوەزە، لەم ڕووەوە سەرەتای ئاڵوگۆڕو دروستبوونێکی نوێیە.

بۆخۆناسین دەبێت نیەتی تێگەیشتن بوونی هەبێت و لێرەوە یەکە گرفتی ئێمە دەست پێدەکات. سەرەڕای ئەوەی کە زۆربەی ئێمە ناڕازین حەزدەکەین ئاڵوگۆڕێکی لە ناکاو پێك بێنین؛ ناڕازیبوونی ئێمە تەنیا لەبەر ئەوەی کە بە ئاکامێکی دیاریکراو بگات، کانالیزە دەبێت لەبەر پێخۆش نەبوون بە دوای پیشەیەکی دیکەدا دەڕۆین یان بە تەواوی خۆبەدەست دەوروبەرەوە دەدەین، ناڕازی بوون بەجێی ئەوەی کە ئێمە هەڵیگیرسێنێت ئێمە ناچاردەکات کە ژیان و هەموو ڕەوتێکی بوون ببینە ژێر پرسیار، ناڕازیبوون کانالیزە دەبێت و بەو جۆرە ئێمە دەبینە مرۆڤی ئاستی ناوەڕاست و پاڵنەرو شەوقی پێویست بۆ تێگەیشتنی لە مانای سەرەکی

ژیان لە دەست دەدەین. لەم ڕووەوە گیرهێنانی ئەم شتانە لە ڕوانگەی خودی ئێمەوە بایەخی هەیە، لەبەر ئەوە ناسینی خۆ ئەوانیتر ناتوانن بیدەین بە ئێمە، شتێکیش نییەکە بە یارمەتی کتێب فێری بین. دەبێت هەڵوەدای بین و بۆ ئەم کارە دەبیست نیەت، گەڕان و بەدواداچوون و پشکنین لە بەرنامەدا بێت. هەتا کاتێ کە ئەم نیەتە بۆ گیرهینان و تۆیژینەوەێکی قوول، لاواز یان نەبێت، داوایەکی رووت یان داخوازییێکی بە ڕێکەوت بۆ تێگەیشتن لە خۆ، مانایەکی ئەوتۆی نابێت.

کەوابوو ئالوگۆڕ لە دونیا بە ئاڵوگۆڕ لە خۆدا پێکدێت، لە بەر ئەوە خود، بەرهەم و بەشێك لە ڕەوتی گشتی بوونی مرۆڤە. ناسینی خۆ بۆ گۆڕانی خود پیویستە، گۆڕان بەبێ ناسینی خۆ بوونی نابێت، مرۆڤ دەبێت خۆی بەوجۆرەی کە هەیە بناسێت، نەك بەو جۆرەی کە دەیهەوێت ببێت، کە تەنیا ئایدەئالیەك زیاتر نییە، کەوا بوو دەستکرد و ناراستەقینەیە. تەنیا ئەوەی کە هەیە دەتوانێت بگۆڕدرێت، نەك ئەوەی کە ئێوە دەتانەوێت ببێت. خۆناسین، بەوجۆرەی کە تاك هەیە، پیویستی بە وشیاری بێ وێنەی زەین هەیە. لە بەر ئەوە((ئەوەی هەیە)) بەردەوام لە حاڵی ئاڵ و گۆڕ و گۆڕان دایە و بۆ ئەوەی کە زەین پێ بە پێی ئەو بڕواتە پێش، نابێت دیلی هیچ دەمارگیری، باوەڕ یان سەرمەشقێکی تایبەت بێت. ئەگەر دەمانەوێت پێ بە پێی شتێ بڕۆین، نابێت دیلی داو و بەند بین. بۆ خۆناسین دەبێت وشیاری زەینی هەبێت هەتا رزگاری لە هەموو باوەڕ و وێنەگەراییەکان بێتە دی.لە بەر ئەوە ئیشی باوەڕ و بیرۆکەکان، ئاوەژوو پیشاندانی ئیشەکانە، شتێ کە دەبێتە کۆسپی تێگەیشتنی راست ودروست. ئەگەر دەتانەوێت بزانن چین، نە دەتوانن لەوەی نین وێنەیەکی زەینیتان هەبێت و نە باوەڕێك. کاتێ من چاوچنۆك و بەخێل و تووڕەم، هەبوونی ئایدەئاڵ، هیمنی، چاوچنۆك نەبوون و بەرچاو تەنگ نەبوون بایەخی ئەوتۆی نییە، بەلاّم زانین و تێگەیشتن لەمەی کە تاکی چاوچنۆك یان تووڕەیە، پێویستی بە تێگەیشتنێکی بێ وێنە هەیە. شتی وا شەرافەت و پاکی هزری دەوێت. لە حاڵێکدا چوون بە دوای ئیدەئالێکدا و دوورکەوتنەوە لە((ئەوەی هەیە))، هەلاتنێك دەژمێردرێت، هەلاّتنی کە تاك لە تێڕامانی و چالاکی راستەوخۆ لە سەر ئەوەی کە هەیە، رادەگرێت. فام کردنی ئەوەی تاك هەیە، هەرچی کەهەیە_جوان یان دزێو، خراپە کار یان قۆڵ بڕ_ بێ دەستکاری سەرەتای خۆپارێزی و دشکردنە. دشکردن پێویستە، لە بەر ئەوەی ئازادی بەخشە. تەنیا لە خۆپارێزی و دشکردن دایە کە مرۆڤ دەتوانێت تێرامانی هەبێت و ژیان بکات.



هەڵبەتە نەك لە پەروەردە کردنی دشکردندا، کە تەنیا دەبێتە هۆی بەرپرسیاریەتی، نەك لە تێگەیشتن و ئازادیدا. جیاوازی هەیە لە نێوان دژکام بوون و دژکام کران، دژکام بوون لە تێگەیشتنی ئەوەی هەیە سەرچاوە دەگرێت، لە حاڵێکدا دژکام کران بریتییە لە خستنە دواوە و داپۆشینی ئەوەی هەیە لەگەڵ ئەوەی کە تاك حەزدەکات ببێت. کەوابوو، لە دژکام کراندا، تاك لە پراکتیکی راستەوخۆ لە سەر ئەوەی هەیە دووری دەکات. ڕەوتی دووری لە((ئەوەی هەیە))، لە ریگای پەروەردەی ئایدەئالەکان، دشکردن و خۆپارێزی دەژمێردرێت. بەلاّم ئەگەر بەوردی و راستە وخۆ سەرنجی بدەین دەبینین کە بە هیچ جۆرێك وا نییە. ئەمە تەنیا جۆری بە دواخستن و بەرەورووبوونەوە لە گەڵ((ئەوەی هەیە)) دایە. دشکردن، کرانی ((ئەوەی نییە)) نییە، بەڵکو تیگەیشتنی((ئەوەی هەیە))، کە وابوو رزگاری لەوەی هەیە. دشکردن و خۆپارێزی لە خۆشی دونیا لە کۆمەڵگایەکدا کە بە خێرایی لە حاڵی شیبوونەوە دایە، پێویستە. بۆ پێکهینانی دونیاییێکی نوێ بە پێکهاتێکی نوێ و دوورلە پێکهاتەی کۆن، دەبێت ئازادی —مکاشفە-- ببێت وبۆ سەربەست بوون، دەبێت دشکردن ببێت، لەبەر ئەوە بێ دشکردن ئازادی نییە. ئایا کەسێ کە گەندەڵی وخراپە کارکە تێدەکۆشێت دژکام بێت، بەراستی دەزانێت دشکردن چییە؟ کەسێك کە ئەخلاقی نەبێت، هەرگیز ناتوانێت سەربەست بێت کەوابوو هەرگیز نا توانێت ڕاستی تێبگات. ڕاستی تەنیا لە فام کردنی "ئەوەی هەیە " دەکرێ گیربێت و بۆفام کردنی " ئەوەی هەیە" دەبێت ئازادی بوونی هەبێت، ئازادی لەترسی " ئەوەی هەیە ".

بۆ تێگەیشتنی ئەم ئاڕاستەییە، دەبێت نییەتی زانینی (ئەوەی هەیە)، لە گەڵ بوونی لەگەڵ هەر بیر و هەست و کارێك، هەبێت، هەڵبەت تێگەیشتنی ئەوەی کە هەیە، لە ڕادەبەدەر دژوارە، لەبەر ئەوە ئەوەی کە هەیە هەرگیز مەند و ئارام نییە و بەردەوام لە جووڵەدایە. ئەوەی هەیە، هەرئەوشتەیە کە ئێوە هەن، ئەوشتەی کە حەزدەکەن ببێت، ئیدە ئاڵ نییە، لەبەرئەوە ئیدەئالّی دەستکرد، بەڵکو هەرئەو شتەیە کە ئێوە هەر چرکەیەك ئەنجامی دەدەن، بیری لێدەکەنەوە و هەستیپێدەکەن. " ئەوەی کە هەیە" ڕاستییە و تێگەیشتنی ڕاستی پێویستی بە زانین، زەینی وشیارو خێرایە، بەلاّم ئەگەر دەست بە کار مەحکووم کردنی " ئەوەی کەهەیە" ببین، ئەگەربگەڕێین بە دوای کەم وکورتی و عەیبەکانیدا و بەرامبەری ڕادەوەستین و پێداگیری بکەین. ئەوکات جوولاّنی تێناگەین. ئەگەر من مەیلم بێت کەسێ فام بکەم، ئەو

مەحکوم ناکەم، بەڵکو دەبێت دەستبکەم بە سەیرکردن و خوێندنەوەی. دەبێت ڕاست هەر ئەوشتە کە دەیخوێنمەوە، حەزم لێیبێت.

ئەگەر دەتانەوێت منداڵێ فام بکەن، دەبێت ئەو تان خۆش بوێت، نە ئەوەی کە سەرکۆنەی بکەن. دەبێت لەگەڵی یاریبکەن، چاودێرجموجۆڵ، تەکیە کەلام و شێوازی ڕەفتاری بن، بەڵام ئەگەر تەنیا سەرکۆنەی بکەن، بگەڕێن بەدوای کەم وکوڕی و عەیبەکانیداو لەهەمبەریدا پێداگیری بکەن، تێگەیشتن و فامکردنی منداڵەکە پێکنایەت. هەربەم شێوە، بۆفام و تێگەیشتنی ئەوەی کەهەیە، تاك دەبێت دەستبکات بە ڕوانینی وردی بیرو هەست و کردەوەی چرکەبەچرکەی خۆی لە "ئەوەی کە هەیە". ڕاستی یانێ ئەمە هەرکردەوەیەکی دیکە، ئیدەئال یان ئیدولوژیك، ڕاستی نییە، تەنیا ئارەزووە، ئارەزوویەکی خەیاڵی کە شتێکە جگە لە "ئەوەی کە هەیە ".

بۆ تێگەیشتن ئەوەی کەهەیە، پێویستی بە بارودۆخێك لە زەین هەیە کەلەودا نە دیاریکردنی شوناس هەیە و نەمەحکومکردن، کەماناکەی ئەوەیە، خاوەن زەینێکی وشیارین و لەهەمان کاتدا پاسیڤ. کاتێ دەمانەوێت شتێ بە ڕاستی تێبگەین، لەوەها بارودۆخێکدا ین. کاتێ کە ئۆگری زۆرە، دۆخی زەین لە دایك دەبێت، کاتێ کەسێ ئۆگرە بە تێگەیشتنی " ئەوەی کە هەیە " واتا دۆخی ڕاستەقینەی زەین، پێویستی بە سەپاندنی زۆر، دیسپلین یان کۆنترۆڵ نییە، بە پێچەوانە جۆرێ وشیاری و چاودێری کردنی پاسیڤانەی دەبینرێت. ئەم دۆخە وشیارییە، کاتێ پێکد ێت کەهەم ئۆگری هەبێت و هەم نیەتی تێگەیشتن. فام و تێگەیشتنی بنەڕەتیانەی خۆ لەڕێگای زانست یان کۆکردنەوەی ئەزموون کە تەنیا بارهێنانی زەینە، بەدەست نایەت؛ تێگەیشتنی خۆ، لەحزە بە لەحزەیە.

ئەگەر ئێمە تەنیا زانیاری خۆمان کۆبکەینەوە، هەر ئەو زانیارییە دەبێتە هۆی زیاتر تێگەیشتن، لەبەرئەوە زانیاری کۆکراوە و ئەزموون، دەبێتە ناوەندێك کە هزرپشتی پێ دەبەستێ و بەیارمەتی ئەو، پێکدێت. دونیا لەگەڵ ئێمە و چالاکییەکانی ئێمە جیاوازی نییە، چونکە ئەوەی کە دەبێتە هۆی گرفتەکانی دونیا، هەرئەو شتەیە کە ئێمە هەین.گرفتی زۆربەی ئێمە ئەوەیە کە ئێمە خۆمان ڕاستەوخۆ ناناسین، بەڵکو دەگەڕێین بەدوای سیستەمێك، شێواز و ئامرازێکدا بۆ ئیشکردن کە بەیارمەتی ئەو، دەستبکەین بە چارەسەرکردنی گرفتە لە ژمار نەهاتووەکانی مرۆیی.



کەوابوو ئایا سیستەم یان ئامرازێك بۆ خۆتێگەیشتن هەیە؟ هەرمرۆڤێکی بە هۆش و هەر فەیلەسووفێك دەتوانێت سیستەم وشێوازێك داهێنێت. بەڵام بە دڵنیاییەوە پەیڕەوی کردن لەسیستەم تەنیا ئاکامێکی لێدەبێتەوە کە خولقاوی دەستی سیستەمە، مەگەروانییە؟ کاتێ من بۆ خۆناسین بەدوای سیستەمێك دەکەوم، بە ئاکامێك دەگەم کە ئەو سیستەمە بە پێویستی دەزانێت، نە ئاکامێك کە ببێتەهۆی خۆناسین، یانێ بە پەیڕەوی لە سیستەم یان شێوازێك، یان ئامرازێکی خۆناسین، من بە هزرو چالاکییەکانی خۆم لەڕووی سەرمەشقێك وێنەدەدەم. بەڵام پەیڕەوی و دواکەوتنی سەرمەشقێك، تێگەیشتن لە خۆ نییە.

کەوابوو، بۆ ناسینی خۆ شێوازێك نییە. گەڕان بە دوای شێوازێکدا بێ جیاوازی، ماناکەی ئەوەیەکە حەزدەکەین بە ئاکامێك بگەین و ئەمە هەر ئەوشتەیە کە گشتمان دەمانەوێت. ئەوجا دەکەوینەشوێن دەسەلات - ئەگەر ئەم دەسەڵاتە تایبەت بە کەسێ نەبێ، تایبەت بە ئیدولۆژی یان سیستەمێکە — لەبەر ئەوە ئێمە بەدوای ئاکامێکەوەین کە ڕازیمان بکات و هێمنایمان پێبدات. ئێمە بەڕاستی، لە هەوڵی خۆتێگەیشتن، ڕابردووی خۆمان، کاردانەوەکانمان و ئاڕاستەی بیرکردندماندا — چ هەستی وچ نەستی — نین، ئێمە پێمان چاکترە دوای سیستەمێك بکەوین کەئێمە لە ئەنجام دڵنیا بکات. بەڵام وەدواکەوتنی سیستەمێك بێ هیچ جیاوازییەك، ئاکامی حەزی ئێمە بە هێمنایی و دڵنیایی و ڕوونە کە ئاکامی ئەم کارە، ئەبێتە خۆناسی، کاتێ ئێمە دوای شێوازێك دەکەوین، دەبێت خاوەن دەسەڵاتێکمان هەبیت — ڕێبەر، ڕزگارکەر، مامۆستا، خاوەنڕا،---- کەگەیشتن بە ئارەزوومان گەرانتی بکات و گومانێك نییەکە ئەمە ڕێگەی گەیشتن بە خۆناسی نییە.

خاوەن دەسەڵات ڕێگرە لە تێگەیشتنی خۆ لە پەنای خاوەن دەسەڵات یان ڕێنیشاندەرێکدا، مرۆڤ لەوانەیە بە شێوەی کاتی هەست،بە هێمنایی وخۆشگوزەرانی بکات. بەڵام ئەمە ئاڕاستەیەکی بێ عەیبی خۆتێگەیشتن نییە. زاتی خاوەن دەسەڵات جۆرێکە کە ناهێڵێت ئێمە خۆتێگەیشتنێکی تەواومان هەبێت و بەم جۆرە، سەرەنجام ئازادی لەنێودەبات. لەحاڵێکدا داهێنان تەنیا لە ئازادی — دایە. داهێنان تەنیا لە ڕێگای خۆناسینەوە دێتەدی، زۆرێك لەئێمە داهێنەرنین. ئێمە ماشینی دووبارە کارین، دیسکە گرامافۆنییەکانین کە گۆڕانی ئەزموونە تایبەتییەکان، دەرەنجامەکان و بیرەوەری دیاریکراو — چ تایبەت بەخۆو چ تایبەت بەوانیتر--- بەردەوام دووبارە دەکەینەوە، بەماشینی

دووپاتکراوی بەم جۆرە ناکرێت بڵێت زاتی داهێنەر، بەڵام شتێکە کەئێمە دەمانەوێت، بۆئەوە دەمانەوێت لە دەروونەوە هێمنایی و ئاسایشمان هەبێت. بەردەوام لە بەدوادا چوونی شێوازو ئامرازێکداین بۆپێکهێنانی ئەم ئاسایشە، لەم ڕووەوە دەسەڵات دەخولقێنین کە بۆخۆی پرسیارێکی دیکەیە، شتێ کە دەبێتە هۆی لە نێوچوونی تێگەیشتن و هێمنایی خۆبە خۆی زەین، زەینێ کە لەوانەیە لەودا بە تەنیایی دۆخێکی داهێنەرانە هەبێت. بەدڵنیاییەوە گرفتی ئێمە ئەمەیە کە زۆرێك لە ئێمە ئەم هەستی داهێنانەمان لەدەستداوە. داهێنەربوون بەم مانانییەکە وێنەیەك بکێشین یان شیعرێ بڵێین و ببینە خاوەنی ناوبانگ. بەشتی وا نالێین داهێنان. ئەمە تەنیا توانای دەربڕینی ئیدەکەیە، ئیدەیێ کەخەڵك پێشوازی لێدەکەن یان بەرامبەری بێلایەن دەبن.

نابێت داهێنان و توانایی تێکەڵ کرێت. توانایی داهێنان نییە. داهێنان دۆخی هەبوونی بە تەواوی جیاوازە، دۆخێ کە لەودا خود شاراوەیە. لەودا زەین ئیدی شوێن سەرەنجی ئەزموونی ئێمە، فراوانخوازی، داخوازی و ئارەزووەکانی ئێمە نییە. داهێنان دۆخێکی بەردەوام و نەگۆڕنییە، لەهەرچرکەیەکدا تازەیە. ڕەوتێکە کەلەودا "من" و "هی من" بوونی نییە، لەودا بیر بەلای ئەزموون، فراوانخوازی، سەرکەوتن، نییەت، مەبەستێکی تایبەت نییە. داهێنان تەنیا کاتێکە کەمن لەودا بوونی نییە، دۆخێکی تایبەتە کە تەنیا ڕاستی خولقێنەری هەموو شتێکە لەودا هیچی تر. بەڵام ئەم دۆخە نەدەکرێت وێنای بکەیت و نەوێنەی بکێشیت. نە دەتوانی بە شێوەی فۆرمۆل دەریبێنیت و نەچاوی لێبکەیت. گەیشتن بەو لە ڕێگای هیچ سیستەم، فەلسەفە، ئیسمێکەوە ڕێی تێناچێت، بە پێچەوانە، گەیشتن پێی تەنیا لەڕێگای خۆتێگەیشتنی تەواوەوە مسۆگەرە و هیچی تر.

خۆتێگەیشتن، ئەنجامێك نییە، یە، بەلوتکە گەیشتن نییە، بوونی خۆتە چرکەبەچرکە لە ئاوێنەی پەیوەندیدا. پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ ماڵ، لەگەڵ خەڵك، لەگەڵ تەن و بیرۆکەکان. بەڵام وشیاری بۆ ئێمە دژوارە و ئێمە بەچاکی دەزانین کە زەینمان بە پەیڕەوی لە میتۆدێك، بە وەرگرتنی خاوەن دەسەڵاتەکان، شتی کۆن و درۆ و تیۆرییە ڕازی کەرەکان، تەمەڵ بکەینەوە. لەم ڕووەوە زەینمان ماندوو و بێ هەست و ڕزیو دەبێت. زەینێکی وا ناتوانێت لە دۆخی داهێناندا بێت. ئەم دۆخەی داهێنان تەنیاکاتێ پێکدێت کە " خود" ڕەوتی وێناکردن و دەورکردنەوە و کۆکردنەوەیە، نەبێت. چونکە لە هەرحاڵێکدا، هەست وەك "من" ناوەندی وێناکردنە و وێناکردنیش تەنیا ڕەوتێکی کۆکردنەوەی ئەزمونە. بەڵام هەموومان لەهیچ شتێ



بوون دەترسین، دەمانەوێت شتێك بین. کەسێ بچووك دەیەوێت کەسێکی گەورە بێت، بێدین دەیەوێت دیندار بێت، تاکی لاواز و هەژارلە ئارەزووی پلە و پایە و دەسەڵات دایە. ئەمە چالاکی بزۆزو ڕانەوەستاوی زەینە. زەینی واناتوانێت ئارام بێت کەوابوو هەرگیز ناتوانێت دۆخی داهێنان فام بکات.

بۆ ئەوەی کەدونیای دەوروبەرمان بەهەموو بێدەرەتانی، شەڕ، بێکاری، برسیەتی، دابەشکردنی چینایەتی و بە تەواوی شێواو بگۆڕین، دەبێت ئاڵوگۆڕ لە خودی ئێمەدا پێکبێت شۆڕش دەبێت لە خۆوە دەستپێبکات، ئەڵبەت نەبە پێی هیچ ئیدۆلۆژی یان باوەڕێك؛ لەبەر ئەوە شۆڕش لە سەربنەمای باوەڕ یان بۆسازان لەگەڵ نموونەی سەرمەشقێکی تایبەت بە ڕاشکاوی، بەهیچ جۆر شۆڕش ناژمێردرێت. بۆپێکهێنانی شۆڕشێکی بنچینەیی لەخۆدا، تاك دەبێت تەواو ئاڕاستەی بیرکردنەوە و هەستی خۆی لە پەیوەندیدا فام بکات. ئەمە تەنیا ڕێگە چارەی تەواو گرفتەکانی ئێمەیە، نەهەبوونی ستراتیجی، باوەڕ، ئیدۆلۆژو مامۆستایانی زۆر. هەرکات بتوانین خۆمان بەو جۆرەی کە چرکە بە چرکە هەین، بێ کەڵەکەکردنی شتە فێرکراوەکان، بناسین، ئەوکات دەزانن کە چۆن بە هێمناییەك کە بەرهەمی زەین نییە، هێمناییەك کە نەخەیاڵییە و نە پەروەردەیی، دەستمان ڕادەکات و تەنیا لەو دۆخە هێمنەدایە کە داهێنان بوونی مەیسەردەبێت.

# فەسڵی پێنجەم

## ئیدە (بیرۆکە)و پراکتیك

پێم خۆشە مەسەلەی پراکتیك بخەمە بەرباس. لەوانەیە بابەتەکە لەسەرەتادا زۆر دژوارو پێچاوپێچ بێتەبەرچاو، بەڵام هیوادارم بە بیرکردنەوە لەسەری، بتوانین بەڕوونی لە مەسەلەکە تێبگەین، لەبەر ئەوە تەواوی بوون و ژیانی ئێمە ڕەوتێکی پراکتیکە.

زۆرێك لە ئێمە بە کۆمەڵێك پراکتیکەوە دەژین، کۆمەڵێك پراکتیك کە بە ڕواڵەت پێکەوە پەیوەندییان نییە، پراکتیکی لەیەك بەربوو، پراکتیکێ کە دەبێتە هۆی شیبوونەوە و دڵساردی. ئەمە پرسێکە کە بیری یەك یەکی ئێمەی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە. لەبەر ئەوە ئێمە بەپراکتیك زیندوین و بێ پراکتیك ژیان و ئەزموون و بیرکردنەوە نییە. هزر پراکتیکە و کەوتنەشوێن پراکتیك لە ئاستێکی دیاریکراوی نەستدا، کە ئاستێکی دەرەوەیە، تەنیا لەبەرئەوە کە لە پراکتیکی دەرەوەییدا، بێتێگەیشتن لە تەواو ئاراستەی خودی پراکتیك، دیل ببین، بێ ئەم لاو ئەولا بە دڵ ساردی و بێدەرەتانی دەگات. ژیانی ئێمە کۆمەڵێکە لە پراکتیك یان ئاراستەیەکی پراکتیك لە ئاستە جۆراو جۆرەکانی هەستدا. هەست مژولی ئەزموون، ناونان و سفت و زفتە. بە واتایەکی تر، هەست کێشەیە و وەڵامدەرێکە کە خەریکی ئەزموونە و سەرەنجام ناو و کۆد لە ئەزموونەکانی دەنێت، هەرئەوشتەی کە ناوی بیرەوەرییە؛ ئەم ڕەوتەی پێیدەڵێن پراکتیك.

هەست پراکتیکە و بێململانێ، وەڵام، ئەزموون، ناو لێنان، کۆد دانان، بێ سفتو زفت کە بیرەوەرییە، پراکتیکێ بوونی نییە. هیچ پراکتیکێ خولقێنەری هۆکارێك نییە. بە واتایەکی دی، هۆکار کاتێ لە دایك دەبێت کە پراکتیك بە ئاکام دەگات و بەڕواڵەت تەواو دەبێت. ئەگەر پراکتیك لەگەڵ ئاکامدا نەبێت، ئیتر هۆکارێکی لەگەڵدا نییە. بەڵام ئەگەر ئەنجام یان ئامانجێکی تێدا بێت، ئەوا پراکتیك هۆکارێك دروستدەکات. لەم ڕووەوە هۆکار، پراکتیك و ئامانج یان ئاکامی ئاراستەیەکی یەکانگیرو یەکگرتووە و کاتێ بوون پەیدا دەکات کە ئەم کردەوە ئامانجێکی هەیە. پراکتیکی بەستراوە بە ئەنجامێك، ناوی ئیرادەیە، ئەگەروانەبێت، ئیرادەیەك بوونی نییە. ئارەزووی گەیشتن بە ئامانج دەبێتە هۆی ئیرادە کەهەمان هۆکارە.



دەمەوێت بەشتێ بگەم، دەمەوێت کتێبێ بنووسم، دەمەوێت دەوڵەمەند ببمەوە، دەمەوێت دیمەنێك بکێشم. ئێمە ئەم سێ فاکتۆرە: هۆکار، کردەوە و ئامانج دەناسین، ئەمە ژیانی ڕۆژانەی ئێمەیە. من هەنووکە بەباسکردنی ئەوەی کەهەیە مژوولم، بەڵام تەنیا کاتێ دەتوانین دەستبەکارئاڵوگۆڕی ئەوەی کە هەیە ببین کەبە ڕوونی و بەتەواوی توێژینەوەی لە سەربکەین، بە جۆرێکە لە توێژینەوەی ئێمەدا نەهەڵەی هەستیاری و نەدەمارگیری بێتە ناوەوە ئەم سێ فاکتۆرەی کە پێکهێنەری ئەزموونن — یانی هۆکار، کردەوە و ئاکام — بە دڵنیاییەوە ڕەوتێکی کران پێکد ێنێت. ئەی ئەگەر وانەبێت، شتێ بەناوی کران بوونی نابێت. ئەگەرهۆکارێك نەبێت و کردەوەیەك ڕووی بەرەو ئامانجێك نەبێت، کران نییە، بەڵام هەربەو جۆرەی کە دەزانن، ژیانی ڕۆژانەی ئێمە ڕەوتێکی کرانە. بۆ نموونە کاتێ من هەژارم،بەکردەوەیەك کە ئەنجامی دەدەم، ئامانجێکم لە زەیندایە، ئەویش دەوڵەمەندبوونەوەیە. من دزێوم و دەمەوێت جوان ببم، کەوابوو ژیانی ئێمە ئاڕاستەیەکە بەرەو شتی بوون. حەز بەبوون، حەزبەکرانە، حەزبە کران لە ئاستە جۆراو جۆرەکانی هەستدا، لە بارودۆخی جۆراو جۆردا، بارودۆخێ کەلەودا ململانێ، وەڵام، ناونان و سفت و زفت هەیە. کەواتە ئەم کرانە جۆرێ شەڕو دژایەتییە. ئەم کرانە، ئێش و ئازارە، قەبووڵتانە؟ ململانێیەکی بەردەوام: من ئەمەم و دەمەوێت ئەوەبم.

کەوابوو مەسەلە ئەمەیە، ئایا بێکران، کردەوەیەك نییە؟ ئایا بێ ئێش و ئازار، بێ ئەم خەباتە بەردەوامە کردەوەیەك نییە؟ ئەگەر ئامانجێ نەبێت، هۆکارێك نییە، لەبەر ئەوە پراکتیك بە هەبوونی ئامانجێك لەبەرەو ڕوویدا، پێکهێنەری هۆکارە. بەڵام ئایا بەبێ ئامانجێك لە پێشەوە و سەرەنجام بەبێ هۆکارێك — یانێ بێ حەزکردن لە ئاکامێك — کردەوەیەك دەبێت؟ ئیشێکی بەم جۆرە، کران نییە و بەدژایەتیش ناژمێردرێت. لە لایەکەوە دۆخی پراکتیك هەیە و لە لایەکی دیکەوە دۆخی ئەزموون، بەدەرلە ئەزموون و بکەری ئەزموون. مەسەلەکە تۆزێك فەلسەفی دەنوێنێت، بەڵام لە راستیدا زۆر سادەیە.

لە ساتەوەختی تەجروبە کردندا، ئێوە لە خۆتان وەك بکەری تەجروبە و جیالە ئەزموون، ئاگانین، ئێوە لە حاڵی تەجروبە کردندان. سەرنجی ئەم نموونە زۆر ئاسانە بدەن: ئێوە توورە ن، لەم کاتی تووڕەییەدا نەبکەرێکی تەجروبە هەیە و نە تە جرۆبەیەك؛ تەنیا تەجروبە کردن هەیە، بەڵام هەرکە لە دۆخی تووڕەیی دەربازبوون، هەم بکەری تەجروبە و هەم تەجروبە. یانێ هۆکارو پراکتیکێ کە ئامانجی لە ڕووبەڕووی دایە کە بریتییە لە ڕزگاربوون یان سەرکوتی

تورەیی. ئێمە پەیتا پەیتا دەکەوینە ناو ئەم دۆخەوە، ناودۆخی تەجروبە کردن. بەلاّم هەردەم لێی دێینەدەرەوە و کۆدێکی پێدەدەین و ناوی دەنێنین و سەفتی دەکەین و بەو جۆرە بە کران بەردەوامی دەدەین. ئەگەربتوانین مانای بنچینەیی وشەی پراکتیك تێبگەین، ئەوا ئەو تێگەیشتنە قوولّ و بنەڕەتییە کاردانەوەی لەسەر چالاکی ڕوالّەتی ئێمە دەبێت، بەلاّم دەبێت سەرەتا لە زاتی بنچینەیی پراکتیك تێبگەین، بزانین ئایا ئیدە پێکهێنەری پراکتیکە؟ ئایا سەرەتا ئیدە هەیە و دوایان پراکتیك؟ یان ئەمەی کە سەرەتا پراکتیك هەیە و سەرەنجام، لەبەر ئەوە پراکتیك دەبێتە هۆی دژیەتی، لە دەوریدا تێگەیشتنێك پێکدێت؟ ئایا پراکتیك پێکهێنەری هۆکارە یان هۆکار سەرەتا دێت؟

دۆزینەوەی ئەوەی کە کامیان یەکەم دێن، گرنگە ئەگەر ئیدە لە سەرەتا ڕابێت ئەوا پراکتیك لە گەلّ ئیدەدا هاوجێ دەبێت و سەرەنجام ئیتر ناوی پراکتیك نییە، بەلّکو لاسایی و چاولێکردنە و زۆرەکی و خورتی لەسەر بنەمای ئیدەیەك. تێگەیشتنی ئەم باسە زۆر گرنگە لەبەر ئەوە، بەسەرنجدان بەوەی کە کۆمەلّگای ئێمە زۆرتر لەسەر ئاستەکانی قسەکردن یان بیرکردنەوە دامەزراوە، ئەمە ئیدەیە کە سەرەتا بەرەولای هەمموومان دێت و پراکتیك بە دوای ئەودا. کەوابوو پراکتیك پەروەردەی دەستی ئیدەیە و بەڕاشکاوی پێکهاتەی ڕەوتی ئیدەکان، چارەونووسسازی پراکتیکن ئیدەکان پێکهێنەری ئیدەی زۆرترن و کاتێك مەسەلەکە تەنیا پێکهێنانی ئیدەیەکان بێت، دوژمنی دروستدەبێت و کۆمەلّگا دەڕواتە ژێرباری قورسی ئیدە پەروەری کە پێکهاتەی کۆمەلاّیەتی ئێمە زۆر ئەقلاّنییە، ئێمە بە نرخی لە دەستدانی تەواوی هۆکارەکانی دیکەی بوونی خۆمان، ئەقلّ پەروەردە دەکەین و لەم ڕووەوە بوونی ئیدەکان ئێمە تووشی خنکان دەکەن.

ئایا ئیدەکان دەتوانن پێکهێنەری پراکتیك بن یان ئەوەی کە ئیدەکان تەنیا هزرلە قالّب دەدەن و بەم جۆرە کردەوە بەرتەسك دەکەنەوە و کاتێ کردەوەیەکی بە زۆری ئیدەیەك جێبەجێ دەبێت، کردەوە هەرگیز ڕزگارکەری مرۆڤ نییە. تێگەیشتنی ئەم خالّە بۆ ئێمە بایەخێکی بێوێنەی هەیە. کاتێ ئیدەیەك پراکتیك دروستبکات. ئەوا پراکتیك هەرگیز ڕێگە چارەیەکی بۆ هەژار بێدەرەتانەکانی ئێمە نادۆزیتەوە. چونکە بەرلەوەی کە بڕواتە قۆناغی کردەوە دەبێت سەرەتا تێبگەین کە چۆن ئەو ئیدە پێکدێت.

توێژینەوە دەربارەی ئیدە و پەروەری و پێکهاتنی ئیدەکان، چ تایبەت بە سۆسیالیستەکان و چ تایبەت بە دەولّەمەندان، کۆمۆنیستەکان، یان مەزهەبی جۆراوجۆر بێت، گرنگی زۆری



هەیە بەتایبەت کاتێ کە کۆمەلّگای ئێمە لە سەرەولێژی ڕووخاندایە و خوازیاری بەلاّیەکی گەورەی دیکە و خوازیاری لەت لەت کردنێکی دیکەیە. ئەوانەی کە بەڕاستی لە نییەتی خۆیاندا بۆ دۆزینەوەی ڕێگە چارەی مرۆیی بۆ گرفتەکانی ئێمە جیددین، سەرەتا دەبێت لەم شێوازی ئیدە پەروەرییە ئاگاداربن.

ڕاستی مەبەستی ئێمە لە ئیدە چییە؟ چۆن ئیدەیەك پێکدێت؟ ئایا دەکرێت ئیدە و پراکتیك پێکەوە ئەنجامبدرێت؟ گریمان من ئیدەیەکم هەیە و دەمەوێت جێبە جێی بکەم. بە دوای شێوازێکدا دەڕۆم بۆ جێبە جێکردنی و لە کێشمە کێشی لەسەرچەندێتی و شێوازی جێبەجێکردنی ئەم ئیدەیەدا بە قوولّی بیردەکەمەوە و وزە و کات لەکیس دەدەم. لەم ڕووەوە دۆزینەوەی چۆنیەتی و شێوازی پێکهێنانی ئیدەکان زۆرگرنگی هەیە. دوای دۆزینەوەی ڕاستی ئەم باسە، ئەوکات دەتوانین دەستبکەین بە باسکردن دەربارەی گرفتی پراکتیك. بەبێ باسکردن دەربارەی ئیدەکان تەنیا تێگەیشتنی ئەم بابەتەی کە چۆن دەستبکەین بە پراکتیك، بێمانایە.

هەنووکە بزانین ئیدە چۆن دروستدەبێت، مەبەست ئیدەیەکی سادەیە، پێویست ناکات ئیدەییەکی فەلسەفی، مەزهەبی یان ئابووری بێت. ڕوونە کە شتێکی وا ئاڕاستەیەکی هزرییە، جیالەمەیە؟ ئیدە دەرەنجامی ڕەوتێکی فیکرییە و بەبێ ئاڕاستەیەکی هزری ئیدەیەك بوونی نابێت. کەواتە بەرلە تێگەیشتنی بەرهەمی ئاڕاستەی هزری کە ناوی ڕەوتە دەبێت خودی ئاڕاستەی ئیدە بناسین. مەبەستی ئێمە لە هزرچییە؟ کەی ئێمە بیردەکەینەوە؟ ئاشکرایە کە هزر ئەنجامی وەلاّمێکی — دەماری یان دەروونناسانە ---یە. هزر وەلاّمی دەستبەجێی هەستیارەکانە بە هەستێك یان پەیوەندی بە دەروونناسییەوە هەیە، یانێ وەلاّم دانەوەی بە بیرەوەری ئارایی. لەلایەکەوە دەستبەجێ دەماربە هەستێك کە بوونی هەیە و لەلایەکی ترەوە وەلاّمی دەروناسانەی بیرەوەریەك کە هەیە، کە بریتییە لە ڕخنەی ڕەگەز، گرووپ، ڕێبەر، بنەمالّە، نەریت و زۆرشتی لەم بابەتە، کە بە هەموو ئەمانە دەلّێن "فکر". کەواتە ڕەوتی بیرکردنەوە، وەلاّمە بە بیرەوەری، وانییە؟ ئەگەر بیرەوەری نەبێت، بیرکردنەوەش نییە و وەلاّمی بیرەوەری بە ئەزموونێك ڕەوتی فیکری پراکتیزە دەکات. بۆ نموونە گریمان من سەبارەت بە ناسیۆنالیزم یان ناوی هیندی لەسەرخۆدانان هەندێ بیرەوەریم لە زەیندا هەبێت. سەرچاوەی بیرەوەرییەکان، کردەوەکان، چەمکەکان، نەریتەکان و ڕەفتارەکانی ڕابردوو بە کیشەی موسولّمان بوون، بوودایی بوون، یان مەسیحی بوون وەلاّم دەداتەوە و وەلاّمی زەین بەم کێشەیە، بمانەوێت و نەمانەوێت ئاڕاستەیەکی هزری پێکدێنێت. ئەگەر چاودێری ئەم ئاراستە هزرییە بن کە لە دەروونی ئێوەدا ئیشدەکات، دەتوانن ڕاستی ئەم باسە بەشێوەی ڕاستەوخۆ تاقیبکەنەوە.

بۆ نموونە کەسێ بێ ڕێزییەکی بەرامبەر ئێوە کردووە و ئەمە لە یادی ئێوەدا دەمێنێتەوە و زەمینەیەکی فیکری دروستدەکات. کاتێ ئەو تاکە — کە جۆرێ لە کێشەیە --دەبینینەوە، وەلاّم، بیرەوەری ئەم بێ ڕێزییە. کەوابوو وەلاّمی بیرەوەری کە شێوازێکی بیرکردنەوەیە. ئیدەییەك دروستدەکات، کەوابوو ئەم ئیدەییە بەردەوام مەرجی بووەتەوە و تێگەیشتنی ئەم بابەتە زۆربایەخی هەیە. بە واتایەکی تر: ئیدە بەرهەمی بیرکردنەوەیە، بیرکردنەوە وەلاّمی بیرەوەرییە و بیرەوەری هەمیشە مەرجی بووەتەوە. بیرەوەری بەردەوام لە ڕابردوودایە و لە ڕێگای کێشەکانەوە لە زەمانی ڕانەبردوودا، گیانێکی تازە دەگرێت. بیرەوەری خۆی لە خۆیدا زیندونییە، کاتێك بەرەو ڕووی کیشە یەك دەبێتەوە، زیندوو دەبێتەوە و تەواوی بیرەوەریەکان چ ئەکتیڤ و چ پاسیڤ، مەرجی بوونەتەوە. کەواتە دەبێت شێوازێکی ڕووبەڕووبوونەوەی بە تەواوی جیاواز هەبێت. ئێمە دەبێت بۆخۆمان و بەشێوەیەکی دەروونی تێبگەین کە ئایا سەروکارمان لەگەڵ ئیدەیەکدایە یان نا؟ ئایا کردەوەیەك بەبێ ئیدە پەروەری ئیمکانی هەیە بێتە ئاراوە؟ وەرن بابزانین کە مەبەست لە کردەوەیەك لەسەر بناغەی ئیدە نییە، چییە.

کەی ئێمە بەبێ ئیدەپەروەری کردەوەیەك ئەنجامدەدەین؟ کام کردەوەیە کە ئاکامی ئەزموون نەبێت؟ هەروا کە گوتمان، پراکتیکی بێ ئەزموون شتێکی بەرتەسك کەرەوەیە، کەوابوو جۆرێ ڕێگرە. کردەوەیەك کە ئاکامی ئیدە نەبێت، خۆنەویستە، بەمەرجێك کە بیرکردنەوە بەستراوە بە ئەزموونی کونترۆل کاری کردەوە نەبێت. مانای ئەم قسەیە ئەوەیە کە هەرکات کۆنترۆڵی کردەوە لە دەست زەیندا نەبێت، کردەوە لە ئەزموون جیادەبێت. ئەمە تەنیا دۆخێکە کە تێیدا تێگەیشتن هەیە، کاتێ زەین لەسەر بناغەی ئەزموون؛ ڕێنیشاندەری کردەوە نەبێت، کاتێ فیکر، لەسەربناغەی ئەزموون،کردەوە ئەنجام نەدات.

ئەگەر ڕەوتی بیرکردنەوە نەبێت، کردەوە یان پراکتیك چییە؟ ئایا بەبێ ڕەوتی بیرکردنەوە، کردەوەیەك بوونی دەبێت؟ مەبەست ئەوەیە کە گریمان دەمانەوێت پردێك یان خانوویەك دروستبکەین. تەکنیکێ دەزانین و هەرئەم تەکنیکە شێوازو چۆنیەتی دروستکردنی خانوو و پردەکە بیردەخاتەوە. بەمە دەڵێین کردەوە یان پراکتیك. پراکتیکی دانانی شیعرێك، وێنە کێشان، بەرپرسایەتییەکانی دەوڵەتی، کۆمەلاّیەتی وەلاّمەکانی دەوروبەریش هەن. تەواوی ئەمانە لەسەر بناغەی ئیدە یان ئەزموونێکن کە پراکتیك دروستدەکەن. بەلاّم ئەگەر ئیدە پەروەری نەبێت ئایا پراکتیکی بوونی دەبێت؟

گومانێك نییە کە بە نەبوونی ئیدە، جۆرێ پراکتیك هەیە و تەنیا کاتێکە ئەشق نەبێت ئیدەیەك نابێت ئەشق بیرەوەری نییە، ئەشق ئەزموون نییە. ئەشق بیرکردنەوە لە بارەی کەسێکەوە



کە خۆشتان دەوێت نییە. لەبەرئەوە ئەوکات، ناوی دەبێت بە فیکر، کەسێ ناتوانێ لە بیری خۆشەویستیدا — بێت. تاك دەتوانێت لە بیرکەسێکدا بێت کە خۆشی دەوێت یان گیانی فیدایەتی، وەك ڕێبەری خۆی، وێنەی خۆی، هاوسەری خۆی. بەلاّم فیکر و هێما، ئەو ڕاستییەی کە ناوی خۆشەویستییە، نییە. کەوابوو خۆشەویستی تەجروبە نییە. کاتێ خۆشەویستی هەبێت، کردەوە هەیە، ئایا ئەم کردەوە، ڕزگارکەر نییە؟ ئەمە ئاکامی کاری زەینی نییە و نێوان خۆشەویستی و کردەوە وەك ئیدە و کردەوە مەودایەك نابینرێت. ئیدە هەمیشە کۆنەیە و سێبەرەکانی خۆی دەخاتە سەر ئێستا و ئێمە هەردەم لە حاڵی دروستکردنی پردی نێوان ئیدە و کردەوە داین. کاتێ خۆشەویستی هەیە — کە بەرهەمی کردەوەی زەین نییە، ئیدە پەروەری نییە، زەین نییە، ئەنجامی تەجروبە نییە و گیراو لە ستراتیجێکی مەشق کراو نییە — کەوابوو خودی خۆشەویستی، پراکتیکە. ئەم تەنیا شتە ڕزگاری بەخشە. تاکێکە کردەوەی زەینی هەیە، تاکاتێکە شێوەدان بە کردەوە بە یارمەتی ئیدەیەك کە ئەزموونە، هەیە؛ ڕزگاری مانایەکی نییە و تاکاتێك ئەم ڕەوتە درێژەی بێت، کردەوە بەرتەسکە. کاتێ ڕاستی ئەم بابەتە دەرکەوێت، (quality) چۆنیەتی خۆشەویستی، کە کردەوەی زەینی نییە و دەربارە یشی ناتوانی بیربکەیتەوە، لە دایك دەبێت. مرۆڤ دەبێت لەم ڕەوتە گشتییە، لە پێکهاتنی ئیدەکان، لە سەرچاوە گرتنی کردەوە لە ئیدەکان و چۆنیەتی کۆنترۆڵی کردەوە بە یارمەتی ئیدەکان، هەروەها بەرتەسك کردنەوەی لە ڕێگای هەستەوە، بە ئاگابێت. فەرقی ناکات کە ئەم ئیدانە هی چ کەسانێك بن، چ چەپ وچ ڕاستی توندڕەو. تاکاتێك ئێمە دەستە و داوێنی ئیدەکان بین، لە دۆخێکداین کە لەم دۆخەدا، تەجروبە کردن بە هیچ شێوەیەك بوونی نییە. کەوابوو ئێمە تەنیا لە گۆڕەپان ناوەندی زەماندا — لە ڕابردوودا، کەدەبێتە هۆی هەستی زیاتر یان لە داهاتوو کە جۆرێ تر لە ورووژاندنە — دەژین. تەنیا لەوکاتەدایە کە زەین لە دەست ئیدە ڕزگار دەبێت و ڕاستی تەجروبە دەکات.

ئیدەکان هە قیقەت نین، ڕاستی شتێکە کە دەبێت ڕاستەوخۆ،چرکە بە چرکە، تەجروبە کرێت. تەجروبەیەك نییە کە ئێمە بمانەوێت — کە ئەوکاتە، تەنیا ناوی ئۆگرییە. تەنیا هەستە. تەنیا کاتێك کە تاك بتوانێت بڕواتە ئەوپەڕی کۆمەڵەی ئیدەکانەوە — کەبریتییە لە (من) کەبریتییە لە زەین، کە خاوەنی بەردەوامییەکی هەندەکی یان تەواوە — تەنیا لەوکاتەدا کە تاك لە کۆمەڵەی ئیدەکان پێی ئەولاتربنێت، کاتێکە هزر بە تەواوی ئارام بێتەوە، ئەو دەمە دۆخی ئەزمون و تەجروبەکردن بوونی دەبێت؛ ئەو دەمە تاك ڕاستی دەدۆزێتەوە.

# فەسڵی شەشەم

## باوەڕ

باوەڕو زانست پەیوەندییەکی زۆر نزیکیان لەگەڵ ئارەزوودا هەیە، لەوانەیە، ئەگەربتوانین ئەم دوومەسەلەیە فام بکەین. بتوانین بە شێوازی پراکتیکی ئارەزوو پێچیاویەکانی تێبگەین.

بەڕای من، یەکێ لەوشتانەی کەئێمە بە ئۆگریەوە قبوولێدەکەین و گریمانەیەکی دڵنیامان لی هەیە، مەسەلەی باوەڕە. ئاگاداربن کە من هێرش ناکەمەسەرباوەڕەکان، ئەوەی کە ئێمە هەوڵ بۆجێبەجێکردنی دەدەین، تێگەیشتنی ئەم بابەتەیە کە بۆچی ئێمە باوەڕەکان قەبووڵ دەکەین؟ ئەگەربتوانین لە هۆکارو پاڵنەرەکانی قەبووڵکردن تێبگەین. ئەوا لەوانەیە بتوانین نەتەنیا لە هۆکاری تێبگەین، بەڵکو لە چنگیشی ڕزگار بین. هەرکەس دەتوانێت تێبگات کەچۆن باوەڕی سیاسی، مەزهەبی، نەتەوەیی و باوەڕەکانی تر بەڕاستی بوونەتە هۆی جیایی خەڵك، ناکۆکی، شێواوی و دوژمنی. شتێ کە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە؛ بەم حاڵە، ئێمە حازر بە لەدەستدانی نین — باوەڕی جۆراوجۆرهەمن:

باوەڕبە هیند، مەسیحییەت و بوودابیەت، هۆزی بێژمار، باوەڕی نەتەوەیی ئیدولۆژی جۆراوجۆر کە هەموو پێکەوە لە شەڕدان و هەرکامە دەیەوێت ئەویتر بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. دەکرێت بە ڕوونی بیبینین کە باوەڕ، خەڵك لێك جیادەکاتەوە و دەبێتە هۆی پێکەوە نەگونجان. ئایا دەکرێت بێ باوەڕ بژیت؟ تاك کاتێ دەتوانێت لەمە تێبگات کە خۆی لەگەڵ باوەڕێکدا خوێندبێتەوە. ئایا دەبێت لەم دونیا بەبێ باوەڕ بژیت؟ باوەڕ نەگۆڕێت؟ باوەڕێ نەنێتە جێی باوەڕێکی دیکە، بەڵکو بە تەواوی لە هەموو بڕوایەك ڕەها بێت؟ جۆرێ کە جوولانەوەی ئێمە لەگەڵ دونیا هەرچرکە لە سەرەتاوە دەستپێبکاتەوە؟ لە هەرحاڵدا ڕاستییەکەی ئەمەیە: توانای لە نوێ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کارەکاندا، چرکەبە چرکە، بێکاردانەوەی عادەت پێکراوی ڕابردوو، تا کاریگەریەکی کۆکراوە کە وەك کۆسپی نێوان تاك و "ئەوەی هەیە" ئیشدەکات، نەبێت ئەگەرسەرنج بدەین دەبینین کە یەکێك لە هۆکارەکانی ئارەزوو بۆ قەبووڵکردنی باوەڕێك، ترسە. ئەگەرباوەڕێکمان نەبێت، چی



بەسەرمان دێت؟ ئایا نابێت لەوشتەی کە لەوانەیە ڕووبدات، بە توندی بترسێین؟ ئەگەرئێمە نموونەیەکی پراکتیکی، لەسەر بناغەی باوەڕ — چ بەخواو چ بە کۆمۆنیزم، سۆسیالیزم، ئیمپریالیزم یان بە جۆرێ مەزهەب و جۆرێ دۆگم کە خوو و عادەتمان پێکردووە — نەبایت، دەبێت بە تەواوی خۆمان بە ون بوو دابنایەت، وانییە؟ ئایا قەبووڵی باوەڕێك، ڕووپۆشێك لەسەر ئەم ترسە نییە؟ ترس لە ڕاستیدا هیچ بوونێ خاڵی بوون؟ بەهەرحاڵ پیاڵە کاتێ سووددارە کە خاڵی بێت. زەینێ کە پڕلە باوەڕ، پڕلە دۆگم، بانگەشە و قسەی گوتراوە، تەنیا زەینێکی دوو بارەیە. بۆ هەڵاتن لە ترس- ترسی خاڵی بوون، ترس لە تەنیایی، ترس لە مەندبوون، ترس لە نەگەیشتن بەشتێ یان شوێنێ ترسی سەر نەکەوتن، ترسی شتێ نەبوون،ترسی شتێ نەکران — بە دڵنیاییەوە یەکێ لە هۆکارانە. بۆچی ئێمە بەم حەزو ئارەزووەوە باوەڕەکان قەبووڵدەکەین؟ ئایا بە قەبووڵی ئەم باوەڕانە، دەگەین بە خۆناسین؟ باوەڕ- چ مەزهەبی و چ سیاسی — بە ئاشکرا دەبێتە ڕێگری خۆناسینی ئێمە. وەك پەردەیەك دەمێنێتەوە کە ئێمە لە ناو باوەڕا بۆخۆمان بڕوانین. ئایا دەکرێت بێباوەڕ، بۆخۆت بڕوانیت؟

ئەگەر ئەم باوەڕانە، ئەم باوەڕە زۆرانە کە هەر کەس هەیەتی دوور بهاوێژین، ئایا شتێ دەمینێتەوە کە لێی بڕوانین؟ ئەگەر باوەڕێك نەبێت کە زەین لەگەڵیا خۆی یەکسان بکات، ئەوا زەین بێ یەکسانسازی دەتوانێت بۆخۆی بەو جۆرەی کەهەیە بڕوانێت و سەرەنجام بە دڵنیاییەوە، خۆناسی دەستپێدەکات.

مەسەلەی باوەڕ و زانست، بەڕاستی سەرنج ڕاکێشە و ڕۆڵێکی دەگمەن لە ژیانی ئێمەدا دەبینێت! چەندە باوەڕەکانی ئێمە زۆرن! گومانێك نییە هەرچەندە ڕووناکبیرتر، هەرچەندە خوێندەوارتر، هەرچەندە مەعنەویتر- ئەگەربکرێت ئەم وشە بەکاربێت — بین، توانای تێگەیشتنی ئێمە کەمترە. وەحشییەکان، تەنانەت لە دونیای مۆدێرندا ئەفسانەی زۆریان هەیە. هەرچەندە بیرەوەرتر و وشیارتربین، باوەڕ پێبوون کەمتر دەبێتەوە. لەبەرئەوە کە باوەڕ سنووردار و گۆشەگیر دەکات. دەبیبینین کە لە تەواوی دونیادا هەروایە، چ دونیای ئابووری و سیاسی و چ دونیای بەناو مەعنەوی. ئێوە باوەڕتان وایە کە خوا هەیە و لەوانەیە من باوەڕم بێت کە خواییە؛ یان ئێوە باوەڕتان هەیە کە دەوڵەت هەمووکەس و هەموو شتێ کۆنترۆڵ دەکات ومن بەکاری تاکیك و باقی کارەکان، ئێوە باوەڕتان هەیە کە تەنیا ڕزگارکەرێك هەیە و بەیارمەتی ئەو دەکرێت بە ئامانجی خۆبگەیت و من باوەڕێکی وام نییە. ئەو کات ئێوە بە باوەڕی خۆتان و

من بەباوەڕی خۆمەوە دەست بە ئیدعاکردن دەکەین. بەم شێوە هەردووکمان لە ئەشق و ئاسایش و یەکیەتی مرۆیی و ژیانێك — کەلەسەدا سەد بێمانایە، لەبەر ئەوە خودی ئەم باوەڕە ڕەوتی جیاکەرەوەیە — قسە دەکەین. ئێوە برهمنن و من نابرهمم. ئێوە مەسیحین و من موسوڵمان و..... و...... ئێوەلە برایەتی قسەدەکەن و منیش لە هەمان برایەتی، هەمان ئەشق و هەمان ئاسایش، بەلاّم لە کردەوەدا، ئێمە لەیەك جیاین و خۆمان لەیەك جیادەکەینەوە. کەسێك ئاسایشی دەوێت و دەیەوێت دونیایەکی نوێ و بەختەوەر دروستبکات، بێگومان ناتوانێت خۆی بە جۆرێ باوەڕەوە گۆشەگیربکات. ئایا بابەتەکە ڕوونە؟ لەوانەیە بەشێوەی زارەکی بێت، بەلاّم ئەگەرگرنگی و بایەخ وڕاستییەکەی ببینین، بەرەبەرە دەچینە قۆناغی کردەوەوە.

دەیبینین لە شوێنێکدا کە ڕەوتی ئارەزووهەیە، دەبێت ڕەوتی تەریك خستنەوە لە ڕێگای باوەڕیشەوە هەبێت، لەبەر ئەوە ڕوونە کە هۆکاری باوەڕپێبوونی ئێوە ئەوەیە کە دەتانەوێت لە ڕووی ئابووری و مەعنەوی، هەروەها دەروونییەوە لە ئاسایشدابن. من قسە لە کەسانێك ناکەم کەباوەڕیان بەلایەنی ئابوورییە، لەبەر ئەوە ئەوانیان بە جۆرێ پەروەردەکردەووە کە بەستراوە بە پیشەیانەوە بن و لەم ڕوووەوە تاکاتێك پیشەکەیان هەیە - کاسولیك یان هیند و بویان جیاوازی نییە — هەن.

هەروەها باسی ئێمە لەسەر کەسانێك نییە کە لەبەر ئاسایش دەستەوداوێنی باوەڕێك دەبن. لەوانەیە زۆرێك لە ئێمەش وابین.لەبەرئاسوودەیی، بەشتە دیاریکراوەکان باوەڕپەیدا دەکەین. دەبێت ئەم هۆکارە ئابوورییانە بخرێنە لاوە و زیاتر بیری لێبکرێتەوە. کەسانێك لەبەر چاو بگرن کە بەتوندی بەشتێکی ئابووری، کۆمەلاّیەتی یان مەعنەوی باوەڕیان هەبێت. ڕەوتێك کە لە پشت پەردەی باوەڕەوەیە، داواکاری دەروونی هەبوونی ئاسایشەوە حەزلەوەی کە درێژە بەم ڕەوتە بدات. ئێمە لێرەدا سەبارەت بەوەی کە شتێکی وا درێژەی هەبێت یان نا، قسەناکەین. باسی ئێمە تەنیا دەربارەی پێویستی و هۆکاری درێژە و بەردەوامی باوەڕپێبوونە. کەسێکی ئاشتیخواز، کەسێ کە بەڕاستی تەواو ئاڕاستەکانی بوونی مرۆیی تێدەگات ناکرێت بە باوەڕێکەوە سنوورداری بکەین. ئەو دەبینێت کە حەزو مەیلی وەك ئامرازێك بۆ هەبوونی ئاسایش لە گەڕدایە. تکایە ئەودیوی مەسەلەکە سەیرمەکەن مەڵێن کە من دەمەوێت پڕوپاگەندەی بێ دینی بکەم. باسی من بەهیچ جۆرێ ئەمە نییە. باسی من ئەوەیە تا کاتێك ئێمە نەتوانین ڕەوتی ئارەزوو بەشێوەی باوەڕ فام بکەین، شەڕو دژایەتی



بوونی دەبێت؛ بوونی دژیەتی بێئەملاولایە؛ خەم هەیە و مرۆڤ دژی مرۆڤە، شتێ کە هەر ڕۆژە دەیبینین. کەوابوو، ئەگەرخاوەن تێگەیشتنی هەستیاری بم و بزانم کە ئەم ڕەوتە دەبێت بە باوەڕ و شتێ جگەلە دەربڕینی ئارەزوویەك بۆ ئاسایشی دەروونی نییە، ئەوا گرفتی من هەبوونی باوەڕ بەم یان بەو نابێت؛ بەڵکو گرفتی من ئەوەیە کە چۆن خۆم لە چنگ حەز بە ئاسایش ڕزگاربکەم. ئایا زەین دەتوانێت لە هەبوونی حەز و مەیل بە ئاسایش قوتاربێت؟گرفت ئەمەیە، نە ئەوەی کە بەچی باوەڕتبێت و چەندە باوەڕت بێت. باوەڕ تەنیا دەربڕینی حەزی دەروونییە بۆئاسایشی دەروونزانی، بۆدڵنیابوون لە شتێ کە هەمووشتێ بەو جۆرەی لەبێ ئاسایشیدایە. ئایا زەینی وشیاری کەسێتییەك دەتوانێت لە ئارەزووی ئاسایش قوتاربێت؟ ئێمە دەمانەوێت ئاسایشمان هەبێت، لەم ڕووەوە بەیارمەتی دارایی و موڵکو بنەماڵەمان پێویستیمان هەیە. دەمانەوێت بە دروستکردنی دیوارەکانی باوەڕ کە نیشانەیەك لەم ئارەزووەوە حەزە بە ئاسایشن. لەڕووی دەروونی و مەعنەوییەوە ئاسایش بەدەست بێنین. ئایا ئێوە وەك تاکێك دەتوانن لەم حەزو ئارەزووە بە ئاسایش کە خۆی لە حەزی باوەڕبە شتێکدا نیشاندەدات. قوتاربکەن؟ ئەگەرئێمە لە داوی هەموو ئەمانە ڕزگارنەبین، دەبینە سەرچاوەیەك لە شەڕودژایەتی. لایەنگری ئاشتی نابین و لە دڵماندا تروسکاییەك لە ئەشق بەدی ناکرێت. باوەڕ، ڕووخێنەرە و ئەمە لە ژیانی ڕۆژانەماندا دەیبینین. ئایا من دەتوانم خۆم ببینم کاتێ لە ڕەوتی ئارەزوودا کە خۆی لە هەڵواسین بەباوەڕێکدا نیشاندەدات. گرفتارهاتووم؟ ئایا زەین دەتوانێت خۆی لە دوای باوەڕ دوور بخاتەوە و جێنشێنێکی بۆ نەدۆزرێتەوەو بە تەواوی خۆی لە چنگی ڕزگاربکات.؟ وەلاّمی ئەم پرسیارە بەشێوەی زارەکی " بەڵێ " یان " نا " ڕێیتێناچێت. بەلاّم کاتێ بێئەملاولا دەدەنەوە کە نیەت و بڕیاری ئێوە ڕزگاری لە باوەڕبێت. ئەوجا لە ڕووی ناچارییەوە دەگەنە خاڵێك کە دەگەڕێن بە دوای ئاوازێکدا بۆ خۆڕزگارکردن لە حەزی ئاسایش خوازی.

ئەڵبەت بە پێچەوانەی حەز و باوەڕی ئێوە هیچ جۆرە ئاسایشێکی دەروونی بەردەوام نییە. ئێوە حەزدەکەن باوەڕتان بە خوایەك هەبێت کە زۆر بە وردی چاودێری کاری ورد و بێبایەخی ئێوەبێت؛ بە ئێوە بڵێت چ کەسێ بن چ کارێك ئەنجامبدەن و چۆن ئەنجامیبدەن. ئەمە بیرێکی منالاّنە و پوختە نییە. ئێوە هەستدەکەن کە باپیرە (خواوەند)، چاودێری یەك بەیەك مانە و ئەمە تەنیا دەربڕینی ئۆگری خودی خۆتانە، بێگومان ڕاست نییە. ڕاستی دەبێت شتێکی بەتەواوی جیاواز لەگەڵ ئەمەبێت.

گرفتی دواتری ئێمە، گرفتی زانستە، ئایا زانست بۆ تێگەیشتنی ڕاستی پێویستە؟ کاتێ من دەڵێم: ((من دە زانم)) ماناکەی ئەوەیە کەزانست بوونی هەیە. ئایا زەینێکی وا توانای توێژینەوە و بەدوادا گەڕانی دەربارەی ڕاستی هەیە؟ لەمە گەڕێتەوە، ئێمە چ شتێ دەزانین، لەڕاستیدا لە چ شتێکەوە ئەوەندە لە خۆباین؟ زورچاك، خاوەنی زانستین و پڕلە زانیاری و ئەزموون لە سەر بناغەی مەرجی بوونەوە، لەسەربناغەی بیرەوەریەکان و توانایەکانمان. کاتێ دەڵێین : ((دەزانین)) مەبەستمان چییە؟ خەبەردانی ئێوە لە زانینی خۆتان یان لەبەر وێناکردنی ڕاستییەك یان زانیارییەك یان لەبەر ئەزموونێکە پێشتر هەتان بووە. کۆکردنەوەی بەردەوامی زانیاری، بەدەستهێنانی شێوە جۆراوجۆرەکانی زانست، هەموو بە دروستکردنی ئەم ئیدیعایە کە: ((من دەزانم)) یارمەتی دەدەن و ئێوە ئیشی وەرگێڕانی ئەو شتەی کە خوێندووتانە، لەسەر بناغەی زەمینەیەك کە هەتانە و لەسەر بناغەی ئارەزوو و ئەزموونی خۆ، دەست پێدەکەن و زانستی ئێوە شتێکە کە لەودا، ڕەوتێکی وەك ڕەوتی ئارەزوو لە گەڕدایە. ((من دەتوانم من تەجروبەم کردووە. شتێ نییە کە بکرێت بیخەیتە درۆوە، ئەزموونی من دەڵێت کە زۆر باوەڕم پێی هەیە)) قسەی بەم جۆرە نیشانەی زانستی وایە. بەڵام کاتێ بچینە ئەودیوەوە، ڕاڤەی بکەن، بە وردییەکی زۆرەوە لێیبڕوانن، تێدەگەن کە خودی ئیدعای ((من دەتوانم)) دیوارێکی ترکە لە نێوان من و ئێوەدا دادەنرێت. ئێوە پەنا دەبەنە پشتی ئەو دیوارەو دەگەرێن بە دوای ئاسایش و ئەمنییەتدا. کەوابوو، هەرچەندە زەین زانستی زیاتری تێدابێت، توانای فامکردنی کەمترە.

نازانم ئێوە هیچ کاتێك بیرتان لە پرسی بە دەستهێنانی زانست کردۆتەوە یان نا؟ ئایا سەرەنجام زانست یارمەتی ئێمە دەدات تالە چنگ سیفاتێ کە لە ئێمە و دراوسێکانماندا ناکۆکی سازدەکەن. ڕزگاربین؟ ئایا زانست توانای ئەوەی هەیە کە زەین لە زیندانی فراوانخوازی ڕزگاربکات؟ بە هەرحاڵ، فراوانخوازی یەکێ لە چۆنایەتییەکانە کە پەیوەندی لە نێو دەبات و مرۆڤ دەکات بەگژ مرۆڤدا. ئەگەر بمانەوێت پێکەوە لە ئاسایشدا ژیان بکەین، دەبێت بێ سێ و دوو کۆتایی بە فراوانخوازی بێنین — نە تەنیا فراوانخوازی سیاسی، ئابووری و جڤاکی، بەڵکو بەفراوانخوازی سەیروسەمەرە و لەناو بەرتر، وەك فراوانخوازی مەعنەوی — یانێ شتێبوون. ئایا بۆ زەین لە بنەڕەتدا دەرفەتێکی وا هەیە کەلە چنگ ڕەوتی کۆکردنەوەی زانست ڕزگاربێت؟

دیتنی دەورێکی لە ڕادەبەدەر بەهێز کە زانست و باوەڕ لە ژیانی ئێمەدا هەیانە، زۆر سەرنج ڕاکێشە. بزانن کەچۆن کەسانێك کە خاوەنی زانست و لەبەرتری زیاترن، دەپەرستین! ئایا



مانای ئەم کارە دەزانن؟ ئەگەر دەتانەوێت شتێکی نوێ بدۆزنەوە، شتێ تەجروبە بکەن کە دەربڕی هەستی ئێوە نەبێت، زەینی ئێوە دەبێت سەربەست بێت و بتوانێت شتێکی نوێ ببینێت. بە داخەوە هەرکات شتێکی تازە دەبینن، تەواو زانستێکە پێشتردەتان زانی، دێننەوە ناو، تەواو زانست و بیرەوەرییەکانی ڕابردووی خۆ و ڕوونەکە توانای ڕوانین و قەبوولکردنی شتی تازەیش، شتێ کەلەڕابردوودا نییە، لە دەستی دەدەن. تکا دەکەم ئەم قسە بە وردکراوەیی وەرمەگێڕن. ئەگەر من نەزانم چۆن بێمەوە بۆماڵ، ون دەبم، ئەگەرنەزانم کە چۆن ماشینێك بجوڵێنم، قازانجێکی ئەوتۆم نییە. ئەمە شتێکی بە تەواوی جیاوازە. لێرەدا لەم بارەوە قسەناکەین. ئێمە سەبارەت بەزانست، زانست وەك ئامرازێك بۆ ئاسایش و ئارەزووی دەروونی و دەروون ناسینی شتێ دەکرێت، قسەدەکەین. ئێوە لە ڕێگای زانستەوە چ شتێ بە دەست دێنن؟ دەسەڵاتی زانست، هێزی زانست،هەستی ئاسوودەیی، متمانە، هەستی خۆشحالی وچ شتێ کەنا. مرۆڤ کە دەڵێت: " دەزانم "، " هەیە " یان " نییە " بە دڵنیاییەوە لە بیرکردنەوە دوورکەوتۆتەوە، بێگومان دەستی لە شوێن گرتنی هەموو ڕەوندێکی ئارەزوو کێشاوە.

کەوابوو گرفتی ئێمە، بەو جۆرەی کەمن دەیبینم، زیندانی بوونی ئێمەیە کە زانست و باوەڕ ئەوەی سەختتر کردۆتەوە: ئایا بۆزەین ئەم دەرفەتە هەیە کەلە دوێنێ و لەم باوەڕەی کە لەڕێگای پڕۆسەی دوێنێ بەدەسی هێناوە ڕزگاربێت؟ ئایا پرسیارەکە تێدەگەن؟ ئایا بۆمن وەك تاکێك ئەم دەرفەتە هەیە کەلەم کۆمەڵگایە ژیان بکەم؛ بەڵام هاوکات لە کۆت و داوی ئەو باوەڕانەی کەلەگەڵیان گەورە بووم، سەربەست بم؟ ئایا بۆزەین ڕزگاری لە دەست ئەم هەموو زانست و دەسەڵاتە هەیە؟ کتێبی ئاسمانی جۆراوجۆر، کتێبی مەزهەبی زۆر دەخوێنیینەوە. لەم کتێبانەدا دەربارەی ئەوەی کە چیبکەین و چینەکەین. چۆن بە ئامانج بگەین، ئامانج چییە و پەروەردگارکێیە؟ بە شێوەیەکی وردباسکراوە. هەمووتان ئەمانە دەزانن و بەدوای کەوتوون. ئەمە زانستی ئێوەیە، ئەمە ئەوشتەیە کە ئێوە خوێندووتانە. ئەمە ئەو شتەیە کە ئێوە فێری بوون و لەوڕێگایەدا ڕێدەبڕن. ڕوونە کە هەرشتێ بگەڕێین بەدوایدا وبڕۆین بە دوایدا، گیردەهێنن؛ بەڵام ئایا ڕاستی ئەوەیە؟ ئایا ئەمە ڕەنگدانەوەی خودی زانستی ئێوە نییە؟ ڕاستی ئەمە نییە، بەڵام ئایا فامکردن و تێگەیشتنی ئەو هەنووکە — نە سبەی، بەڵکو هەرئێستا — مسۆگەرەو دەکرێت بڵێین: ((من ڕاستی مەسەلەکە تێدەگەم)) سەرئەنجام ئیترلەو بارەیەوە قسە نەکەین، بە جۆرێ کە ئەم شێوازەی پەروەردەکردنەی خەیاڵ و وێنەی زەینەی ئێوە ئیفلیج نەکات؟

ئایا زەین دەتوانێت لە چنگی باوەڕ ڕزگاربێت؟ کاتی ئەم ئیشە جێبەجێ دەبێت کەئێوە جەوهەر و زاتی دەروونی هۆکارێك کە بووەتە هۆی ڕوونانی ئێوە لە باوەڕێك، فام بکەن. هەڵبەتە ئەم هۆکارو پاڵنەرانە تەنیا خۆویست نین، بەڵکو ئەوپاڵنەرە خۆنەویستانەش کەئێوە ناچاردەکات باوەڕێکتان هەبێت، دەستیان تێدا هەیە. کەواتە ئێمە تەنیا بوونێکی ڕواڵەتی نین کە کارکردنمان تەنیا لە ئاستی خۆویستدا بێت. ئەگەردەرفەت بدەین بە بەشی خۆنەویستی زەین، دەتوانین بە قووڵی لە چالاکییەکانی بەشی هەست و نەستی زەین تێبگەین، لەبەر ئەوە بەشی خۆنەویستی زەین لە وەڵامدانەوەدا لەبەشی خۆویست خێراترە. هەرلەوکاتەدا بەشی خۆویستی زەین بە ئارامی خەریکی بیرکردنەوە گوێدان و سەیرکردنە، بەشی خۆنەویست بەڕادەیەك چالاکتر و وشیارتر و گیرا ترە. کەوابوو دەتوانێت وەڵامێکی هەبێت. ئایا زەینێك کەبە توندوتیژی، ترس زۆر ناچار بە وەرگرتنی باوەڕ بووە. دەتوانێت بۆ بیرکردنەوە سەربەست بێت؟ ئایا زەینێکی وا دەتوانێت لەسەرەوە دەستبکاتەوە بە ڕوانین و ڕەوتی گۆشەگیری لە نێوان ئێوە و ئەویتردا لە نێوببات؟ تکایە مەڵێن کە باوەڕ خەڵك لە دەوری یەکتر کۆدەکاتەوە، شتی وانییە. ئەمە شتێکی ڕوونە. هیچ بیرێکی ئۆرگانیزە کراو تا ئێستا ئەم کارەی نەکردووە.

بڕوانن بۆخۆتان لە وڵاتی خۆدا، هەموو ئێوە خاوەنی باوەڕن، بەڵام ئایا هەموو بەیەکەوەن؟ ئایا هەموو یەکگرتوون؟ خۆتان دەزانن کە وانییە. ئێوە بە چەندین حیزب و چین و توێژی ورد و درشتی جیالەیەك دابەش بوون. ئێوە لەم دابەشکردنە زۆرە ئاگادارن. ئەم ڕەوتە ڕاست لە هەموو دنیا هەروایە — ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای نییە - مەسیحیان، مەسیحیان لە نێو دەبەن، یەکتر لەبەرگرفتی زۆر ورد و بێ بایەخ دەکوژن، خەڵك لە ئۆردوگای دیلاندا ڕادەگرن و کاروباری لەم جۆرە. کەواتە، باوەڕخەڵك پێکەوە یەکگرتوو ناکات، ئەمە لە ڕادەبەدەر ڕوونە. کەوابوو ئەگەر مەسەلەکە ڕوونە و ڕاستی هەیە ئەگەر دەیبینن، ئیتر دەبێت سەرنجی پێبدرێت. بەڵام گرفت ئەوەیە کە زۆربەی ئێمە نایبینین، لەبەر ئەوە توانای ڕووبەڕووبونەوەیان لەگەڵ ئەو ئاسایشی دەروونی و لە دەروونەوە هەست بە تەنیا کردنە نییە. ئێمە شتێکمان دەوێت کە پاڵپێوەبدەین، چ وڵات یان عەشیرە، ناسیۆنالیزم، متافیزیا، ڕزگارکەر یان هەر شتێکی تر. کاتێ کە ئێمە ناڕاستبوونی هەموو ئەم کارانە دەبینین. ئەوجا زەین بە دیتنی ڕاستییەکەی توانا دەبێت، هەڵبەت لەوانەیە ئەم توانایە کاتێ یان چرکەیێ بێت. بەڵام دیتنی کاتێ بەشی دەکات، ئەگەر ئێمە بتوانین ئەوە بۆماوەی چرکەیەك و خێرا ببینین، بەسە. چونکە لەوکاتەدا دەیبینین کە ڕووداوێکی بێوێنە ڕوودەدات. بەشی نەست دەست بەکار دەبێت، ئەگەرچی



لەوانەیە بەشی هەست قەبوولی نەکات. ئەو ساتە وەختەی کە مەبەستمانە، ساتەوەختێکی بەردەوام نییە؛ بەڵام ئەو چرکەیە تەنیا شتە و تەنانەت بە پێچەوانەی تێکۆشانی بەشی هەستی زەین دژی ئەو، ئەنجامی تایبەت بە خۆی دەبێت.

کەوابوو، پرسیاری ئێمە ئەمەیە: ((ئایا ڕزگاری زەین لە چنگ زانست و باوەڕ مسۆگەرە؟ ئایا زەین لە زانست و باوەڕ پێکنەهاتووە؟ ئایا پێکهاتەی زەین، زانست وباوەڕنییە؟ زانست و باوەڕ، شێوازی وێناکردن و کاکڵەی ناوەندی زەینن. ئەم ڕەوتە بەشی هۆشیاری، هەروەها نا هۆشیاریش لە خۆ دەگرێت.ئایا زەین دەتوانێت لە پێکهاتەی خۆی رزگار بێت؟ئایا زەین دەتوانێ کۆتایی بە بوونی خۆی بێنێت؟گرفتی ئیمە ئەمەیە.بەو جۆرەی کە دەزانین لە پشتی زەینەوە، باوەڕ، ئارەزوو، حەز بە ئاسایشکردن،زانست و کۆ کردنەوەی دەسەلات، شاراوەیە.ئەگەر مرۆڤ بە هەموو پوختەیی و دەسەلاتییەوە تەنیا بۆ یەك دەقە لەبیرکردنەوە بۆ خۆی دەست هەڵگرێت ئاشتییەك لە دونیا نابێت.

ئەگەرچی ئێوە دەربارەی ئاشتی قسە بکەن، حیزبی سیاسی پێکبێنن، لەسەربانیماڵە کانەوە هاواربکەن، بەڵام گەیشتن بە ئاشتی ڕێی تێناچێت. لەبەر ئەوە لەم زەینەدا هەمان زەمینەی تایبەت کە دەبێتە هۆی پارادۆکس، گۆشەگیری وجیایی، هەیە. کەسێ کە ئاشتی خوازە، کەسێ کە دۆست و نزیکە، ناتوانێت خۆی گۆشەگیربکات و هاوکات لە برایەتی و ئاشتی قسە بکات. شتی وا تەنیا بارێکی سیاسی یان مەزهەبییە، جۆرە هەستێکی سەرکەوتن وفراوانخوازییە. ئەوکەسەی کەلەم بارەوە بەڕاستی دۆستی و نزیکایەتی هەیە.ئەو کەسەی کە حەزی لە —مکاشفە--- یە، دەبیت بەرەو ڕووی مەسەلەی زانست و باوەڕ ڕاوەستێت، دەبێت لە پشتیەوە ڕاوەستێت تا گشت ئەو ئارەزووانەی کە تێیدا ڕۆڵیان هەیە، یانێ ئارەزووی ئاسایش و دڵنیایی بدۆزێتەوە.

زەینێ کە لە دۆخێکدایە کە لەودا مەسەلەی نوێ ڕوودەدات — چ هە قیقەت بێت یان زاتی خوا، یان هەرشتی تر- بە دڵنیاییەوە دەبێت لە ڕاڤە و کۆکردنەوە دەست هەڵگرێت و هەموو زانیارییەکانی خۆی بهاوێژێتە لایەك. زەینێکە لە زانست پڕە، بێگومان ناتوانێت ئەوەی کە ڕاستییە، بێ هیچ بەربەست و ڕێگرێك فام بکات.

# فەسڵی حەوتەم

## کۆشش

بۆ زۆربەی ئێمە، تەواوی ژیان لەسەربناغەی کۆشش، جۆرێ وزەی ئیرادە و بڕیار دامەزراوە. بۆئێمە هەستکردنی هیچ کردەوەیەك بێ هێزی ئیرادە و بڕیار و بێ کۆشش مسۆگەرنییە، ژیانی ئێمە لەسەر ئەوەیە، ژیانی کۆمەڵایەتی، ئابووری و بەناوەمەعنەوی ئێمە کۆمەڵەیەکە لە تێکۆشان و باشترین ئاستی، هەمیشە بە ئەنجامێك کۆتایی دێت و ئێمە خەیاڵ دەکەین کە کۆشش پێویستە.

بۆچی تێدەکۆشین؟ ئایا بە زمانی سادە بۆگەیشتن بە ئاکامێك بۆشتێ بوون، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێك نییە؟ ئێمە وابیردەکەینەوە کە ئەگەر تێنەکۆشین، مەند دەبین. دەربارەی ئامانجێك کە بەرەولای بەردەوام تێدەکۆشین بۆچوونێکمان هەیە و ئەم تێکۆشانە، دەبێتە بەشێك لە ژیانی ئیمە، ئەگەر بمانەوێت خۆمان بگۆڕین، ئەگەر بمانەوێت گۆڕانێکی بنچینەیی لە خۆدا پێکبێنین، بۆ لە ناوبردنی خوو عادەتی کۆن، بۆ بەرەو ڕووبوونەوە لەگەڵ کاریگەریە بەردەوامەکانی شوێن ودەوروبەر و شتێ لەم جۆرە، کۆششێکی لە ڕادەبەدەر دەکەین، کەوابوو بۆ گەیشتن یان دۆزینەوەی شتێك و تەنانەت بۆخودی ژیان، بەم کۆمەڵە تێکۆشانە خۆمان گرتووە.

ئایا تەواوی ئەم کۆششانە چالاکی ((خود)) نییە؟ ئایا کۆشش چالاکییەکی خود تەوەر نییە؟ ئەو کۆششێ کە دەیکەین لە ناوەوەی ((خود)) بێت لە ڕووی ناچارییەوە دەبێت ململانێی زیاتر، شێواوی زیاترو هەژاری زیاتر پێکبێنێت. کەسانێکی کەم شارەزای ئەم مەسەلەیە کە چالاکی خود تەوەری کۆشش هیچ کام لە گرفتەکانی ئێمە دەستنیشان ناکات. بە پێچەوانە شێواوی، هەژاری و خەم و کەسەری ئێمە زیاتر دەکات. ئێمە ئەوە دەزانین و سەرەڕای ئەوەش هێشتا هیوادارین کەبە جۆرێ لەم چالاکی خود تەوەری کۆششدا کە کردەوەی ئیرادەیە، ڕخنە بکەین.

ئەگەر دەمانزانی مانای کۆشش کردن چییە، هەست دەکەم لە گرنگی ژیانیش تێدەگەیشتین. ئایا دەکرێت بەختەوەری بە کۆشش بە دەست بێنین. ئایا هەرگیز بۆ بە



بەختەوەریبوون تێکۆشاون؟ وێناچێت، وانییە؟ بۆ گەیشتن بە بەختەوەری لە کۆشش درێخ ناکەن، بەڵام ئاسارێك لە خۆشبەختی نییە، جیالەمە؟ لەزەت لە ڕێگای سەرکوت، لە ڕێگای کۆنترۆڵ یان لە ڕێگای خۆدان بەدەست هەوەس و ئارەزووەکانەوە بەدەست نایەت. لەوانەیە خۆتان بدەن بەدەست هەوەسەکانەوە، بەڵام دوا ئەنجامێکی تاڵ دروستبێت. لەوانەیە سەرکوت و کۆنترۆڵ بکەن، بەڵام لە کۆتاییدا شەڕو دژایەتی لە بۆسەدایە. کەوابوو، بەختەوری لە ڕێگای کۆشش و لەزەت لەڕێگای کۆنترۆڵ وسەرکوتەوە بە دەست نایەت؛ سەرەڕای ئەوەی کە هەموو ژیانی ئێمە کۆمەڵێکە لە سەرکوت، کۆنترۆڵ و خۆدان بەدەست هەستەکانەوە، هەروەها سەرکەوتنی بەردەوام و ململانێی بەردەوام لەگەڵ هەوەس، تەماح و گەمژەیەکانمان، کەوابوو، ئایا کۆششی ئێمە بە هیوای بە گیرهێنانی بەختەوەری وبە هیوای گیرهێنانی شتێك کە بە ئێمە هەستی هێمنایی، هەستی خۆشەویستی بدات، نییە؟ سەرەڕای ئەوە، ئایا خۆشەویستی و تێگەیشتن لە ڕێگای کۆششەوە بە دەستدێت؟ هەستدەکەم ئەم خاڵە گرنگی زۆری هەبێت کە بزانین مەبەستمان لە هەوڵ و تێکۆشان و کۆشش چییە؟

ئایا مانای کۆشش، گۆڕانی "ئەوەی هەیە" بۆ"ئەوەی نییە" یان بەوەی کە دەبێت ببێت یان دەبێت بکرێت، نییە؟ بەدەربڕینێکی تر، هەوڵی ئێمە بەردەوام لەسەرئەمەیە کەلە ڕووبە ڕووبوونەوە لەگەڵ "ئەوەی هەیە" دووری بکەین، یان هەوڵدەدەین لێی هەڵبێین یان بیگۆڕین. کەسێکە بەڕاستی ڕازییە، کەسێکە دەزانێت "ئەوەی هەیە" چییە و مانای ڕاستەقینەی "ئەوەی هەیە" ش دەزانێت. ڕەزامەندی ڕاستەقینە ئەوەیە، نیگەرانی هەبوونی کەم یان زۆر نییە، بەڵکو نیگەرانی ئەوەیە کە مانای گشتی "ئەوەی هەیە" تێبگات و ئەمەش کاتێ مەیسەردەبێت کە تاك "ئەوەی هەیە" دەستنیشانی بکات و لێی ئاگاداربێت، نە کاتێك هەوڵ دەدات خۆراوبانی پێبکات یان بیگۆڕێت.

کەوابوو، دەبیینن کە کۆشش بریتییە لە هەوڵ یان تەقەلا بۆگۆڕانی "ئەوەی هەیە" بەوەی کە تاك دەیەوێت بیبێت. قسەی من تەنیا سەبارەت بە کۆششی دەروونزانییە، نە کۆششێکە سەبارەت بە مەسەلەیەکی فیزیکی باسی لێدە کرێت، وەك ئیشی ئەندازیاری یان دۆزینەوە یان گۆڕانێك کە لەسەدا سەد تەکنیکییە. من تەنیا دەربارەی کۆششێ قسەدەکەم کە تایبەت بە دەروونناسییە و بەردەوام بەسەر کۆششی تەکنیکیدا سەردەکەوێت.لەوانەیە کە ئێوە کۆمەڵگایەکی سەرنج ڕاکێش بەوردبینێکی تەواو بەکەڵك وەرگرتن لە زانیاری زانست دابمەزرێنن، بەڵام تاکاتێك هەوڵ وکۆشش و

خەباتی دەروونزانی فام نەکرێت و بەسەر ڕەوت وکاری لاوەکیدا سەرنەکەوێت پێکهاتەی کۆمەڵگا، هەرچەندە نایاب دامەزرابێت، مەحکووم بەرەوخانە، هەرواکە زۆرجار ڕوویداوە.

کۆشش لادانێکە لە "ئەوەی هەیە" هەرلەو کاتەدا کە تاك ئەوەی هەیە قەبووڵدەکات، ململانێ کۆتایی دێت. هەربیچمێك لە هەوڵوتێکۆشان نیشانەی لادانە و لادانێك کە کۆششە، تاکاتێك من لە رووی دەروونناسییەوە. بمەوێت "ئەوەی هەیە" بەشتێ کە ئەونییە بگۆڕم، دەبێت بوونی هەبێت. سەرەتا ئێمە دەبێت سەربەست بین تابزانین کەلەزەت و خۆشی لە ڕێگای کۆششەوە نایەنەدی. ئایا داهێنان لە ڕێگای کۆششەوەیە، یان داهێنان بەوەستانی کۆشش دێتەدی؟ کەنگێ ئێوە دەنووسن، وێنە دەکێشن، یان گۆرانی دەڵێن؟ کەنگێ خەلق دەکەن؟ بەدڵنیاییەوە، کاتێك کۆششێك لە کاردانییە، کاتێ بە تەواوی ڕەهان، کاتێ کەلە تەواوی ئاستەکاندا لە پەیوەندی تەواوادابن و تەواو بوونە بەیەك. ئەوکاتە هەست بەلەزەت دەکەن و دەستدەکەن بە خوێندن، شیعرگوتن، یان داهێنان لە شتێکدا دەکەن. چرکەی داهێنان بەرهەمی تەقەلاو کۆشش نییە.

لەوانەیە لە فامی مەسەلەی داهێناندا بتوانن ئەوشتەی کە مەبەستمان کۆششە، فام بکەین. ئایا داهێنان و خەلقکردن ئەنجامی کۆششە، ئایا ئێمە لەوساتەوەختانەدا لە کات و زەمەنی داهێنەربوونی خۆمان ئاگادارین؟ یان ئەوەی خەلقکردن جۆرێ هەستی خۆ لەبیرکردنی تەواوە، هەستێ کە لەودا پەرێشانی نییە. کاتێك تاك بەتەواوی لە جموجۆڵی هزر بێخەبەرە، کاتێك تەنیا بوونێك تەواو، کەیل وپڕ هەیە؟ ئایا ئەم دۆخە، ئاکامی ڕەنج کێشان، تێکۆشان، ناکۆکی و کۆششە؟ من نازانم کاتێ ئێوە ئیشێك بە خێرایی و ئاسان ئەنجامدەدەن بەمەتان زانیوە کە کۆششێك لە کاردانییە، ئاسەوارێك لە هەوڵ و تەقەلا نابینرێت؟ بەلاّم لەوێدا کە ژیانی ئێمە کۆمەڵێکە لە خەبات، پێکدادان و ململانێیەکان، ناتوانین لە ژیانێك، لە دۆخێکی بوون کەلەودا تەقەلاو کۆشش بەتەواوی ڕاگیراوە، هەستێکمان هەبێت. بۆفامکردنی دۆخی بوونی بێ تەقەلا و کۆشش، یانێ دۆخی داهێنان، بێگومان مرۆڤ دەبێت لە تەواو مەسەلەی کۆششدا دەست بە توێژینەوە بکات. مەبەستی ئێمە لە کۆشش، هەوڵدان بۆ پێگەیاندنی خودی خۆتە، بۆ بە شتێ بوونە، من ئەمەم و دەمەوێت ئەوەبم، من ئەوە نیم و دەبێت ئەوەبم. بۆ "ئەوە" بوون بە تەقەلا وتێکۆشان، بەخەبات، ناکۆکی، پێویستە. لەم ململانێ داسەپاوەدا ئێمە ئۆگری گەشەی خودین لەڕێگای گەیشتن بە ئامانجێك، گەشەی خودلە شتیکدا، مرۆڤ و ئیدەکەیدا دەبینین و ئەمە بە خەباتێکی نەپچڕاو، تەقەلا و کۆشش بۆ بوون و بەڕاستی



گەیاندنی خود، پێویست دەکات. کەاوبوو ئێمە کۆششمان شتێکی چاوپۆشی لێنەکراو داناوە و نازانین کە ئایا کۆشش- ئەم تێکۆشانەی شتێ بوون- شتێ چاوپۆشی لینەکراوە یان نا؟ بەلاّم بە ڕاستی بۆ دەبێت ئەم تێکۆشانە هەبێت؟

لە هەرکوێ ئارەزووی پێگەیاندن و گەشەی خود هەبێت — جیاوازی نییە لە چ ڕادە و لەچ ئاستێکدا— دەبێت تێکۆشان هەبێت. گەشەی خود پاڵنەرێتی، پاڵنەری شاراوەی کۆشش، چ تاك بەڕێوەبەرێکی گەورەبێت، چ ژنی ماڵ یان هەژارێك، لەهەرحاڵدا خەبات بۆئەوە بوون، خەباتی بەدیهاتنی خود درێژەی هەیە.

بەلاّم بزانین ئەم ئارەزووی پێگەیاندنی- خود-ە بۆچییە؟ بەڕاشکاوی، ئارەزووی گەشەی خود یان شتێ بوون کاتێ دروستدەبێت کە مرۆڤ لە هیچ شتێ بوون ئاگاداربێت. لەبەر ئەوە من شتێ نیم، لەبەر ئەوە من توانایم نییە، چ لەدەروون و چ لە دەرەوە، من تێدەکۆشم خود لە تاکێکدا، لە شتێك یان ئیدەیەکدا گەشەی پێبدەم، پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییە، ڕەوتی تەواو بوونی ئێمەیە. لەوێوە کەلە بەتاڵبوون و هەژاری دەروونی خۆمان ئاگادارین، تێدەکۆشین یان هەنێ شت لەدەرەوە کۆبکەینەوە یان سەرمایەکانی دەروونمان پەروەردە بکەین. تەنیا کاتی کۆشش هەیە کەلەم بۆشاییەی دەروون لە ڕێگای پراکتیك، لەڕێگای قووڵ بیرکردنەوە و شتی لەم جۆرە، ڕێگایەکی دەربازبوون پەیدادەبێت. ئەمە ژیانی ڕۆژانەی ئێمەیە. من لە بێتوانایی خۆم و لە هەژاری دەروونم ئاگادارم و تێدەکۆشم یان لە چنگی هەڵبێم یان پڕی بکەمەوە. ئەم هەلاّتن و تێکۆشانە بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی تەقەلا، تێکۆشانی وکوششی دەوێت.

هەنووکە ئەگەر کەسێ بۆ هەلاّتن، کۆششێ نەکات. چی ڕوودەدات؟ بە تەنیایی، بە خاڵی بوون ژیان دەکات و بە قەبووڵکردنی ئەم بۆشاییە تێدەگات کە دۆخێکی داهێنەرانە کەهیچ پەیوەندییەکی بە هەوڵ و کۆششەوە نییە، لەودا پێکدێت. کۆشش تەنیا تا ئەو کاتەیە کە هەوڵ دەدەین لەم تەنیایی و خاڵی بوونەی دەروونی دووری بکەین، بەلاّم کاتێ سەیری دەکەین و بۆی دەڕوانین، کاتێ ((ئەوەی هەیە)) بێ دوورکەوتنەوە قەبووڵدەکەین. تێدەگەین کە تووشی دۆخێك دەبین کەلەودا تەواو تێکۆشانەکان ڕادەوەستن. ئەمە دۆخی داهێنانە و بەرهەمی تێکۆشان نییە. بەلاّم کاتێ لەوەی هەیە، کە خالّیبوون و بێتواناییە، ئاگاداربین، کاتێ تاك بەو بێتواناییەوە ژیان بکات و بە تەواویش لێی تێبگات، ئەوسا ڕاستییەکی داهێنەرکە بە تەنیایی بەختەوەری دێنێت، لە ڕێوەدەگات.

لەم ڕووەوە پراکتیك، بەو جۆرەی کە ئێمە دەیناسین، لە ڕاستیدا کاردانەوەیـە، کـران بەبێ وەستانە کەناوی حاشایە و دووری کردن لـە ((ئـەوەی هەیـە)). بـەڵام کـاتێ کەبـە بەتاڵبوونی بێ هەڵبژاردن، بێ مەحکووم کردن یان بەراست دانان ئاگاداربین، ئەوکات لـەو تێگەیشتنەدا کە هەیە، لە ((ئـەوەی هەیـە)) پراکتیـك بـوونی هەیـە و ئـەم پراکتیکـە، بوونێکی داهێنەرە. کاتێ لەم مەسەلەیە تێدەگەین کـە لـەخۆ لـە کـردەوەدا ئاگـاداربن. لەکاتی کردەوەدا خود ببینین نەتەنیا لە دەرەوە، بەڵکو جموجۆڵی هزرو هەسـتی خۆتـانیش سەیر بکەن.

کاتێ لەم جوولانە ئاگاداربوون، دەبینین کە ڕەوتی فیکر،کە ئەویش هەست و کردەوەیە، لەسەر بناغەی فامکردنی  بوون بە وەی  دامەزراوە، فامکردنی بوون تـەنیا کـاتێ پێکـدێت کە هەستی بێ ئاسایشی بوونی هەبێت و ئەم هەستە بەبێ ئاسایشی کردنە کاتێ پێکدێت کە مرۆڤ لە بۆشایی دەروونی خۆی ئاگاداربێت. ئەگەر تـاك لـەم ڕەوتـی بیرکردنـەوە و هەسـتە ئاگاداربێت، دەبینێت کە خەباتێکی بێوچان، کۆشـشێ بۆگـۆڕان، بـۆ هاوسـەنگ کـردن  و بۆئاڵوگۆڕ پێکردنی ((ئەوەی هەیە)) لە ئارادایە. ئەمە هەمان کۆشش بۆ بە ئەوەی بوونـە و بە ئەوەی بوون خۆ دوورکردنەوەیەکی ڕاستەوخۆیە لە ((ئەوەی هەیە)). لە ڕێگای خۆناسی و وشیاری بەردەوام، تێدەگەن کە ئەم خەبات و تێکۆشان و دژایەتییەی بەوەی بوون، بە ئازار و خەم و نەزانی کۆتایی دێت. تەنیا لە ڕێگای ئاگاداربوون لەبێ توانایی دەروون وژیـن لەگـەڵ ئەودا بێ هەڵاتن و قەبووڵکردنی بێ ئەملاولایەتی کە مرۆڤ بە هێمنایەکی بێ وێنـەدەگات. ئارامییك کە زەحمەتی بۆ کێشراوە، دروستکراو و  دەستکرد نییـە، بـەڵکو ئـەو ئاسـایش و هێمناییەی کە بە فامکردن و تێگەیشتنی ((ئەوەی هەیـە)) بـە دەسـتهاتووە و تـەنیا لـەو بارودۆخە هێمنەدا بوونێکی داهێنەر هەیە.

# فەسڵی هەشتەم

## دژیەکبوون

دژیەکبوون هەم لە ناوەوەی خۆ دەبینین و  هەم لە دەرەوەی خۆمان. لەوەی کەلە دژیەکبووندایین. هێمنی لە دەروونماندا نییە و بە شێوەی سروشتی لە دەرەوەشماندا هەربەو جۆرەیە. ئەوەی لە ئێمەدا هەیە، دۆخێکی حاشالێکردن و ئیدعایەکی بەردەوامە — یانی ئەوەی کە دەمانەوێت ببین و ئەوەی کەهەین. دۆخی دژیەکبوون، پارادوکس پێکدێنێت و ئەم پارادۆکسە هێمنی پێکناهێنێت — کە ڕاستییەکی ڕوون و سادەیە. ئەم دژیەکبوونەی دەروون نابێت بەجۆرێ دژیەکبوونی فەلسەفی ڕاڤەبکرێت. لەبەرئەوەی ئەمە دوورکەوتنەوەیەکی ئاسانە. بە واتایەکی تر، بە گوتنی ئەوەی کە دژیەکبوون حاڵەتێکی  --سە نەویەتە---، هەستدەکەین کە چارەسەرمان کردووە، کەبەڕاشکاوی تەنیا عورفی گشتییە و یارمەتی هەڵاتن لە ڕاستی دەدات.

هەنووکە بزانین مەبەستی ئێمە لە دژیەکبوون چییە؟ بۆچی لەمندا دژیەکبوون — ئەم تێکۆشانە بێوچانە بۆشتێ بوون، جیالەوەی کە هەین — هەیە؟ من ئەمەم و دەمەوێت ئەوەبم. ئەم دژیەکبوونە لە دەروونی ئێمەدا ڕاستییەکە، نەك ئیزدیواجیەتێکی مەتافیزیایی. مەتافیزیایەك لە فامکردنی" ئەوەی هەیە " مانایەکی نییە. بۆنموونە ئێمە دووفاقی، ئەوەی هەیە. ئەگەربیێت و شتێ لەم جۆرە دەخەینە بەرباس، بەلاّم ئەگەر لە بوونی دژیەکبوون، لە بوونی ئارەزووە دژیەکەکان، ئۆگرییە دژیەکەکان و سەرگەرمییە دژیەکەکان لە دەروونماندا ئاگادارنەبین، چ بایەخێکی هەیە. من دەمەوێت چاکبم و ناتوانم، ئەم دژیەکبوونە و ئەم هەمبەریەك بوونە لە دەروونماندا دەبێت فامبکرێت، لەبەر ئەوە دژیەکبوون سازدەکات و ئێمە بە هەبوونی دژیەکبوون و ململانێ ناتوانین تاکگەرایی پێك بێنین. وەرن هەلومەرجێك کە تێیدا ڕوونی بکەینەوە. بوونی پارادۆکس، بوونی تێکۆشان مسۆگەردەکات و یانێ وێرانکردن و لە کیسدان. لە بارودۆخێکدا، شتێ جگە لە دوژمنی، دژایەتی، تاڵی و خەمی زۆرنایەتەدی. ئەگەرئێمە بتوانین ئەمە بەتەواوی تێبگەین و بەم جۆرە لە چنگی دژیەکبوون ڕزگاربین، لەوحاڵەدا دەکرێت هێمنی دەروونیت ببێت کە ئەنجامەکەی تێگەیشتنی یەکترە.



مەسەلەکە ئەوەیە کاتێك دەزانین کە دژیەکبوون ڕوخێنەرو بێئاکامە، هۆی بوونی لە دەروونی یەکەیەکەی ئێمەدا چییە؟ بۆفامکردنی دەبێت تۆزێك بڕۆینە پێشەوە. هۆکاری بوونی هەست بە ئارەزووە دژیەکەکان چییە؟ من نازانم ئایا ئێمە بەبوونی ئەوە — بەبوونی ئەم دژیەکبوونە، ئەم هەستی  ویست ونەویستنە، بەبیرهێنانەوەی شتێك و هەوڵ بۆلە بیربردنەوەی، بۆگیرهێنانی شتی نوێ — لە دەروونی خۆماندا ئاگادارین یان نا؟ باش سەرنج بدەن زۆرسادە و زۆر ئاساییە. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە دژیەکبوون هەیە، بەلاّم بۆچی ئەم دژیەکبوونە هەیە، بەلاّم بۆچی ئەم دژیەکبوونە سازدەبێت؟ مەبەستی ئێمە لە دژیەکبوون چییە؟ ئایا شتێکی وا پێویستی بە دۆخێکی ناسەقامگیرە کەلە بەرامبەر دۆخێکی ناسەقامگیری تردا دەوەستێت،نییە؟ هەستدەکەم من خاوەنی ئارەزوویەکی سەقامگیرم کەلە دەروونی خۆمدا جێگری دەکەم. بەلاّم ئارەزوویەکی دیکە سەرهەڵدێنێت کە ئەو ڕەدی دەکاتەوە. ئەم دژیەکبوونە، پارادوکس پێکدەهێنێت کە جۆرێ لە  کیس چوونە — بە واتایەکی تر، جۆرێ وەرنەگرتنی هەمیشەیی ئارەزوویەك بە یارمەتی ئارەزوویەکی ترو سەرکەوتنی پیشەیەك بەسەر پیشەیەکی تردا هەیە. هەنووکە بابزانین شتێ بەناوئارەزووی هەمیشەیی هەیە؟ گومانێك نییە لەوەی کە تەواو ئارەزووەکان نا سەقامگیرن، نەلەڕووی مەتافیزیکەوە، بەڵکو لە ڕووی واقیعیەتەوە. خوازیاری پیشەیەکین یانێ وەك ئامرازێك بۆ خۆشی سە یری  پیشەیەك دەکەین و کاتێ کەگیری دەهێنین، ناڕازین. دەمەوێت بەڕێوەبیەرم، دواترمالك و.... هتد. نەتەنیا لەم دونیایە، بەڵکو لەوەیش کەبەناوی دونیای مەعنەوی پێدەڵێین بارودۆخ بەم شێوەیە. مامۆستا دەیەوێت بەڕێوەبەری قوتابخانە، قەشە، ئوسقوف و خوێندکار مامۆستا بێت.

ئەم بوونی بەردەوامە، ئەم چوونە ناودۆخی جۆراوجۆرە، دەبێتە هۆی دژیەکبوون، وانییە؟ لەم ڕووەوە بۆچی بەجێی  ڕوانین بۆژیان وەك ئارەزوویەکی هەمیشەیی، ئەو وەك کۆمەڵێك لە ئارەزووە کاتیەکانی دژی یەکتر دانەنێین؟ لەوشێوەیەدا پێویست ناکات کە زەین لە بارودۆخی دژیەکبووندابێت. ئەگەرمن ژیان وەکو ئارەزوویەکی هەمیشەیی نەگرم و  ئەو وەك کۆمەڵێك لە ئارەزووە کاتییەکان  بزانم کەبەردەوام لە حاڵی گۆڕاندان ئەوا دژیەکبوونێك نابێت.

دژیەکبوون تەنیا کاتێك پێکدێت کە زەین خاوەن ئارەزوویەکی نەگۆڕە و ئەمەش ئەو کاتەیە کەزەین تەواو ئارەزووەکان بە بزۆز و کاتی نازانێت. بەڵکو دەنووسێت  بە ئارەزوویەکەوە و دەیکات بە شتێکی هەتا هەتایی. تەنیا لەو هەلومەرجەداو کاتێك کە ئارەزووەکانی

دیکەشی سەرهەڵدەدەن، دژیەکبوون پێکدێت. هەڵبەت ئارەزووەکان لە جووڵەیەکی بەردەوامدان. شتێك بە ناوی سەقامگیری و نەگۆڕی ئارەزوو بوونی نییە. دەربارەی ئارەزووخاڵی نەگۆڕ بێمانایە، بەلاّم زەین خاڵێکی نەگۆڕ دیاریدەکات. لەبەر ئەوە لەگەڵ هەموو شتێکدا وەك ئامرازێك بۆگەیشتن بۆئەنجام سەیردەکات و تا کاتێ کە تاك لە حاڵی گەیشتندایە، دژیەکبوون و ناکۆکی دەستبەرداری نییە. لە مرۆڤداحەز بەگەیشتن و سەرکەوتن و بەگیرهێنانی ڕاستی یەکجارەکی یان خودای هەتاهەتایی کە جێی ڕەزامەندی هەمیشەیی ئەوە، هەیە. کەوابوو نە بەدوای گیرهێنانی ڕاستیدایە و نە بەدواداچوونی پەروەردگار. ئەوەی کەبۆی دەگەڕێت ڕازیبوونی سەقامگیرە و بەژنی ئەم ڕازیبوونەش بە کراسێك لە خەیاڵ دادەپۆشێت. وشەیەك بە ئاوازێکی موحتەرەمانەی وەك: خواوەند یان ڕاستی، بەلاّم لە ڕاستیدا هەموومان بە دوای ڕازیبوونەوەین و ئەوکات ئەم ڕازیبوونە لە بەرزترین ئاستدا دادەنێین و بەو زاتی خواوەند و لە نزمترین ئاستدا بەو مەشروب و خواردنەوە دەڵێین. تا ئەوکاتەی کەزەین بە دوای ڕازیبووندا دەگەڕێت، نێوان خواو خواردنەوە جیاوازییەکی ئەوتۆ نییە. لەوانەیە لەڕووی جڤاکییەوە خواردنەوە شتێکی خراپ بێت، بەلاّم مەیل و حەزی دەروون بەڕازی بوون و گەیشتن لەمەش زیان بارترە. قبووڵتانە؟ ئەوکەسەی کە بەدوای گیرهێنانی ڕاستییەوەیە، دەبێت لە ڕادەبەدەر شەرافەتمەند بێت، نەتەنیا بەشێوەی زارەکی، بەڵکو لە گشت لایەنێکەوە و تائەوکاتەی کە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ڕاستی ئۆگریەك نیشاننەدات، ناتوانێت پاکی هەبێت.

ڕاستی چ شتێ دەبێتە هۆی پێکهێنانی دژیەکبوون لە تاك تاکی ئێمەدا؟ بەدڵنیاییەوە، مەیل بەشتێ بوون، هەمووی ئێمە دەمانەوێت ببینە شتێ، لەدونیا سەرکەوتن بەدەست بێنین و لە ڕووی دەروونیشەوە بە ئاکام بگەین. تا ئەوکاتەی کەلە سەربنەمای زەمان، لەسەربنەمای سەرکەوتن و لەسەربنەمای پلەوپایە بیردەکەینەوە، دژیەکبوون هەیە. بە هەرجۆر زەین دەستی پەروەردەی زەمانە. بیرکردنەوە لەسەر بناغەی دوێنێ و ڕابردووە. تا ئەو کاتەی کە زەین لە چوارچێوەی زەماندا چالاکی بکات و لەسەر بنەمای کران، بەدەستهێنان و سەرکەوتن بیربکاتەوە، دەبێت دژیەکبوون هەبێت. لەبەرئەوە لە هەلومەرجێکی وادا ئێمە لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ "ئەوەی هەیە " بێتوانا دەبین. تەنیا کاتێ دەرفەتی ڕزگاری لە چنگ ئەم هۆکارە شیکەرەوە و ڕزێنەرەکە ناوی دژیەکبوونە، هەیە کە " ئەوەی هەیە" بە شیاوی بەدیهاتن بزانین، فامی بکەین و بێ هەڵبژاردن لێی ئاگاداربین. کەوابوو، فامکردنی ئاراستەی گشتی بیرکردنەوەی ئێمە پێویستییەکە، چونکە



لەوێدایە کە ئێمە بە دژیەکبوون دەگەین. خودی بیرکردنەوەش بووە بە دژیەکبوونێك، لەبەرئەوە بەسەر ئاراستەی گشتی خودی خۆماندا زاڵ نەبووبین و ئەم زاڵبوونەش کاتێ مەیسەرە کە ئێمە لە فیکری خودی خۆماندا بە تەواوی ئاگاداربین، هەڵبەت نە وەك بینەرێك کەلەسەر بناغەی هزری خۆی کاردەکات، بەڵکو بەشێوەیەك پارچە وبێ هەڵبژاردن کەلە ڕادە بەدەردژوارە. کەوابوو ئەوەی کە بۆئێمە ماوەتەوە، بێ چارەسەربوونی ئەم دژیەکبووونەیە، یانێ شتێکی پڕ ئازارو خەماوی.

تا ئەو کاتەی کە هەوڵدەدەین بە ئاکامێکی دەروونزانی بگەین، تا ڕۆژێ کە خوازیاری ئاسایشی دەروونی بین. دژیەکبوون بەشێکی جیانەکراوە لە ژیانی ئێمەیە. من هەستناکەم کە زۆربەی ئێمە لەبوونی ئەم دژیەکبوونە ئاگاداربین، یان ئەگەر ببین مانای ڕاستەقینەکەی نازانین، دژیەکبوون بە ئێمە ئیرادەی ژیان کردن دەدات. خودی توخمی لێکخشان بە ئێمە هەستی زیندووبوون دەدات، کۆشش و تێکۆشانی دژیەك، جۆرێ هەستی دروستکردنەوە  بە ئێمە دەدات، لەبەرئەم هۆیە کە خەباتمان خۆشدەوێ، لەبەر ئەم هۆیە کە لە خەبات دژی بێدەسکەوتی لەزەت دەبین. تائەوکاتەی  کە حەزی گەیشتن بەئاکام کە حەزلە هەبوونی ئاسایشی دەروونییە، هەیە دژیەکبوونیش دەبێت بوونی هەبێت و لەهەرجێ کە دژیەکبوون بێت. زەینی ئارام بوونی نابێت. هێمنی زەین بۆفامکردنی مانای گشتی ژیان پێویستە، هزر هەرگیز ناتوانێت ئارام بگرێت، هزرکە بەرهەمی زەمانە، هەرگیز ناتوانێت بەشتێ کە زەمانی لەگەڵدا نەبێت بگات، هەرگیزناتوانێت ئەوەی کە لەوپەڕی زەماندا بێت، بناسێت. بنەماو بنچینەی زات و ناوەڕۆکی بیرکردنەوەی ئیمە دژیەکبوونە، لەبەرئەوە ئێمە هەمیشە یان لەسەربناغەی ڕابردوو بیردەکەینەوە یان داهاتوو، لەم ڕووەوە ئێمە هیچ کات بەشێوەی تەواو لە ڕانەبردوو بەخەبەرو ئاگادارنین، ئاگاداربوون لە ڕانەبردوو، ئەرکێکی لە ڕادەبەردەر دژوارە، لەبەر ئەوە زەین لە ڕووبەڕوو بونەوەی لەگەڵ ڕاستی بە شێوەی ڕاستەوخۆ و بێ خەڵەتان بێتوانایە. هزر بەرهەمی ڕابردووە، لەم ڕووەوە تەنیا لە ڕووی ڕابردوو یان داهاتوو دەتوانێت بیربکاتەوە؟ ناتوانێت بەشێوەی تەواو لەڕاستی  ڕانەبردوو ئاگاداربێت. تا ئەوکاتەی کە هزر- بەرهەمی ڕابردووە — لە هەوڵی لە نێوبردنی دژیەکبوون و تەواو ئەوگرفتانەی کە خەڵقیان دەکات، هەیەوتەنیا بەدوای ئەنجامێکەوەیە، کۆشش دەکات بۆئەوەی بە ئامانجێك بگات و بیرکردنەوەی لەم جۆرە

،دژیەکبوونی زیاتر دروستدەکات و لەم ڕووەوە دەبێتەهۆی پارادوکس، هەژاری و شێواوی بۆ ئێمە بۆ دەوروبەرمان.

بۆ ڕزگاری لە چنگ دژیەکبوون، تاك دەبێت لە زەمانی ڕانەبردووبێ هەڵبژاردن ئاگاداربێت. ئاخرچۆن دەبێت کاتێ کەلە ڕاستیدا ڕووبە ڕوودەبینەوە، هەڵبژاردنێك ڕوونەدات؟ بەدڵنیاییەوە،ئاگاداربوون لە ڕاستی تا ئەوکاتەی کە هزرلە هەوڵدایە لەسەر بناغەی کران، گۆڕان و ئاڵوگۆڕکردن دەربارەی ڕاستی ئیشبکات، مەیسەرنابێت.

کەوابوو، خۆناسی سەرەتای فامینە، بەبێ ناسینی خۆ،دژیەکبوون درێژەی دەبێت. بۆناسینی ئاڕاستەی گشتی و تەواویەتی خود پێویست بە پسپۆڕی و شارەزابوون نییە. کەوتنە شوێن شارەزابوون تەنیا ترس ودڵە ڕاوکێ دروستدەکات، هیچ پسپۆڕێك هیچ کارامەیەك ناتوانێت شێوازی فامکردنی ڕەوەندی خود بەئێمە نیشانبدات. هەرکەس دەبێت بۆخۆی بیخوێنێتەوە ئێوە و من دەتوانین بە قسەکردن لەبارەیەوە یارمەتی یەکتربدەین. بەلاّم هیچ کەس ناتوانێت پەردە لەسەر نهێنی ئەو بۆئێمە لاببات، نەهیچ پسپۆڕونەهیچ مامۆستایەك دەتوانێت تایبەت بەو بۆ ئێمە توێژینەوە بکات. ئێمە تەنیا لە پەیوەندییەکانماندا — لە پەیوەندییەکانمان لەگەڵ شتەکان، لەگەڵ بەستراوەی ماددی، لەگەڵ خەڵك و خەیاڵەکان— دەتوانین لێی ئاگاداربین. لە پەیوەندیدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە دژیەکبوون کاتێ پێکدێت کە کردەوە خۆی لە خەیاڵ نزیك دەکاتەوە. خەیال تەنیا چوون بلوور بوونی فیکر لە شێوەی هێمایەکدایە و کۆشش بۆ هاوئاستکردنی خۆی لەگەڵ ئەم هێمایەدا، دژیەکبوون پێکدێنێت.

لەم ڕووەوە تا ئەوکاتەی کەسەرمەشقێك بۆ بیرکردنەوە ببێت، دژیەکبوون درێژەی دەبێت، ناسینی خۆ ڕێگایەکە بۆ کۆتایی هێنان بە نموونە و سەرمەشقەکان، هەروەها دژیەکبوونیش. ئەم لەخۆئاگاداربوونە، ڕەوتێك نییەکە بۆ بەشێکی کەم عەمبارکرابێت. خود دەبێت لە ئاخاوتنی ڕۆژانەدا، لە شێوەی بیرکردنەوە و هەستکردن و لەشێوازی ڕوانین بۆ ئەویتردا بناسێت. ئەگەر بتوانین لە هەرهزر و هەستێك چرکە بە چرکە ئاگاداربین، ئەوا دەبیینین کە ناسینی ڕەهەندەکانی "خود" لە پەیوەندیدا دێتەدی. تەنیا لەو دۆخەدا، هێمنی زەین کە ڕاستی یەکجارەکی تەنیا و تەنیا لەودا ڕوودەدات، مەیسەردەبێت.

# فەسڵی نۆیەم

## خود چییە؟

ئایا دەزانین مەبەستمان لە خود چییە؟ مەبەستی من لەخود، بریتییە لە خەیاڵ، بیرەوەری، ئاکام، ئەزموون، بریاری جۆراوجۆر کە دەکرێت ناویان بەرین و ئەوانەی کە ناکرێن ناویان بەرین. کۆششی هەست بۆ بوون یان نەبوونی بیرەوەریە کۆکراوەکانی نەست، ئەوەی کە تایبەتە بە گرووپ، ڕەگەز، تاك، عەشیرە و تەواوی ئەم جۆرە گرووپانە چ لە دەرەوە لە کردەوەدا باسیان کرابێت و چ بەشێوەی مەعنەوی، وەك وشککردن، کۆشش بۆهەموو ئەمانە، پێیدەڵێین خود. هەڵبەت ململانێ و مەیل بە بوونیش لە خۆ دەگرێت. تەواوی ئەم پرۆسەیە خودە و ئێمە بەکردەوە دەزانین کە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی ئێمە کە خودی شەڕە، چ زەمانێکە. من لە وشەی شەڕ بە ئەنقەست کەڵك وەردەگرم، لەبەرئەوە خود، شیکەرەوەیە، خود بەرتەسك کەرەوەیە . چالاکییەکانی هەر چەندەش نەجیمانە بن، جیا کەرەوەیە و دەبێتەهۆی گۆشەگیری. ئێمە هەموو ئەمانە دەزانین، هەروەها ئەو چرکە بێ وێنانەش کەلەواندا خود نییە — لە خوددا هەستی کۆشش و هەستی تێکۆشان نییە و کاتێ ڕوودەدات کە عەشق حاکمە— دەناسین.

وا هەستدەکەم کە تێگەیشتنی چۆنیەتی دانی دەسەڵات بە خود لە ڕێگای تەجروبەوە گرنگی هەبێت. ئەگەر لە ئێمەدا دۆستایەتی و نزیکی هەبێت، دەبێت بەم گرفتەی تەجروبە، شارەزایمان هەبێت. هەنووکە بزانین مەبەستمان لە تەجروبە چییە؟ ئێمە هەمیشە لەگەڵ تەجروبە و کاریگەریەکاندا بەرەو ڕووین و ئەم گاریگەریانە وەردەگێڕین و لەسەر پێویستی ئەوان کردەوە یان ڕیفلێکس ئەنجامدەدەین و هەمووکات بەدوای زانین و ژماردن و لەم جۆرە ئیشانەوەین. لە نێوان ئەوەی کە بوونی دەرەکی هەیە و کاردانەوەیەك کە ئێمە بەرامبەر بەوهەمانە، کاریگەری بەردەوام و بەرامبەر هەیە، ئەم کاریگەریە بەردەوام و بەرامبەرە لە نێوان هەست و بیرەوەریەکانی نەستیشدا هەیە.

لە بەرامبەر ئەوەی دەیبینم، لەبەرامبەر ئەوەی هەستیدەکەم، ڕیفلێکس ئەنجامدەدەم، لەم ئاڕاستەیدا ئەوەی دەیبینم، ئەوەی هەستیپێدەکەم ئەوەی کەباوەڕم پێی هەیە، ئەزموون



دروستدەبیت، وانییە؟ کاردانەوە بەرامبەر بەوەی دەبینرێت یان وەلامدانەوەی، پێیدەڵێین ئەزموون. کاتێ من ئێوە دەبینم، ڕیفلێکس ریفلێکس ئەنجامدەدەم ، بەم ریفلێکسە دەڵێن ئەزموون. ئەگەر ناوی ریفلێکس نەنێین، ئەزموون نییە. بە وەلامەکانی خۆتان و ئەوەی کە لە دەوروبەرتاندا ڕادەبرێت، سەرنجبدەن. شتێك بەناو ئەزموون بوونی نییە مەگەر ئەوەی کە ڕەوتێکی ناوناییش لە هەمان کاتدا بەڕێوەبێت. ئەگەر من ئێوە نەناسم، چۆن دەتوانم ئەزموونی چاوپێکەوتنم لەگەڵ ئێوەدا هەبێت؟ بەڕای من بابەتەکە ڕاست و سادەیە، ئایا واقعیەتی نییە؟ بە واتایەکی تر، ئەگەر من لەڕووی بیرەوەریەکانم و عادەتکردنم ولە ڕووی دەمارگیرییەکانی خۆ، ڕیفلێکس ئەنجامنەدەم، چۆن تێدەگەم کە ئەزمونێکم دەستکەوتووە.

لەمەی کە تێپەڕین بە ڕەنگدانەوەی ئارەزووە جۆراوجۆرەکان دەگەین. من ئارەزووم هەیە یارمەتی بدرێم و بگەمە ئاسایشی دەروونی، یان ئارەزوومەندم مامۆستا، ڕێبەر یان پەروەردەگارێکم هەبێت و ئەوەی کە دەربڕی خودی منە، تەجروبەی دەکەم. بە دەربڕینێکی تر، من ئارەزوویەکم خستۆتەڕووکە چوارچێوەیەکی بە خۆگرتووە ومن ناوێکم لەسەر داناوە، من بەرامبەر بەو ڕیفلێکس ئەنجامدەدەم، ئەوە وێنەی منە، شتێکە من ناوم لە سەرداناوە، ئارەزوویەکە بەمن ئەزمونێك دەدات و ناچارم دەکات بڵێم: "من تەجروبەم هەیە"، "من چاوپێکەوتنم لەگەڵ مامۆستا کردووە"، یان "مامۆستام نەدیوە". ئێوە خۆتان تەواو ڕەوتی ناونانی ئەزموون دەزانن. ئارەزوو، هەرئەو شتەیە کە ئێمە پێیدەڵێین تەجروبە، جیالەمەیە؟.

کاتێ ئارەزووی هێمنی زەینم هەیە، چ شتێ ڕوودەدات؟ من هەبوونی زەینێکی هێمن و ئارام بەهۆی جۆراوجۆر بەگرنگ دەزانم، لەبەرئەوە ئوپانیشادەکان، کتێبە ئاسمانییەکان و پاکەکان وایان گوتووە، هەروەها هەندێ جارخۆم هەستدەکەم کە ئارام بوون چەندە چاکە. لەبەر ئەوە زەینی من لە تەواوی ڕۆژدا خەریکی زۆربێژی بووە. هەندێ جارهەستدەکەم هەبوونی زەینێکی ئارام چەندە باش و چەندە لەزەت گەیەنەرە. من خوازیاری زەینێکی ئارامم، کەوابوو، دەپرسم چۆن دەتوانم بە دەستی بێنم؟ من دەزانم کە فلانە کتێب و فیسارە کتێب دەربارەی بیرکردنەوە و شێوە جۆراوجۆرەکانی دیسپلیس چ دەڵێن. کەوابوو، بە یارمەتی دیسپلیس دەڕۆم بەدوای ئەزموونی هێمنایدا. کەوابوو خود، ((بوونی)) خودی لە ئەزموونی هێمنیدا جێگیرکردووە.

من ئەمەوێت بزانم ڕاستی چییە؟ ئەمە حەز و ئارەزووی منە،کەوابوو -- فرافکنی-- من لە بارەی هەقیقەتەوە دەسپێدەکات. هۆکارەکەشی ئەوەیە کەلەم پەیوەندییەدا بابەتی زۆرم خوێندۆتەوە و بیستوومە کە زۆرێك لە خەڵك لەم بارەیەوە قسەدەکەن و کتێبە ئاسمانییەکانیش

دەربارەی باسیان لێکردووە. من  خوازیاری هەموویم. چی دەبێت؟ هەمان داخوازی، هەمان ئارەزوو خستنەڕوو دەبێت و من لەبەرئەوەی کە دۆخی ڕووکراو دەناسم، تەجروبە دەکەم. ئەگەر ئەوبارودۆخەم نەدەناسی، ئەوەم ڕاستی ناونەدەنا. من دەیناسم و تەجروبەی دەکەم و ئەو تەجروبە، بە (خود)، بە (من) هێز دەدات. کەوابوو، خود دەڕواتە سەنگەری تەجروبە. ئەوکات تاك دەڵێت: (دەزانم)، (مامۆستا زیندووە)، (خواوەند هەیە) یان (خواوەند نییە)، هەروەها دەڵێت کە گرووپێکی سیاسی تایبەت هەقی هەیە و باقی گرووپەکانی تر هەقیان نییە.

کەوابوو ئەزموون هەمیشە لە حاڵی بە هێزکردنی (من) دایە. هەرچی زیاترلە سەنگەری ئەزموونیدا بمێنێتەوە، (من) هێزی زیاتر بە خۆ دەگرێت. سەرەنجام دەبنەخاوەن جۆری هێزی ڕاهێنان، هێزی زانست و باوەڕ کە بۆ ئەوانی تر نمایشی دەکەن. لەبەرئەوە دەزانن کە ئەوان هۆشی ئێوەیان نییە و ئێوە خاوەن توانای  قەڵەمی و زارەکی و هۆشین. لەبەر ئەوە، خود هێشتا چالاکە کەوابوو باوەڕەکانی ئێوە،مامۆستایانی ئێوە، هۆزەکانی ئێوە، سیستەمی ئابووریتان، هەرهەمووی ئاڕاستەیەکی تەریك خوازن و لەم ڕووەوە دەبنە هۆی ڕازیبوون. ئێوە ئەگەر بەڕاستی لەم مەسەلەیەدا جیدی و نزیك دەبێت ئەم ناوەندە بە تەواوی بیڕوخێنن و پاساوی بۆ نەهێننەوە. لەبەرئەم هۆیە کە  دەبێت بەسەر ڕەوتی ئەزموونیدا شارەزابین.

ئایا بۆزەین و بۆ خود ئەم دەرفەتە هەیە کە--فرافکنی-، تەجروبە وئارەزوو نەکات؟ دەبینین کە تەواو ئەزموونەکان، خۆی جۆرێ ڕەتکردنەوەیە ئایا لەم بارەیەوە هەق بەئێوەیە؟ ئایا ئێمە — ئێوە و من وەك تاك — دەتوانین بڕوێنە  ناخییەوە و ئاڕاستەی خود بدۆزینەوە؟ ڕاستی چ شتێك دەبێتە هۆی داڕووخانی خود؟ مەزهەبەکان و گرووپەکانی دیکە هاوشێوە کردن یان پێشنیازکردووە. ئەوەی کە ئەوان دەڵێن ئەمەیە: (خۆتان وەك شەخسیەتێکی گەورەترلێبکەن، خود ون دەبێت) بەڵام بێگومان هاوشێوە کردن ڕەوتی خودە. تاکی گەورەتر تەنیا دەربڕی (من)ە کە تەجروبە دەکەم، کەوابوو بە وزەبەخشی من دەژمێرێت.

تەواو جۆرە جیاوازەکانی دیسیپلین، باوەڕو زانست، بە بێگومان تەنیا خود بەهێزدەکەن. ئایا دەکرێت توخمێك پەیدا بکەیت کە خود لەبەریەك هەڵوەشێنێت؟ یان ئەمەی کە پرسیاری وا ڕاست نییە؟ ئەمە هەر ئەوشتەیە کە لەڕاستیدا دەمانەوێت. ئێمە دەمانەوێت شتێ پەیدابکەین کە (من) لەبەریەك هەڵوەشێنێت؛ وانییە؟ ئێمە هەستدەکەین ئامرازی جۆراوجۆر هەیە، وەك، هاوشێوە کردن، باوەڕ و هتد..، بەڵام  هەموویان بەیەك ڕادە لە بەهێزکردنی (من)و (خود)دا دەسەڵاتیان هەیە.



کەوابوو ئایا دەتوانم من لە جێیەك کە ئیشدەکەم، ببینم و وزە و هێزی ڕووخێنەر سەیربکەم؟ چ جیاوازییەك هەیە کەچ ناوێکی لەسەردانێم؟ بەهەرجەهەت ئایا هێزێکی پەراوێزخەر، هێزێکی ڕووخێنەرە و من دەمەوێت ڕێگەیەك بۆلێکهەڵوەشانی بدۆزمەوە. ئێوە خۆتان دەبوا ئەم پرسیارەتان بپرسیبا، (من)، (من) دەبینم کە بەردەوام خەریکی کاردانەوەیە و لەگەڵ خۆیدا ترس، پەرێشانی، بێدەسکەوتی، بێ هیوای و هەژاری دێنێت؛ نەتەنیا بۆ خۆم بەڵکو بۆ ئەوانەیش کەلە دەوروبەری مندان. ئایا ئیمکانی لێکهەڵوەشانی من — نەبەشێوەی بەش بەش، بەڵکو بەشێوەی گشتی — هەیە.؟ دەتوانین لەبنوبێخەوە لە نێوی ببەین؟ ئەمە ڕاستەقینەترین ڕێگەیە. من نامەوێت تۆزێ زیرەك بم، بەڵکو دەمەوێت ئەم زیرەکییە تەواوبێت. زۆرێك لە ئێمە خاوەن ئاستگەلێك لە زیرەکین، لەوە دەچێت ئێوە بە جۆرێ و من بە جۆرێکی دیکە. هەندێ لە ئێوە لە کاری بازرگانیتاندا بە هۆشن، هەندێ لە ئیشی ئیداری و لەم جۆرانە. هۆشی خەڵك لە ئاستە جیاوازەکاندایە. بەڵام ئێمە هۆشی تەواومان نییە. هەبوونی هۆشی تەواو یانێ بێ (خود) بوون. ئایا شتێکی وا مەیسەرە؟

ئایا هەنووکە بۆ خود ئیمکانی حازر نەبوونی تەواو هەیە؟ ئێوە دەزانن کە وەڵامەکە ئەرێ نییە.بەڵام پێداویستی پێویستی چییە؟ چ توخمێك دەبێتە هۆی پێکهاتنی. ئایا من دەتوانم گیری بێنم؟ کاتێ ئەم پرسیارەی کە: ((ئایا من دەتوانم گیری بێنم؟)) دەپرسم، من باوەڕم هێناوە کە ئەم شتە مەیسەرە؛ کەوابوو من لە پێشا تەجروبەیەکم خەلقکردووە کەلەودا بڕیارە خود بەهێزببێت، جیالەمەیە؟ فامی خود، پێویستی بە هۆشی زۆر، چاودێری زۆر، هۆشیاری و ئاگا لێبوونێکی بەردەوام هەیە تا لەکیس نەچێت. من، کەزۆر جیدیم، دەمەوێت خود لێك هەڵوەشێنم. هەرلەو چرکەیەدا کە دەڵێم ((دەمەوێت ئەمە لێك هەڵوەشێنم)) ئەزموونی خودیش هەیە، کەواتە، خود بەهێزدەبێت. سەرەنجام چۆن بۆخود مەیسەرەکە تەجروبە نەکات؟ هەرکەس دەتوانێت تێبگات کە بارودۆخی داهێنان بە هیچ جۆر ئەزموونی خود نییە. داهێنان ئەوکاتەیە کە خود لەوێدا نییە. لەبەر ئەوە داهێنان زیرەکی دەگەیەنێت؛ شتێ نییە تایبەت بە زەین، خود  --فرافکنی-- نییە، شتێکە لەوپەڕی هەموو ئەم تەجروبانەوە. کەواتە ئایا بۆزەین ئیمکانی هێمنی تەواو هەیە. ئیمکانی بوونی لە دۆخێکدا کە وێناکردن و دووبارەناسی نەبێت، لە دۆخێکی تەجروبە نەکردندا، هەروەها ئیمکانی بوونی لە بارودۆخێکدا کە ئیمکانی داهێنان هەبێت؛ یانێ کاتێك خود لەوێدا نییە و گومە. مەسەلەکە ئەمەیە، وانییە؟ هەرجووڵانێکی زەین، ئەرێی یان نەرێی، ئەزمونێکە کە بە کردەوە

((من)) بەهێزدەکات. ئایا بۆ زەین ئیمکانی نەناسین هەیە؟ شتی وا کاتێ ڕوودەدات کە هێمنی تەواوبێت، بەڵام نە ئارامییێکە ئەزموونی خود بێت و سەرەنجام خەریکی بە هێزکردنی خود بێت.

ئایا بوونێك جگە لە خود کە بیربکاتەوە لە خۆ و خود لەبەریەك هەڵوەشێنێت هەیە؟ ئایا بوونێکی مەعنەوی کە بڕواتە جێی خود و لەونێوەندەدا هەڵیگرت و بیهاوێژێتە ئەولاوە هەیە؟ ئێمە هەستدەکەین کە هەیە. زۆر لە خەڵکانی مەزهەبی پێیان وایە توخمێکی وا گیردێت. کەسانی ماددی دەڵێن: ((لە نێوبردنی خود مەیسەر نیە، تەنیا دەکرێت خود مەرجی کرێتەوە و کۆنترۆڵی بکەیت، چ لەڕووی سیاسی، چ لە ڕووی ئابووری و چ جڤاکی.دەتوانین لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا ڕاییبگرین و دەتوانین بیشکێنین، کەوابوو دەکرێت ناچاریبکەین کە ژیانێکی نایاب، یان ژیانێکی ئەخلاقی بێ دەست تێوەردان لە هیچ کاروبارێکدا، هەبێت و لەسەر مەشقێکی کۆمەڵایەتی پەیڕەوییکات و ڕاست وەك ماشینێك کاربکات)). ئەمە شتێکە کە ئێمە دەیزانین، کەسانی دیکەش هەن، کەسانی بەناو مەزهەبی کە لەڕاستیدا مەزهەبی نین، قەیدی ناکات کە ئێمە ناوی مەزهەبیان لەسەردادەنێین، کە دەڵێین: ((لە بنەڕەتدا توخمێکی واهەیە. ئەگەربزانین لەگەڵی پەیوەندی بگرین و ئەم توخمە، من دەڕووخێنێت)) ئایا توخمێك بۆ داڕووخانی خود پەیدا دەبێت؟ تکایە سەرنج بدەن کەئێمە چی دەکەین. خەریکین بە زۆر خود بەرەو گۆشەیەك دەبەین، ئەگەرمرۆڤ ئیجازە بدات بە خۆی کە دووبارە بیهاویژتەوە بۆ گۆشەیەك، دەیبینین کە چی ڕوودەدات. ئێمە حەزدەکەین لەوێدا توخمێك جیا زەمان، توخمێك کەلە خود نیە، توخمێك کە هیوادارین لە ڕێگەوە بگات، بێتە ناو کایەوە و ((خود)) لە نێوببات شتێکی وا تەنیا زاتی خواوەندە. ئای شتێکی وا کەلە بەراوردی زەیندا بگونجێت هەیە؟ هەندێ دەڵێن هەیە و هەندێ دەڵێن نییە، بەلاّم کاتێك زەین بە دوای دۆخێکی مەعنەوی جیالە زەماندا دەگەڕێت کە دەستبەکاربێت تا خود لەنێوببات، ئایا خودی ئەم کارەیش جۆرێکی ترلە تەجروبە کە وزەبەخشی (من) ە نیە؟ کاتێ ئێوە خاوەنی باوەڕن، ئایا ئەمە هەر ئەوشتە نییە کە ڕوودەدات؟ کاتێ ئێوە باوەڕتان هەیە کە ڕاستی، خواوەند، دۆخی ڕەها لە زەمان و هەمیشەیی هەیە، ئایا ئەم ئاڕاستە، بەهێزکردنی " خود " نیە؟ خود ڕەنگدانەوەی شتێکە کە ئێوە هەستدەکەن و باوەڕتان وایە دێت و خود لە نێو دەبات. کەوابوو بەڕەنگ دانەوەی ئەم خەیاڵە، بەردەوامی بێدابڕان لە دۆخی جیا لە زەمان وەك بوونێکی مەعنەوی، ئێوە بە ئەزمونێك دەگەن و ئەم ئەزموونە ئیشی تەنیا بەهێزکردنی خودە. کەوابوو ئیشی چ بووە؟ ئێوە لە ڕاستیدا خود تان لە نێو نەبردووە، بەڵکو تەنیا ناوێکی ترو چۆنایەتێکی ترتان پێداوە، خود لەوێیە، لەبەر ئەوە ئێوە تەجروبەتان کردووە. لەم ڕووەوە ئیشی ئێمە لەسەرەتا تا کۆتایی هەمان پراکتیکە، ئێمە تەنیا هەستدەکەین پوختە دەبێت، نەشوونما دەکات، جوانترو جوانتر دەبێت. بەلاّم ئەگەر لە دەروونەوە بڕوانن، هەمان کردەوەیە کە درێژە دەکێشێت، هەمان ((من))ە کەلە ئاستەجیاجیاکاندا بە مۆرکی جۆراو جۆر و ناوی جۆراوجۆرسەرقاڵی جێبەجێ کردنی ئەرکە.



کاتێ ئێمە تەواوی ڕەوت، زیرەکی، داهێنانی بێ وێنە و زیرەکی ((خود)) دەبینین و دەبینین کە چۆن خۆی لە فاقەی شوناس، دشکردن، ئەزموون، باوەڕوزانستدا دەپێچێتەوە، کاتێ دەبینین کە زەین لە بازنەو قەفەزێکدا کە خود دروستیکردووە، دەجوڵێت چی ڕوودەدات؟ کاتێ ئێوە لێی ئاگادارن و بە تەواوی دەیناسن، ئایا بە شێوەیەکی بێوێنە لە هێمنیدا ناژین، نەلە ڕێگای زۆر، نەلە ڕێگای پاداشت و نەلە ڕێگای ترس؟ کاتێ بۆتان دەردەکەوێت کە هەرساتە وەختێکی زەین، تەنیا بە جۆرێ خود بەهێز دەکات، کاتێ سەیری دەکەن، دەیبینن، کاتێ بە تەواوی لە کردەوەدا لێی ئاگادارن، کاتێ بە بنەڕەتی مەسەلەکە دەگەن — نەلەڕووی ئیدولوژیکی یان زارەکی، نەلەڕێگای ئەزموون کردنی بەرجەستەکراو، بەڵکو لەکاتی بوون لەو دۆخەدا — ئەوا دەیبینن کەزەین بەتەواوی ئارامە، توانای خەلق و داهێنانی نییە. ئەوەی کە زەین خەلقیدەکات لەیەك بازنەدایە، لە مەیدانی خود دایە. لە کاتی خالق نەبوونی زەیندا، داهێنان هەیە، شتێ کە دەستنیشان ناکرێت.

ڕاستی یان دروستی شتێك نییە کە بیناسین، چونکە بۆ ئەوەی کە ڕاستی لە پەنجەرەوە بێتە ژوورێ، دەبێت باوەڕ، زانست، تەجروبەکردن، کەوتنە دوای خۆپارێزی و دشکردن، هەرهەمووی لە دەرگاوە بچنە دەرێ. کەسێکی دژکام و خۆپارێز کەدەزانێت. بەدوای خۆپارێزیدا دەروات، هەرگیز ڕاستی دەست ناکەوێت. لەوانەیە کەسێکی زۆرباش و نەجیم بێت، بەلاّم باش و نەجیم بوون لەگەڵ کەسێکی ڕاستەقینە و لەگەڵ کەسێ کە فام دەکات، بەتەواوی جیاوازە. بۆ پیاوی ڕاستی، راستی لە دایك بووە. مرۆڤی دژکام و خۆپارێزی مرۆڤێکە بە تەقوا و مرۆڤی بە تەقوا هەرگیزناتوانێت ڕاستی فام بکات. لەبەرئەوە خۆپارێزی و دژکردن بۆ ئەو ڕووپۆشێکە لەسەر((خود))، بەهێزێکە بۆ ((خود))وکاتێ دەڵێت: ((من دەبێت تەماحم نەبێت))، دۆخی نەبوونی تەماحێك کەئەو تەجروبەی دەکات، تەنیا خەریکی بەهێزکردنی خود دەبێت. کەوابوو چەندە گرنگە کەمرۆڤ هەژاربێت، چ لەماڵی دونیا چ لە بواری باوەڕ و زانستدا چ ئەوکەسەی کالاّی دونیایی هەیە و چ ئەوکەسەی کە زانست و باوەڕ جگە لە تاریکی نازانێت و ناوەندی تەواو خراپەکارییەکان و هەژارەکانە. بەلاّم ئەگەر ئێوە ومن - وەك — تاك بتوانین تەواو ئەوەی کە خود ئەنجامیدەدات، ببینین ئەوکات دەزانین عەشق چییە. من ئێوە دڵنیادەکەمەوە کە ئەمە تەنیا ڕیفۆرمێکە بە ئیحتیمالی زۆر دونیا تووشی ئاڵوگۆڕ دەکات. عەشق لە ((خود)) سەرچاوە ناگرێت. خود ناتوانێت عەشق بناسێت. دەڵێن ((من حەزدەکەم))، بەلاّم لە گوتن یان تەجروبەکردنی قسەیەکی وادا، عەشقێك نیە. بەلاّم ئەوکاتەی کە عەشقتان ناسی، خودبوونی نیە. کاتێ عەشق هەیە، ((خود)) نیە.

# فەسڵی دەیەم

## ترس

ترس چییە؟ ترس تەنیا لە پەیوەندی لەگەڵ شتێکدا کە گۆشەگیر نییە، پێکدێت. چۆن دەبێت لە مەرگ بترسین؟ چۆن دەبێت لە شتێ کە من نایناسم بترسم؟ کاتێ دەڵێم لە مەرگ دەترسم، ئایا بە ڕاستی لە شتێکی نەناسراو کە مەرگە، دەترسم، یان لەمەی دەترسم کە شتێ کە دەیناسم لە دەستی بدەم؟ ترسی من لە مەرگ نیە، بەڵکو لەمەیە کە پەیوەندیم لەگەڵ ناسراوەکان لە دەست بدەم، ترسی من بەردەوام لە پەیوەندی لەگەڵ ناسراوەکانە، نەك نەناسراوەکان.

هەنووکە پرسیاری من ئەوەیە کە چۆن دەبێت لە چنگی ترس — لە ناسراوەکان — کە بریتییە لە ترس لە دەستیدانی بنەماڵە، ناوبانگ، ئەخلاق، حەسیبی بانکی وهتد، ڕزگاربین. لەوانەیە بلێین کە ترس لە هەستی ڕواڵەتی سەرچاوە دەگرێت، بەڵام هەستی ڕواڵەتی ئێوە لەمەرجی بوونەوەی ئێوە سەرچاوە دەگرێت، کەوابوو، هەستی ڕواڵەتی هەم دیسان بەرهەمی ناسراوەکانە. من چی دەزانم؟ زانست یانێ هەبوونی بیرۆکەکان، هەبوونی باوەڕ دەربارەی کارەکان، هەبوونی هەستێکی بەردەوام وەك ئەوەی کە بۆ ناسراوەکان هەمانە و ئیتر هیچ... بیروکەکان بیرەوەرین کە بەرهەمی ئەزموونن و وەڵامن بە کێشەکان.من لە ناسراوەکان دەترسم کە ماناکەی ترسە، بە لەدەستدانی تاکەکان، تەنەکان یان خەیاڵەکان. لەوە دەترسم کە بەوەی بزانم کە چیم، لەوە دەترسم کە بەرەو هەڵد ێر بچم. لەوە دەترسم کە تووشی ئێش و ئازارێك بم کە کاتێك تووشم دەبێت کەشتێکم لە دەستدابێت یان شتێکم بە دەست نەهێنابێت، یان ئیتر لەزەتێکم بۆ نەماوەتەوە.

ترس لە ئازارە، ئازاری جەستەیی وەڵامی دەمارییە، بەڵام ئازاری ڕۆحی کاتێ پێکدێت کەمن بەوشتانەی دڵ ببەستم کە من ڕازی دەکەن، لەبەرئەوە ئەوکات لەوە دەترسم کەکەسێ یان شتێ ئەوانە (لەوانەیە) لەمن بگرێت. کۆکراوەکانی دەروونزانی تا ئەوکاتەی کە ئازار نەدرێن، دەبنە ڕێگری پێکهاتنی ئازاری ڕۆحی. بە واتایەکی تر، من کۆمەڵێکم لە



کۆکراوەکان، یانی ئەو ئەزموونانەی کەلەهەر چەشنە شێواوییەکی جددی بەرگیری دەکات و من نامەوێت بشێوم. کەوابوو لە هەرکەس کە ببێتە هۆی پەرێشانیم دەترسم. کەواتە ترسی من لە ناسراوەکانە، من لەوەی کە کۆمکردۆتەوە — جەستەیی و ڕۆحی — دەترسم، لەبەر ئەوە ئەوەی کە کۆمکردووەتەوە، قەڵغانێکە لە هەمبەرئازار و ئێشدا. زانستیش بەرئازار دەگرێت. هەروا کە زانستی پزیشکی دەبێتە هۆی بەرگری لە ئازاری جەستەیی، باوەڕەکانیش لە ئازاری ڕۆحی بەرگری دەکەن. لەم ڕووەوە، من لەمەی کە باوەڕەکانم لەدەست بدەم دەترسم، سەرەڕای ئەمەی کەمن زانستی تەواو یان بەڵگەیەکی قایم سەبارەت بە ڕاستی ئەم باوەڕانە لەدەستدا نیە. لەوانەیە هەندێ لەو باوەڕ و نەریتانەی کە خراونەتە میشکی منەوە، بە هۆی دەسەڵاتێ کە لە تەجروبە، متمانە و فامکردنی خۆم دەیگرم، ڕەتبکەمەوە. بەڵام ئەم باوەڕو زانستەی کە بەدەستم هێناوە، لە بنەڕەتدا یەکسانن، قەڵغانێکن بۆ دوورکردنەوەی ئازار.

ترس تاکاتێك کۆکردنەوەی ناسراوەکان هەیە و دەبێتە هۆی ترس و لەدەستدان، هەیە. کەواتە ترس لە نەناسراوەکان کەلەڕاستیدا ترسە لە لەدەستدان، هەیە. کەوابوو، ترس لە نەناسراوەکان لەڕاستیدا ترسە لە لەدەستدانی ئەو ناسراوانەی کە کۆکراونەتەوە.کۆکراوەکان بێ جیاوازی دەبنەهۆی ترس، ترسێ کە خۆی لە خۆیدا ئازارە و هەرئەو ساتەوەختەی کە دەڵێم: ((نابێت لەدەستی بدەم))، ترس دروستدەبێت. ئەگەرچی مەبەستی من لە کۆکردنەوە. دابینکردنی قەڵغانێکە لەبەرامبەر ئازاردا. خودی ئازار بەشێکی جیانەکراوەیە لە کۆکراوەکان. هەرئەوشتانەی کە هەمانە، بۆ خۆیان دەبنە هۆی ترس کەهەمان ئازارە.

ترس بەشێکە لە ڕەوتی کۆکردنەوە و باوەڕ بە شتێ، بەشێکە لە ڕەوتی تایبەت بە کۆکردنەوە. کوڕەکەم دەمرێت و من بە —تناسخ-- باوەڕم هەیە تا بەم شێوە لە ئازاری ڕۆحی زیاتر بەرگری بکەم. بەڵام لە یەکەیەکی ئەم ڕەوتانە گومان هەیە. لە دونیای دەرەوە خەریکی کۆکردنەوەی شتانێکم و شەڕ دروستدەکەم، لە دونیای ناوەوە، خەریکی کۆکردنەوەی باوەڕەکان دەبم و دەبمە هۆی ئێش وئازار. تاکاتێك بخوازم ئاسایشم هەبێت، حەسێبی بانکی و..... و چی وچیم هەبێت، تا کاتێك بمەوێت ببمە شتێ — چ لە ڕووی فیزۆلۆجیکی و چ لەڕووی ڕۆحی — بوونی ئازار چاوەڕوان کراوە. هەرئەوشتانەی کەلەوانە وەك قەڵغانی بەرگری لە ئازار کەڵك وەردەگرم، خۆیان پێکهێنەری ئێش و ئازاران.

ترس کاتێ دروستدەبێت کەمن ئارەزوو بکەم بچمە ناو نموونەیەکی تایبەتەوە. ژیانی بەبێ ترس، یانێ ژیانی بێ نموونەیەکی دیاریکراو و تایبەت. کاتێ من خوازیاری شێوازێکی تایبەت

لە ژیانم، خودی ئەم شێوازە تایبەتییەی ژیان، سەرچاوەی ترسە. گرفتی من حەز بەژیان لە چوارچێوەیەکی دەسنیشانکراودایە.ئایا من نا توانم ئەم چوارچیوە بشکێنم؟ کاتێ دەتوانم ئەم ئیشە ئەنجامبدەم کە راستی ببینم، یانێ ببینم کە نموونە بووەتە هۆی ترس و ترس دەبێتە هۆی بە هێزکردنی نموونە. ئەگەر بڵێم من دەبێت چوارچیوەکە بشکێنم، لەبەر ئەوە دەخوازم لە چنگی ترس رزگار بم، ئەوکاتە، من تەنیا لە نموونەیەکی تر پەیڕەویم کردووە کەدەبێتە هۆی ترسێکی زیاتر. هەرکردەوەیەك لەلایەن منەوە کەلەسەر بناغەی حەز بەشکاندنی سەر مەشق بێت، تەنیا نموونەیەکی دیکە بەرهەم دێنێت و ئاکامەکەشی ترسە. چۆن دەبێت چوارچیوەکە بێ دروستکردنی ترس، یانێ بەبێ هیچ کردەوەیەکی خۆویست یان خۆنەویست لەلایەن ئەوکەسەوە کە لە گەڵیدا پەیوەندی هەیە بیشکێنن؟ مانای ئەم قسەیە ئەوەیە کەمن نابێت ئەم ئیشە بکەم، من نابێت بۆ شکاندنی نموونە جووڵەیەك بکەم. کەوابوو، کاتێك من تەنیا بۆنموونە بڕوانم، بێ ئەوەی کە کارێك لەبارەیەوە ئەنجامبدەم، چی ڕوودەدات؟ دەبینم کەزەین خۆی نموونە و چوارچێوەیەکە و لە نموونەیەکی ئاساییدا کە خۆی دروستیکردووە، ژیان دەکات. کەواتە خودی زەین، ترسە. ئەوەی کەزەین ئەنجامیبدات، بە ئاراستەی بەهیزکردنی نموونەیەکی کۆن، یان زیادکردنی نموونەیەکی دیکەدا دەڕوات. یانێ ئەوەی کە زەین بۆ ڕزگاربوونی لە دەست ترس ئەنجامیدەدات بۆخۆی دەبێتە هۆی ترس.

ترس ڕێگەی دەربازبوونی جۆراوجۆر پەیدا دەکات. یەکێك لەوانە، هاوشێوەکردنە، هاوشێوەبوون لەگەڵ ولاَت، کۆمەڵگا یان بۆچوونێك. ئایا نەتانزانیوە کە کاردانەوەتان لە دیتنی ڕێو ڕەسمی بەڕێکردنی تەرمێك، مەراسیمی نیزامی (عەسکەری) یان مەزهەبی، یان کاتێك ولاَت لەمەترسی هێرشدایە چییە؟ لەوکاتەدا خۆتان لەگەڵ ولاَت، لەگەڵ بوونێك یان ئیدۆلۆژێك، یەکسان و هاوجێ دەکەن.هەندێ جاریش خۆتان لە گەڵ منداڵ، هاوسەر یان لەگەڵ چوارچێوەیەکی دیاریکراو لە کردەوە یان بێ کردەوەیی هاوشێوە دەکەن. هاوشێوەکردن، پڕۆسەیەکی خۆ لەبیرکردنە. تاکاتێکە من لە (من) کەدەیناسم ئاگادارم، ئێش و ئازار و تێکۆشان وترسی بەردەوام هەیە. بەلاَم ئەگەر خۆم لەگەڵ شتێکی گەورەتر، بەنرخ، جوانی،ژیان، ڕاستی، باوەڕوزانست هاوشێوە بکەم، لایەنی کەم بە شێوەی کاتی، ئەوکاتەی ڕێگەی دەبازبوونێکم بۆ (من) پەیداکردووە. قەبووڵتانە؟

ئەگەرمن سەبارەت بە (ولاَتی خۆم)) قسەبکەم، بەشێوەی کاتی خۆم لەبیرکردووە. ئەگەربتوانم خۆم لەگەڵ خزمم، گرووپێك، حیزبێك، کەسێك یان ئیدولوژیکێکی دیاریکراو



هاوشێوە بکەم، ئەوجا ڕێگە دەرباز بوونێکی کاتیم پەیداکردووە. کەوابوو، هاوشێوەکردن شێوازێکی هەلاَتنە لەخود. تەنانەت دەرکردن و خۆپارێزی جۆری هەلاَتنە لەخود. کەسێ کە بەدوای خۆپارێزی و دشکردنەوەیە، لەخود هەڵدێت و کەسێکی بەم جۆرە بیرتەسکە. شتێکی وا زەینی خۆپارێزودژکام نییە، لەبەرئەوە خۆپارێزی شتێك نییە کە زەین بتوانێت شوێنی بگرێت. هەرچی زیاتر هەوڵ لە خۆپارێزبووندا بدەن، زیاتر بوونەتە هۆی بە هێزکردنی خود و (من). ترس کەبە شێوازی جۆراوجۆر بۆ ئێمە ئاسایە، دەبێت بەردەوام جێگرێك پەیدابکات و دەبێت تێکۆشانی ئێمە زیاتربکات. هەرچەند لەگەڵ جێگرێکدا هاوشێوەتر بن، دەسەلاَتێکە پشتی پێدەبەستێت لە ڕێیدا تێدەکۆشن و خۆتان بەخت دەکەن، زیاترە، لەبەرئەوە ترس لە پشتەوە خۆی حەشارداوە. ئایا دەزانین ترس چییە؟ ئایا ئەمە قەبووڵ نەکردنی(ئەوەی هەیە) نیە؟ ئێمە دەبێت بە وشەی (وەرگرتن)شارەزابین. من ئەم وشە بەمانای کۆشش بۆ قەبووڵکردن بەکارنابەم. کاتێ من لە (ئەوەی هەیە) تێگەیشتنی هەستیاریم هەیە، ئیتر مەسەلەی وەرگرتن، بێمانایە. کاتێ من (ئەوەی هەیە) بە ئاشکرا نابینم، ئەوکات ڕەوتی وەرگرتن دێنمە ناو.

چۆن من، منێ کە کۆمەڵەیەك لە هەموو ئەم کاردانەوانە، وەلاَمانە، بیرەوەریانە، ئەم هیواو خەمۆکی و بێدەستکەوتیانەم، منێ کە ئاکامی جووڵەی خۆویستم کە ڕێگای بەربەستکراوە، دەتوانم لەمانە ئەولاتر بڕۆم؟ئایا زەین دەتوانێت بەبێ ئەم بەربەست وڕێگرانە، هۆشیاربێت؟ بەخۆشی بیوێنە، کاتێ دەزانین کە کۆسپێك نەبێت. مەگەر نازانن کاتێ لەش تەندروستی تەواوی هەیە، جۆری خۆشی و خۆشگوزەرانی هەیە؟ مەگەر نازانن کە کاتێ زەین بە تەواوی سەربەست و بێکۆسپە. کاتێ ناوەندی وێناکردن و دووبارە ناسی کە (من)ە لە وێدانییە، ئێوە خۆشییەکی تایبەت بە تەجروبە دەکەن؟ ئایا ئەم دۆخەتان لە نەبوونی خود — دا تەجروبە نەکردووە؟ گومانێك نیەکە هەمووومان تاقیمان کردۆتەوە؟

فامی خود و ڕزگاری لەو تەنیا کاتی مەیسەرە کەمن بتوانم بەگشتی و بەتەواوی یەك پارچە بۆی بڕوانم و ئەنجامی ئەم کارە تەنیا کاتێ مەیسەرە کە من بە ئاراستەیەکی گشتی تەواو ئەو چالاکیانەی کەبەرهەمی ئارەزوویەکە کە خۆی دەربڕی بیرکردنەوەیە، شارەزابم. لەبیرنەکەن کە بیرکردنەوە و ئارەزوو پێکەوە جیاوازییان نییە - ئەگەرمن بتوانم بەبێ پاساو، بێ مەحکووم کردن و بێ سەرکوتکردن فامی بکەم، ئەوا لە ئیمکانی چوون بۆ ئەپەڕی سنوورو بەربەستەکانی خۆم، ئاگاداردەبم.

# فەسڵی یانزەیەم

## سادەیی

دەمەویت بە باسکردن لەسەر سادەیی، لەوانەیە لە مەسەلەی حەساسیەتیشدا وردبینییەکم هەبێت، بە ڕواڵەت سادەیی بە لای ئێمەوە تەنیا جۆرێ خۆرانانی دەرەوەیی یان پاشەکشەیە؛ یانێ هەبوونی هەندێ شتی دونیایی، نەبوونی خانوو، جل و بەرگی کەم لەبەرکردن و هەبوونی پارەیەکی کەم لە بانکدا و..........، بێگومان ئەمە سادەیی نیە. ئەمە تەنیا خۆرانانێکی دەرەوەیە. سادەیی بە لای منەوە شتێ پێویستە، بەڵام کاتێ پێکدێت کە ئێمە چەمکی خۆناسینمان فام کردبێت.

سادەیی تەنیا هاوجێبوون لەگەڵ نموونەیەکدا نیە. بۆسادە بوون زیرەکی زۆر پێویستە، نەتەنیا خۆگونجاندن لەگەڵ نموونەیەکی تایبەتدا، ئەمەی کە ئەمە نموونەیە کە لەڕووی نمایشی دەرەوەیی تاچ ڕادەیەك بەبایەخ بێت، جیاوازی نیە. بەداخەوە هەمووومان سادەبووین لە خۆرانان و نمایشی ڕواڵەتی ولە کاروباری دەرەکیدا دەیبینین. هەبوونی هەندێ شتی دونیایی، ڕازیبوون بە بڕ و ڕێژەی کەم و بەوێچوونی دابەشکردنی ئەم کەمانەش لەگەڵ ئەوانی تردا، بەپێی بارودۆخ سادەترە، بەڵام تەنیا نمایشی دەرەوەی سادەیی لە تەنەکان و شتە بەستراوەییەکان بەخۆ، بەهیچ جۆر بەمانای هەبوونی سادەیی دەروونی نیە. لەبەرئەوە ئەو جۆرەی کە بارودۆخی ئەمڕۆژەی دونیایە، هەرڕۆژە لە دەرەوە شتێ زۆرتر بە سەر ئیمەدا دەسەپێت. ژیان بەردەوام پێچاوی زیاتر پەیدادەکات و ئێمە بۆ هەڵاتن لەدەست ئەم ژیانە، بە چاوپۆشیکردن و جیابوونەوە لە تەنەکان — وەك ئوتوموبیل، خانوو،سینەما و لە هەلومەرجێکی بێژمار کە لەدەرەوە بە سەرماندا سەپاوە خەریك دەبین. هەستدەکەین بە پاشەکشێکردن بەسادەیی دەگەین، پاکەکان و مامۆستایانێ کە تەرکی دونیاییان کردووە و بەڕای من ئەم جۆرە چاوپۆشیکردنە لە دونیا، لەلایەن هەرکەسەوە بێت، گرفتەکە چارەسەر ناکات. ئەو جۆرە سادەییە کە ڕاستەقینە و بنەڕەتییە، تەنیا لە دەروونەوە دروستدەبێت و نمایشێکی دەرەوەشی هەیە. کەواتە، گرفت ئەوەیە کە چۆن دەبێت سادە بێت، لەبەر ئەوە ئەم چەشنە سادەییە، مرۆڤ



هەرچی زیاتر هەستیاردەکات. بوونی زەین ودڵی هەستیار پێویستە، لەبەر ئەوە تێگەیشتن و وەرگرتنی خێرا لەو بارودۆخەدا مەیسەر دەبێت.

بەدڵنیاییەوە مرۆڤ دەتوانێت لەڕێگای تێگەیشتن لە کۆسپەکان، شتی تایبەت بە خۆ و ئەو ترسە زۆرانەی کەهەیەتی، لە دەروونەوە سادەبێت، بەڵام زۆرێك حەزدەکەن لە زیندانی جەماوەر، شتە دونیاییەکان و خەیاڵەکان دیل بن. ئێمە پێمان خۆشە زیندانی بین. ئێمە لە دەروونەوە زیندانین، گەرچی کەلە دەرەوە زۆر سادەین. ئێمە لە دەروونەوە زیندانی ئارەزووەکان، داخوازییەکان، خەیاڵ و پاڵنەری بێژمارین. سادەیی بێجگە لە کاتێ کە تاك لە دەروونەوە سەربەست بێت، ناکرێ گیری بێنین، کەوابوو دەبێت لە دەروونەوە دەست پێبکات نەلە دەرەوە. کاتێ مرۆڤ بە تێگەیشتنی تەواوی پرۆسەی باوەڕو ئەمەی کە بۆچی زەینی مرۆڤ بەباوەڕێك بەسترایەوە، دەگات، ئازادییەکی بێوێنەی بەنسیب دەبێت. هەرکات لە چنگ باوەڕەکان ڕزگاربین. گەیشتوین بە سادەیی، بەڵام سادەیی پێویستی بە زیرەکی هەیە و زیرەکی پێویستی بەوە هەیە کەتاك لە کۆسپەکانی سەرڕێگای خۆی ئاگاداربێت. بۆ ئاگاداربوون دەبێت تێڕامانی بەردەوامت هەبێت وخۆت لە هەرشێوەیەکی ئاسایی و لەهەرسەرمەشقێکی دیاریکاوی فیکری و کردەوەیی نەگۆڕ نەهێڵێتەوە. کەوابوو مرۆڤ لە دەروونەوە هەرجۆربێت کاریگەری لە دەرەوە دادەنێت. کۆمەڵگا یان هەرکردەوەیەك نموونەیەکە لە خودی ئێمە و تا کاتێ کە خۆمان لەدەروونەوە نەگۆڕین، یاسادانانی ڕووت مانای دەرەوەیی و ئەوتۆی نیە. هەڵبەت لەوانەیە ببێتە هۆی چاکسازی و پاکتاوی دیاریکراو. بەڵام لایەنی دەروونی مرۆڤ هەمیشە بەسەرلایەنی دەرەوەیدا سەردەکەوێت. ئەگەر مرۆڤ لە دەروونەوە تەماح کاروفرەخواز بێت و بەدوای خەیاڵی تایبەتدا بڕوات، پێچیاوی دەروونی، هەرچەندەش بە وردبینییەوە داڕێژرابێت، سەرئەنجام کۆمەڵگای دەرەوە سەرە و نخون دەکات دەیرووخێنێت. کەوابوو دەسپێکی کاری مرۆڤ دەبێت لە دەروونەوەبێت، بێلێدەرکردن یان قەبووڵ نەکردنی دونیای دەرەوە، بێگومان بە فامکردنی دونیای دەرەوە و تێگەیشتن لە چۆنیەتی بوونی پارادۆکس، ئیش، کێشمەکێش لەم دونیا. بەفامکردنی دونیای دەروون دەگەین. توێژینەوەی زیاتری مرۆڤ لە دەروونی خۆی، لەڕاستیدا جۆرە بارودۆخێکی دەروونی دروستدەکات کە بۆخۆی دەبێتە هۆی پارادۆکس و بەلاکانی دەرەوە. ڕانان و نمایشی دەرەوە تەنیا نموونەیەك لە بارودۆخی دەروونییە. بەڵام بۆ تێگەیشتن لە بارودۆخی دەروونی مرۆڤ دەبێت لە دەرەوە دەستپێبکات. زۆربەی ئێمە

هەرئەم ئیشە دەکەین. بەفامی دونیای دەروون — بێ لێدەرکردنی یان حاشا کردنی دونیای دەرەوە، بەڵکو بە فامی دەرەوە و گەیشتن بەدەروون — تێدەگەین کەهاوکات لەگەڵ دەسپێکی لێکۆڵینەوە لە پێچاوییەکانی دەروونی بوونی خۆمان، زیاتر لە ڕابردوو هەستیارو ئازاد دەبین، هەرئەمە سادەیی دەروونییەوە کە زۆرگرنگە، لەبەرئەوە ئەم سادەییە حەساسییەت دروستدەکات. زەینێ کە هەستیار، وشیارئاگادارنییە توانا بە وەرگرتن و هیچ کردەوەیەکی ئەخلاقی نابێت. لەسەریەك دانان و هاوجێکردن، وەك ئامرازێك بۆسادەکردنی ئێمە، لەڕاستیدا زەین و دڵ لێڵ و ناهەستیاردەکات. هەرچەشنە زۆرێکیدا سەپێنراو لەلایەن دەوڵەت، تاك، ئامانج، سەرکەوتن و شتێ لەم جۆرە، هیچ چەشنە هاوجێ کردنێکی تئوری، جیا لە دروستکردنی حەساسیەت نیە. لەبەرئەوە لە دەروونەوە سادەنییە. لەوانەیە کە ئێوە لە دەرەوە هاوجێکردن پێکبێنن و سادەیی ڕواڵەتی لە خۆنیشان بدەن، هەروا کە زۆرێك لە مەزهەبییەکان وا نیشاندەدەن. ئەوان کەڵك لە ئیسمی جۆراوجۆر وەردەگرن، دەڕۆنە ناوڕێکخراوی جۆراوجۆرەوە، بەشێوەیەکی تایبەت خەریکی بیرکردنەوە دەبن و کاروباری لەم چەشنە، هەرهەموو، ڕواڵەتێکی سادە لە خۆنمایش دەکەن، بەڵام ئەم لەسەریەك دانان و هاوجێکردنە، سادەیی نیە.

هیچ چەشنە زۆرێك بەسادەیی ناگات. بەپێچەوانە، سەرکوتی زیاتروجێنیشنکردنی زیاتر بەدوای خۆیدا دێنێت. هەرچەندە سەرنجدان بە گرفتی گشتی زیاتربێت، سادەیی کەمترە. بەڵام هەرچی زیاتر بەسەر ئاراستەی سەرنجدان بەگرفتی گشتی، سەرکوتی جێنشینی شارەزابن ئیمکانی سادەبوونی ئێوە زیاتر دەبێت. گرفتەکانی ئێمە — گرفتی جڤاکی، ژینگەیی، سیاسی، مەزهەبی — ئەوەندە پێچاوین کەتەنیا ڕێگەی بازکردن و چارەسەریان، سادەبوونە، نەبوونی سەرتری و هۆشی بێوێنە. مرۆڤی سادە لە مرۆڤی پێچاوی سەر ڕاست تر دەبینێت و ئەزموونێکی ڕاستەوخۆتری هەیە. زەینی ئێمە لە زانستی بەربلاوی ڕاستییەکان، لەوەی کەخەڵکانی تر گوتوویانە، ئەوەندە شلۆق و قەرەباڵغە کە ئێمە ئیتر توانای سادەبوون و هەبوونی ئەزموونی ڕاستەوخۆمان نییە.. ئەم گرفتانە شێوەی هەڵسوکەوت و ڕووبەڕووبونەوەی نوێ داوا دەکەن و کاتێ دەکرێت لەگەڵیان بەم چەشنە بجووڵێیتەوە کە ئێمە لە دەروونەوە بەڕاستی سادە بین. ئەم سادەییە تەنیا لە ڕێی خۆناسی لە ڕێگای فامی خود و شێوازی بیرکردنەوە و هەستکردن، جموجۆڵی فیکر، کاردانەوەکان، وشێوازی لەسەریەکدانان، لەڕێگای ترس، باوەڕی گشتی و باوەڕ بەوەی کە ئەوانی تر دەڵێن، ئەوەی کە بوودا، مەسیح و گەورە پاکان گوتوویانە، بەرهەم دێت



کەتەواوی ئەوانە نیشانەی سروشتی ئێمەیە بۆ هاوجێبوون و هەبوونی هێمنی و ساغ بوون. کاتێ کەسێ بەدوای ئاسایشەوەیە، بەڕاشکاوی لە بارودۆخێکی ترسدایە، کەوابوو، سادەییەك نیە.

هیچ کەس بەبێ هەبوونی سادەیی ناتوانێت هەبێت نەبە درەختەکان، نەبە باڵندەکان، نەبە کێوەکان، نەبەبا، نەبە هیچ شت و هیچ کەس کەلە دەوروبەرمان لە دونیا لە جووڵاندان — ئەگەرکەسێ سادە نەبێت، ناتوانێت بەپەیوەندی و نزیکی دەروونی کارەکان، هەستیاربێت. زۆربەی ئێمە بەچەشنێکی زۆر ڕووکەشیانە لەچینی سەرەوەی هەستی خۆماندا ژیان دەکەین. لەوێدا هەوڵدەدەین بیرەوەرو خاوەن ڕابین کە ئەم کارە لەگەڵ مەزهەبی بووندا یەکێکە. لەوێدا هەوڵدەدەین زەینمان لە ڕێگای زۆر و دیسپلین، سادە بکەینەوە، بەڵام سادەیی ئەمەنییە. کاتێ چینی سەرەوەی زەین ناچار بەسادەبوون دەکەین، ئەم زۆرە تەنیا دەبێتە هۆی قیرسیچمەیی زەین، نەخۆگونجێنی دەکات، نەڕوون و چالاك. سادەبوون لەڕەوتی گشتی و تەواوی هەستدا، کارێکی زۆر دژوارە، لەبەرئەوە هیچ چەشنە حاشالێکردنێك دەروونی نابێت ببێت. بۆ گیرهێنان، بۆ بەدوادا گەڕان لە ڕەوتی بوونی ئێمە کەماناکەی هۆشیارییە لەهەمبەر دۆستی و نزیکی و ئاماژەدا؛ هۆشیاری لەهەمبەر ترسەکان و هیواکان و هۆشیاری بۆ توێژینەوە وڕزگاری زیاترو زیاتر لە چنگی ئەوانە. تەنیا لەوحاڵەدا، یانێ کاتێ کەزەین و دڵ بەڕاستی سادەن و لەچینێکی سەخت دانەپۆشرابن، دەتوانین زۆربەی ئەو گرفتانەی کە لەگەڵی بەرەو ڕووین، چارەسەربکەین. زانست گرفتەکانی ئێمە چارە سەر ناکات، بۆنموونە لەوانەیە ئێوە لە -- تناسخ --ئاگادارن و بزانن کەلەدوای مەرگ، بەردەوامی هەیە. دەڵێم لەوانەیە، نالێم کە ئێوە ئاگادارن، یان لەوانەیە کەئێوە قەبووڵتان بێت. بەڵام ئەمە گرفتێك چارەسەرناکات. بیرۆکە و بەڵێن وزانیاری ئێوە، مەرگ لە قەفەزدا زیندانی ناکات. ئەم ڕەوتە پڕنهێنی تر، قووڵتر و ئاشکراتر لەم قسانەیە. مرۆڤ دەبێت توانای توێژینەوەی دووبارەی هەموو ئەم کارانەی ببێت، لەبەرئەوە تەنیا لەڕێگای ئەزموونی ڕاستەوخۆدایە کە گرفتەکانی ئێمە چارەسەردەبێت و بۆ هەبوونی ئەزموونی ڕاستەوخۆ، پێویستیمان بە سادەبوونە کە مانای ئەوەیە حەساسییەت دەبێت ببێت. قورسی زانست، زەین قورس دەکات، هۆکاری لێڵی زەینی رابردوو و داهاتووە. تەنیا زەینێکە توانای خۆگونجاندنی لەگەڵ ڕانەبردوودا هەیە، بەبەردەوامی و چرکە بەچرکە دەتوانێت لەگەڵ کاریگەریەکان و

گوشارە بەتەووژمەکان کەبە بەردەوامی لە لایەن دەوروبەرەوە پەستان دەخاتە سەری، بەرەو ڕوو ببێتەوە.

کەوابوو، تاکی مەزهەبی تاکێ نییە کە عابا بەسەرشانیدا دەدات یان لونگ[1] دەبە ستێتەپشت، یان ڕۆژێ جارێك خواردن دەخوات، یان ئەمەی کە سوێندی بێژماری خواردووە کە ئەمە نەبێت و ئەوە بێت بەڵکو ئەوتاکەیە کە لە دەروونەوە سادەیە، ئەوتاکەیە کە بە شتێك دەگۆڕێت. زەینێکی بەم جۆرە، وەرگرتنی بێوێنەی هەیە، لەبەرئەوە کۆسپێ لە ئارادا نیە، ترس نیە، جووڵانێك بەرەولای شتێك ڕوونادات. کەوابوو توانای گرتنی بەخشش، گەیشتن بە خالق و ڕاستی و ئەوەی کە ئیرادە بکات، هەیە. بەڵام زەینێکە بەدوای بەدەستهێنانی ڕاستیدا دەڕوات، زەینێکی سادەنییە.

زەینێ کە لە جموجۆڵ دایە،،خەریکی دۆزینەوەی ڕێگایە و ورووژاوە، زەینێکی سادە نیە. زەینێ کە لەگەڵ هەرنموونەیەکی بەهێز— چ لە دەروون و چ لە دەرەوە--- هاوجێ دەبێت، ناتوانێت سادەبێت و تەنیا کاتێکە زەین بەڕاستی هەستیار، هۆشیار، ئاگادارلە هەموو ڕووداوەکان، وەڵامەکان و بیرکردنەوەکانی خۆی بێت، کاتێ کە ئیترکرانێك لە ئارادانییە، ئیتر خۆی بۆ ئەوەی کە شتێ بێت، ئامادە ناکات؛ تەنیا لە و کاتەدایە کە توانای گرتنی ئەوەی کە ڕاستی بێت، هەیە. تەنیا لەو کاتەدایە کە دەتوانێت بەختەوەری بوونی هەبێت، لەبەر ئەوە بەختەوەری ئامانج نیە، بەڵکو ئەنجامی ڕاستییە. کاتێ زەین ودڵی سادە، هەستیاربوون — ئەڵبەت نە لەڕێگای زۆر، ڕێنوێنی یان سەپاندن — ئەوکات دەبیینین کە دەکرێ لەگەڵ گرفتەکاندا بەئاسانی ڕووبەڕوو ببێتەوە. هەرچەندە گرفتەکانی ئێمەش پێچاوپێچ بن، دەتوانین بەشێوازێکی تازە لەگەڵیان بەرەو ڕوو ببینەوەو بەجۆرێکی جیاواز کۆنترۆڵیان بکەین. ئەوەی کە ئەمرۆ خوازیارین خەڵکێکە کە بتوانن لەگەڵ ئەم شێواوییەی دەرەوە، بشێوی و دوژمنی لەسەرتاوە و بە چەشنێکی داهێنەرانە و ئاسان بەرەو ڕوو ببنەوە. نەبە تیۆری و یاسا، چ تایبەت بە چەپ یان ڕاست بێت، ئەوکەسەی کەسادە نیە. توانایی لە نوێ بەرەوڕووبوونەوەی لەگەڵ ئەم کارانەدا نییە گرفت کاتێ دەتوانێت چارەسەربێت کە بەرەو ڕووبونەوەمان بەم چەشنە بێت. ئەگەر هاتوو ئێمە لەسەر بنەمای نموونەکانی فیکری، مەزهەبی، سیاسی، یان هەرچەشنە سەرمەشقێکی

١- نەریتی هیندوکان



تایبەتی دیکە، بیربکەینەوە، ناتوانین لەگەڵ گرفتدا، بەرەو ڕووبوونەوەیەکی نوێمان هەبێت. کەواتە، بۆسادەبوون دەبێت لە کۆت و داوی هەمووی ئەمانە ئازاد بین. هەربۆیە کە وشیاربوون، هەبوونی توانای فامی ئاڕاستەی بیرکردنەوەی خۆ و خۆ بە تەواوی ناسین، زۆربایەخی هەیە؛ لەبەرئەوە سادەیی لەوەوە سەرچاوە دەگرێت و (تواضع) کە خۆپارێزی و مەشق نییە، لەوەوە بوون دەگرێت. ئیتر لێبوردەیی بەرهەمی شتێك نییە بە ناوی لیبوردەیی زەینێ کەخۆی لێبوردە دەکات، زەینێ نییە کە ئیترلێبوردە بێت لێبوردەیی تەنیا کاتێك لیبوردەییە کە مرۆڤ خاوەنی ئەوە بێت، پەروەردەکراو نەبێت، ئەوکاتەیە کەمرۆڤ دەتوانێت لەگەڵ کارە بەپەلەکانی دونیا بەرەو ڕووببێتەوە. لەبەرئەوە لەوکاتەدا، تاك گرنگ نیە، لەبەر ئەوە ئەو لە دەروونی گوشارەکان و هەستی گرنگی خۆیەوە ناڕوانێت، بەڵکو بۆ گرفتە کە لەبەر خودی گرفتە کە دەڕوانێت و ئەوکاتەیە کە دەتوانێت چارەسەری بکات.

# فەسڵی دوانزەیەم

## هۆشیاری

ناسینی خۆ یانیٚ ناسینی پەیوەندی خۆ لەگەڵ دونیا — نەتەنیا لەگەڵ دونیای خەیاڵ و خەڵك، بەڵكو لەگەڵ سروشت و ئەوشتەی كە خاوەنین — ژیان یانیٚ پەیوەندی لەگەڵ هەموو شتێك و هەمووكەس. ئایا فامی ئەم پەیوەندییە پێویستی بە پسپۆڕی هەیە؟ ڕوونە كەوانییە. ئەوەی كەپێویستی هەیە، هۆشیارییە، هۆشیاری بۆبەرەو ڕووبونەوە لەگەڵ دونیا وەك گشتێك. چۆن دەكرێت هۆشیاربین؟ ئەمە گرفتی ئێمەیە. چۆن تاك دەتوانێت هۆشیاری پێویستی هەبێت، ئەگەر بكرێت ئەم وشەیە بەكاربەریت بێئەوەی كە مەبەستت لایەنی پسپۆڕی بێت؟ چۆن دەكرێت مرۆڤ بۆ بەرەو ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دونیا وەك گشتێك ئامادە بكرێت؟ كەماناكەی نەتەنیا پەیوەندی تایبەتی لەگەڵ دراوسێیە، بەڵكو لەگەڵ سروشتیش، لەگەڵ ئەوەی كە بە ئێوە بە بەستراوەیی هەیە. خەیاڵەكان و ئەوەی كە زەین وەك خەیاڵاتی هیچوپوچ، ئارەزوو وشتانێكی لەم چەشنە، تەزویر دەكات. چۆن تاك دەتوانێت لەم ڕەوتە گشتییەی پەیوەندی ئاگاداربێت؟ گومانێك نییە كە ژیانی ئێمە ئەمەیە. ژیانیٚ بیٚ پەیوەندی بوونی نییە و فامی ئەم پەیوەندییە، ماناكەی گۆشەگیربوون نیە. بە پێچەوانە دووبارە ناسی تەواو یان هۆشیاربوون لە ڕەوتی گشتی پەیوەندی دەخوازێت.

چۆن تاك دەبێت هۆشیاربێت؟ چۆن ئێمە لە شتێك ئاگاداربین؟ چۆن ئێوە لە پەیوەندی لەگەڵ خود ئاگاداردەبن؟ چۆن ئێوە لە بوونی درەختەكان و لە ئاوازی باڵندەكان ئاگاداردەبن؟ كاتیٚ ڕۆژنامەیەك دەخوێننەوە، چۆن لە كاردانەوەی خۆتان ئاگاداردەبن؟ ئایا ئێمە لە وەڵامە ڕواڵەتییەكانی زەین، بەچاكی وەڵامە دەروونییەكان ئاگادارین؟ بەڕاستی چۆن لە شتیٚ ئاگاداردەبین؟ سەرەتا لە وەڵامی تایبەت بە پاڵنەرێك كەڕاستییەكی ڕوونە،ئاگادارین. درەخت دەبینین و جۆریٚ وەڵام، جۆریٚ هەست، پەیوەندی ناسین و حەز لە ئێمەدا پێكدێت. ئەمە ڕەوتی ئاساییە، وا نییە؟ ئێمە دەتوانین ئەوەی كە لە كردەوەدا ڕوودەدات، بێخوێندنەوەی هیچ كتێبیٚ سەیر بكەین.



كەواتە، لەزەت و ئازار لە ناسیندایە. "توانایی" یانیٚ نیگەرانی ئێمە سەبارەت بە لەزەت و دووری لە ئازار، جیا لەمەیە؟ ئەگەر ئێوە ئۆگریتان بەشتیٚ بێت، ئەگەر بە ئێوە چێژبدات، توانایی دەستبەجیٚ دروستدەبێت، ئاگاداربوون لەوڕاستییە، دەستبەجیٚ پێكدێت و ئەگەر ئێش و ئازاربدات. "توانایی" دووری كردن لێی لە ئێمەدا دروستدەبێت. تاكاتێك كە ئێمە بۆ فامی خود چاومان لە "توانایی" بێت، هەستدەكەین سەركەوتن بە نسیومان نابێت، لەبەر ئەوە فامی خود پەیوەندی بە تواناییەوە نیە.توانایی تەكنیكیٚ نییە كە ئێمە دروستی بكەین، پەروەردەی بكەین و لەماوەی زەمان و دووبارە بوونەوەیدا، لێی زیادبكەین. بێگومان، ئەم لە خود ئاگاداربوونە ناكرێت لە كردەوە و پەیوەندیدا تاقیبكرێتەوە. دەكریٚ لە شێوازی قسەكردن و ڕەفتاری ئیمەدا تاقیبكرێتەوە. خۆتان بیٚ هیچ چەشنە هاوچەشنێك، بیٚ بەراورد، بیٚ مەحكووم كردن، سەیربكەن، تەنیا سەیربكەن، دەبینین كە ڕووداوێكی بێوێنە ڕوودەدات، نەتەنیا بە چالاكییەك كە خۆ نەویستە، كۆتایی دێنن — لەبەرئەوە زۆربەی ڕەفتارەكانی ئێمە خۆنەویستانەیە — بەڵكو لەمەش پێشتر دەڕۆن و لە پاڵنەرو ورياكەرەوەكانی كردەوەش، بیٚ لێكۆڵینەوە و بە دواداچوون لەودا، ئاگاداردەبن.

كاتیٚ هۆشیارن، تەواوی ڕەوتی بیركردنەوە و كردەوە دەبینن، بەڵام شتی وا تەنیا لە حاڵە تێكدا ڕوودەدات كە مەحكوومكردنی لە ئارادا نەبێت. كاتێك شتێك مەحكووم دەكەین، فامی ناكەین، ئەمەیە یەكیٚ لە ڕێگەكانی دووری كردن لە هەرچەشنە فامكردنێك. هەستدەكەم زۆربەی ئێمە ئەم ئیشە بە ئەنقەست ئەنجامدەدەین، گورج مەحكووم دەكەین و هەستدەكەین كە فاممان كردووە. لە حاڵێكدا ئەگەر مەحكوومی نەكەین، بەڵكو سەرنجی بدەین، لێی ئاگاداربین، سەرەنجام،چەمك و نێوەڕۆكی ئەو كردەوە هێدی هێدی ڕوون دەبێتەوە ئەمە تاقیبكەنەوە و ئەوكات خۆتان بەرچاو ڕوون دەبن. تەنیا هۆشیاربن — بی هیچ هەستی بەڕاست زانینێك — گەرچی لەوانەیە بەڕواڵەت نەرێنی بێتە بەرچاو، بەڵام وانییە. بەپێچەوانەوە، چۆنایەتییەكی پاسیڤی هەیە كە ناوی كردەوەی ڕاستەوخۆیە و بۆدۆزینەوەی دەبێت تاقیبكەیتەوە.

كەوابوو بۆ فامی شتیٚ دەبێت دۆخێكی پاسیڤت هەبێت. ناكرێت بەردەوام دەربارەی بیربكەیتەوە و پەنا بەریتە بەر شیمانە و مەزەندە كردن، یان دەربارەی لێكۆڵینەوە بكرێت. هەبوونی حەساسییەتی پێویست بۆ وەرگرتنی ناوەڕۆكەكەی، بەسە.وەك لاپەڕەی نگاتیڤی فلیمی ڕەسم. ئەگەرمن حەز بە فامی ئێوە بكەم، دەبێت هۆشیاری من بەرامبەر بەئێوە

پاسیڤ بێت. لەوکاتەدا ئێوە تەواوی سەرگوزوشتەی خۆتان بۆمن دەڵێن، بێگومان ئەم مەسەلە بە توانایی یان پسپۆڕبوون پەیوەندی نیە. لەم ڕەوتەدا ئێمە هێدی هێدی خود دەناسین، نەتەنیا چینەکانی سەرەوەی هەستمان، بەڵکو چینەکانی هەرە خوارتریش کە زۆرگرنگن. لەبەر ئەوە تەاوی وریاکەرەوەکان، نییەتەکان، داخوازیەسەرلێ شێواوو شاراوەکان، دڵەراوکی، ترسەکان و ئارەزووەکانی ئێمە لەوێدا شاراوەن. لە دەرەوە لەوانەیە هەموو ئەمانە لە کۆنترۆڵی ئێمەدا بن، بەلاّم لە دەرووندا ئەوانە لەو پەری جموجۆڵ دان. تا ئەوکاتە کە لەڕێگای وشیارییەوە، ئەم کاروبارانە بەتەواوی فام نەکرێن، گومانێك نییە کە ئازادی، بەختەوەری و هۆشمەندی بوونی دەرەوەیان نابێت. ئایا وشیاری پەیوەندی بە پسپۆڕییەوە هەیە؟ مەبەست لەوشیاری، یانێ ئاگاداری تەواو لەڕەوتی بوونی مرۆڤ و ئایا پەروەردەکردنی تاکەکان لە ڕێگای بە پسپۆڕکردنیان، ناوی وشیارییە؟ لەبەرئەوە ئەوەی کەلەدونیا خەریکە ڕوودەدات، هەرئەمەیە؛ پێتان وایە جیا لەمەیە؟ ئێمە ئەم جۆرە بیرکردنەوە لە تەواوی پسپۆڕییەکان، پزیشکی، ئەندازیاری، پیشەسازی، کاسپی وبازرگانی، ئوستادی و قەشەبوون — دەبینین.

بۆ تێگەیشتن لە باشترین شێوەی وشیاری کە هەقیقەتە و خواوەندی نەمر، یانی ئەوەی کە وەسف ناکرێت. بەڵێ بۆفامی شتێکی وا، هەستدەکەین کەدەبێت پسپۆڕبین. کەوابوو خەریکی موتالاّ و جۆست وجۆ دەبین، و لەسەر شێوازی بیرکردنەوە و روانینی پسپۆڕان دەست بە خوێندنەوەی خۆمان دەکەین، تا بەم جۆرە توانایەك گیربێنین کە ئێمە لە کردنەوەی گرێ کوێرەی ناکۆکی و بەلاّکان یارمەتی بدات.

گریمان کەلە وشیاریش بێ نسیو نەبین، گرفتی ئێمە ئەوەیە کە ئایا دەتوانین ناکۆکی، بەلاّ و خەمەکانی ژیانی ڕۆژانەمان بەیارمەتی ئەوانی تر چارەسەربکەین؟ ئەگەرئەوان نەیانتوانی، ئێمە چۆن دەتوانین چارەسەریان بکەین؟ بۆفامی گرفتێك وشیاری پێویستە و ئەم وشیارییە لە ڕێگای پسپۆڕبوونەوە مەیسەر نیە. تەنیا کاتێ دێتەئاراوە کە ئێمە لە ڕەوتی گشتی هەستی خۆمان بەشێوەیەکی پاسیڤ ئاگاداربین، یانێ لە خود بێ هەڵبژاردن وبێ تەڵکردن — ڕاست یان هەڵە — ئاگاداربین. کاتێ تاکێ وشیارییەکی پاسیڤی هەیە، تێدەگات کەلەدوای ئەم پاسیڤ بوونەوە — شتێ کەنە ئیدەئالیسمە، نەخەون؛ بەڵکو وشیاری کۆتاییە — گرفت مانایەکی تری هەیە. یانێ ئیتر شتێ بەناو یەکسانی لەگەڵ گرفتدا نیە. کەوابوو ناکرێت دەربارەی داوەری بکرێت وخودی گرفت نێوەڕۆکی خۆی ئاشکرا دەکات. ئەگەر ئێوە بتوانن



ئەم ئیشە بەبەردەوامی ئەنجامبدەن، ئەوا دەکرێت لە چارەسەرکردنی تەواوی گرفتەکاندا بە چەشنێکی بنەڕەتی — نەڕووکەشی - دەستبەکاربن. گرفت ئەمەیە کە زۆرێك لە ئێمە ناتوانین وشیاری پاسیڤمان هەبێت و ئیجازە بدەین کە خود گرفت سەرگوزشتەی خۆی بێگۆڕان و ڕاڤەکردنی ئێمە دەرببڕێت. ئێمە نازانین کە چۆن بێ نیەت و مەبەست بەسەرگرفتەکەدا چاودێری بکەین. بەداخەوە ئەم ئیشە لە ئێمە ناوەشێتەوە. لەبەر ئەوە ئێمە لە گرفت بەرهەم داوا دەکەین، وەلاّم داوادەکەین، بەدوای ئامانجەوەین و لەکاتی وەرگێڕانی گرفتدا بە گوێرەی ئازار یان لەزەتی خۆمان، یان دەربارەی بەربەرەکانی لەگەڵ گرفتدا لە پێشڕا وەلاّمێکی ئامادەمان هەیە. کەوابوو لەگەڵ گرفتێکدا کە هەمیشە تازەیە بە سەرمەشق و نموونەیەکی کۆنە دەجوڵێینەوە.

گرفت هەمیشە تازەیە، بەلاّم وەلاّمی ئێمە هەمیشە کۆنە و گرفتی ئێمە ئەمەیە کە لەگەڵ مەسەلەدا ڕووبەڕووبوونەوەی شیاو و تەواومان هەبێت. مەسەلە هەمیشە مەسەلەی پەیوەندییە، پەیوەندی لەتەك تەنەکان، تاکەکان یان ئیدەکان. گرفتێکی دیکە نییە و بۆ ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ گرفت، پەیوەندی و داخوازییەکانی کە بەردەوام لە حاڵی گۆڕان دایە — بۆ ڕووبەڕووبوونەوە بەشێوەی ڕاست و پێویست — مرۆڤ دەبێت بە چەشنێکی پاسیڤ وشیاربێت. ئەم پاسیڤ بوونە پەیوەندی بەبڕیار و ئیرادە و دیسپلینەوە نییە، دەسپێکی کارئەوەیە کەلە پاسیڤ نەبوونی خۆ ئاگاداربین. وشیاربین کە ئێمە بەدوای وەلاّمێکی تایبەت بۆ پرسێکی تایبەتدا دەگەڕێن. بێگومان سەرەتاکەی بەم جۆرەیە: ناسینی خۆ لە پەیوەندی لەگەڵ گرفت وشێوازی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵی. دواتر هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە ناسینی خۆ لە پەیوەندی لەگەڵ گرفت — جۆری وەلاّمدانەوە — جۆری دەمارگیرییەکان، داخوازییەکان و ئۆگرییەکان بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفتە، دەسمان پێکرد، ئەم ناسینە، ئاراستەی بیرکردنەوەمان و زاتی دەروونیمان ئاشکرا دەکات و ڕزگاری لەمەدایە. ئەوەی بێگومان گرنگە، وشیاری بێ هەڵبژاردنە، لەبەر ئەوە هەڵبژاردن دەبێتەهۆی ناکۆکی. هەڵبژێر تووشی شێواویە، لەم ڕوووەوە، ڕوولە هەڵبژاردن دەنێت، ئەگەر تووشی شێواوی نەبێت، هەڵبژاردن بوونی نیە. تەنیا کەسێ کە تووشی پەرێشانی هەستیارهاتووە، بڕیاردەدات کە چیبکات یان چینەکات. مرۆڤ کەسادەیە و بە ئاشکرا هەڵنابژێرت، " ئەوەی کەهەیە "، هەیە. کردەوەیەك کەلەسەربناغەی خەیاڵ بێت، بە ئاشکرا کردەوەیەکە کە دەبێت هەڵبژێردرێت و هەڵبژاردنی بەم جۆرەش ئازادی پەخش

نییــە، بــە پێــچەوانەوە، شــتێکی وا لــە ســەربنەمای بیرکردنەوەیــەکی مــەرجی، تــەنیا ڕاوەستان و خۆڕاگری زیاترۆناکۆکی زیاتر دروستدەکات. کەواتــە، گــرنگ ئەوەیــە کەئێمــە چرکە بە چرکە، بێ کۆکردنەوەی بیرێك کە وشیاری لەگــەڵ خۆیــدا دەهێنێــت، ئاگــاداربین؛ لەبەرئەوە لەهەمان چرکەی کۆکرنەوەدا، زانیــاری ئێــوە تــەنیا لــەڕووی ئەوشــتانەوەیە کــە کۆتان کردووەتەوە، کەوابوو ئیتر شتێ بەناو سەیرکردن و ڕوانین نیە. بەڵکو ئەوەی کەهەیە، تەنیا وێنەیەکە لە ڕوانین. لەهەرکوێ وێنەیەك هەبێت، هەڵبژاردن هەیە و هەڵبــژاردن هــۆی ناکۆکییە، لە ناکۆکیدا فام نیە.

ژیان پەیوەندی بە پەیوەندییەوە هەیە و بۆ فام وتێگەیشتنی ئــەم پەیوەندییــە کــە مەنــد و وەستاو نییە دەبێت جۆرێ وشیاری خۆگونجێن، جۆرێ وشیاری کە دۆخێکی پاسیڤی هۆشیارانەی هەیە، نەدۆخیکی چالاکی پڕ لە توندوتیژی، هەبێت. هەروا کە گوتم، ئەم وشیارییە پاسیڤە لە ڕێگای هیچ دیسیپلین و هیچ مەشقێکەوە بەرهەم نایەت. دەبێت تەنیا و تەنیا، چرکەبەچرکە لە شێواز و چۆنیەتی بیرکدنەوە و هەستی خۆمان ئاگاداربین، نەتەنیا کاتێ کە بە خەبەرین، چونکە هەرچی زیاتر تێدا ورد بینەوە، دەبینین کە بەرەو خەون دەچین و تەواوی ئەو هێما جۆراوجۆرانەی کەبەشێوەی خەون وەریــان دەگێــڕین، دەرژێنینــە دەرەوە، کــەوابوو دەرگــا بــەرەو ڕووی ئیــشە شاراوەکان کەدەبن بە ناسراو، دەکەینەوە. بــەڵام بــۆ دۆزینــەوەی نەناســراوەکان دەبێــت بــەرەو ئەودیوی ئەم دەرگا بڕۆین، گومانێــك نییــە کــە ئەمــە گرفتــی ئێمەیــە. ڕاســتی شــتێ نییــە کەلەڕێگای زەینەوە بناسرێت، چونکە زەین،بەرهەمی ناسراوەکان و بەرهەمی رابردووە کەوابوو زەین دەبێت خود، کردەوەی خود و ڕاستی خود بناسێت و تەنیا لەوبارودۆخەدایە کە نەناســراو دەتوانێت بوونی هەبێت.

# فەسڵی سیانزەیەم

## ئارەزوو

بۆ زۆربەی ئێمە، ئارەزووگرفتێکی گەورەیە. ئارەزووی هەبوونی ماڵ، پلەوپایە، دەسەڵات، ئاسایش، نەمری، ئارەزووی خۆشەویست بوون، ئارەزووی هەبوونی شتێکی هەمیشەیی، شفابەخش، زۆرهەڵبکات و شتێ کە بکەوێتە پێش زەمانەوە. هەنووکە بزانین ئارەزوو چییە؟ ئەمە چ شتێکە کە پاڵ بە ئێمەوە دەنێت و زۆرمان لێدەکات؟ من ناڵێم کە ئێمە دەبێت لەگەڵ ئەوەی کە هەمانە یان هەین، ڕازیبین پێشنیازێکی وا بە ئاشکرا دژی ئەو شتەیەکە ئێمە خوازیارین. کۆششی ئێمە ئەوەیە کە بزانین ئارەزوو چییە و ئەگەربتوانین بە جۆرێ تاقیکاری و گومان دەست بە لێکۆڵینەوە بکەین، هەستدەکەم دەبێتە هۆی گۆڕانێکی وا کە ئیشەکەمان تەنیاجێنشینکردنی شتێکە ئارەزووی بۆ دەکەن بە جێگای شتێکی دیکە کە جێی ئارەزوو نییە، بێت. بەزۆری ئەمە ئەوشتەیە کە پێیدەڵێن "گۆڕان". کاتێ لە شتێکی تایبەتی جێی ئارەزوو ڕازی نین، جێنشینێکی بۆ دەدۆزینەوە. بەشێوەیەکی بەردەوام لە شتێکی جێی ئارەزووبۆ شتێکی دیکە کەبەڕای ئێمە بانتر، خاوەن ئابڕووتر و خاوێنترە دەڕۆین، بەڵام ئارەزوو هەرچەندەش خاوێن بێت لەهەر حاڵدا هەر ئارەزووە و لەم ڕەوتەی ئارەزووەدا، ئەوەی کە دەیبینین کێشمە کێشی بێکۆتاییە و دژایەتی نێوان بەرە نەیارەکان.

کەواتە، ئایا تێگەیشتن لە جەوهەروزاتی ئارەزوو و لە گۆڕان هاتووی یان نەهاتووی ئەو گرنگ نییە؟ ئارەزوو چییە؟ ئایاشتێکی جیالە هێماوشەوق و خۆشییەکە کە لەو دروستدەبێت؟ ئارەزوو یانێ شەوقێك کەلە گەیشتن بە شتێکدا هەیە. ئایا بەبێ هێماو شەوقێ کەلەو دروستدەبێت، ئارەزوویەك هەیە؟ ڕوونە کە نا. هێما لەوانەیە شێوەیەك، کەسێك، وشەیەك، ناوێك، وێنەیەك یان خەیالێك بێت کە بەمن شەوق دەدات، بەمن هەستی حەز لێکردن یان نەکردن دەدات. ئەگەر ئەم شەوقە لەزەت بدات، من حەز بە گەیشتن، هەبوون، حەز بەخۆهاویشتن بە داوێنی هێما پەیدا دەکەم و بەولەزەت وچێژە درێژە دەدەم. جارنا جارێك، بەگوێرەی حەز و مەبەستم، شێوە، وێنە و تەنێك دەگۆڕم. لە شێوەیەکی لەزەت وچێژ، تێرو



ماندوو دڵ کناودەبم، کەوابوو بە دوای شەوقێکی تر، خەیالی نوێ و هێمایەکی تازە تردا دەڕۆم. شەوقی کۆن ڕەتدەکەمەوە بەوەی کەتازەیە، بە وشەتازەکان، چەمکی نوێ، ئەزموونی تازە، دڵ دەبەستم. لە هەمبەر ئەوەی کە کۆنە، ڕادەوەستم و لەهەمبەرشەوقی تازە کەلە سەرەوەتر، بە ئابڕووتر و دڵخۆشکەرتر دەیبینم، خۆم بەدەستەوە دەدەم. کەوابوو لە ئارەزوودا هەم خۆڕاگری هەیە و هەم خۆ بەدەستەوەدان، کە وەسوەسەش دەگرێتە خۆی، هەڵبەت لە خۆ بە دەستەوەدان بە هێمایەکی دیاریکراوی ئارەزوو، هەمیشە ترس و دۆڕان هەیە.

ئەگەر من تەواوی ڕەوتی ئارەزوو بخەمە ژێر چاودێرییەوە، بۆم دەردەکەوێت کە هەمیشە شتێك هەیە کە زەینی من بۆ شەوق یان خۆشی زیاتر بەلای ویدا لاربۆتەوە و ئەم ڕەوتە چۆڵ لە خۆڕاگری، وەسوەسە و دیسپلین نییە، خاوەنی تێگەیشتنی هەستیاری، شەوق، پەیوەندی و ئارەزوو و زەین دەبێتە ئامرازی میکانیکی ئەم ڕەوتە. ڕەوتێك کە لەودا، هێماکان، وشەکان، تەنەکان لە ناوەندان و بە چوار دەوریاندا هەموو ئارەزووەکان، ئۆگریەکان و فراوان خوازی ڕیزیان بەستووە. ئەوەی کەلە ناوەندایە ناوی "من"ە. ئایا من دەتوانم ئەم ناوەندەی ئارەزووە - کە ئارەزوویەکی تایبەت، مەیل یان حەزێکی تایبەت نیە. بەڵکو پێکهاتەیەکی تەواوە لە ئارەزوو، حەزوهیوا کەترس و دۆڕانی هەمیشە تێدایە - لە بەریەك هەڵوەشێنم؟ هەرچی بێ هیواتر دەبم. هێزی زیاتر بە "من" دەدەم، تاکاتێك شەوق و هیواداری هەیە، زەمینەیەك لە ترسیش هەیە. ترسێکە دووبارە ئەو ناوەندە بەهێزدەکات و شۆڕش تەنیا لەو ناوەندەدا مەیسەرە، نەبە شێوەی ڕواڵەتی و ڕووکەش کە تەنیا ڕەوتی لادانە و گۆڕانێکی ڕواڵەتی کە دەبێتە هۆی کردەوەی خراپ و ڕووخێنەر.

کاتێ من لە پێکهاتەی گشتی ئارەزوو ئاگاداربم، ئەوکاتە تێدەگەم کە چۆن زەینی من بووەتە ناوەندێکی مردوو و ڕێچکەی میکانیکی بیرەوەریەکان. کاتێ لە ئارەزوویەك ماندوو دەبم، بەشێوەی ئۆتۆماتیك دەمەوێت خۆم لە ئارەزوویەکی دیکەدا ڕازیبکەم. زەینی من بەردەوام بە گوێرەی ئەو شەوق و ورووژاویەی کە پەیدای دەکات خەریکی ئەزموونە، زەینی من ئامرازی دەستی شەوقە. کاتێ لە شەوقێك ماندوو دەبێت، بەدوای شەوقێکی دیکەدا دەگەڕێت کەلەوانەیە هەر ئەوشتەبێت کە من ناوی دەنێم سەلماندنی بوونی خودا، بەڵام دووبارە شەوقێ زیاترنییە. تاقەتم لەم دونیا و ئێش و ئازارەی بەسەر چووە و دڵم دەخوازێت هێمنیم هەبێت، ئارامییەك بڕانەوەی نەبێت. کەوابوو، دەست بەبیرکردنەوە دەکەم و کۆنتڕۆڵ دەکەم و زەینم بۆ ئەزموونی ئەو هێمنییە ڕواڵەتییە، حازرو

ئامادە دەکەم. ئەزموون کردنی ئەوهێمنییە، دووبارە ورووژانە. کەواتە، زەینم ئامرازی میکانیکی شەوق و بیرەوەرییە و ناوەندێکی مردووە کە فیکر و کرەوە لەو دەگرم. ئەوشتانەی کە بەدوایاندا دەڕۆم، ڕەنگدانەوەی زەین ولە چوارچێوەی هێماگەلێکدان کەزەین شەوقەکانی لەوان وەردەگرێت. وشەکانی "خودا"، "عەشق"، "کۆمۆنیزم"، "دیموکراسی" و ناسیۆنالیزم، هەموو هێماگەلێك کە بە زەین شەوق و ورووژان دەدات. کەوابوو زەینە دەست لە داوێنیان ناکاتەوە. هەرواکەئێوە و من دەزانین،هەموو شەوقەکان بە دواڕۆژدەگەن و بەم جۆرە ئێمە لە شەوقێکەوە بۆ شەوقێکی تر دەڕۆین و هەرشەوقێك، عادەتی خۆی بە دوادا چوونی شەوقی زۆرتر بە هێزدەکات. کەوابوو، زەین دەبێتە ئامرازی دەستی شەوق و بیرەوەری و ئێمە لەم پرۆسەدا دیل دەبین. تاکاتێك زەین بەدوای ئەزموونی زیاتردا دەگەڕێت، تەنیا دەتوانێت لە ڕووی شەوقەوە بیربکاتەوە و هەرئەزموونێکی کاتی، داهێنەر، گرنگ و زۆر تازە گورج و دەستبەجێ دێنێت خوارترین ئاست و بەدوای دەکەوێت و سەرنجام، ئەوشەوقە دەبێت بەبیرەوەری. کەواتە، ئەزموون دەمرێت و زەین تەنیا دەبێت بە حەوزێکی مەند لەڕابردوو.

ئەگەر بە باشی بیری لێبکەینەوە، ئەم ڕەوتە دەناسین و وابە ڕامان دەگات کە ئیتر ناتوانین پێ ئەولاتر بنێین. ئەڵبەت ئێمە دەمانەوێت پێ ئەولاتر دابنێین. لەبەر ئەوە لەم نەگۆڕییە بێ بڕانەوە، لەم شوێن گرتنە میکانیکییەی شەوق، وەڕس هاتووین. سەرەنجام زەین ئیدەی ڕاستی و خواوەند دێنێتە بەرباس، خەونی گۆڕانی دونیایەك دەبینێت و هەبوونی ڕۆڵێکی بنچینەیی لەم گۆڕانەدا، هەروەها وەزع درێژە دەکێشێت. کەواتە، هیچ کات دۆخێکی داهێنەرنییە، من ئەم ڕەوتەی ئارەزوو لەخود و لە گەڕاندا دەبینم و دەبینم کە شتێکە میکانیکی، دووبارە؛ شتێکە کەزەین لە ڕەوتێکی جێگیر و نەگۆڕدا ڕادەگرێت و لە ناوەندێکی مردوو لەڕابردوو سازدەکات کەلەودا داهێنانی گورج و دەسبەجێ نیە. هەروەها بە چرکە لەناکاوەکانی داهێنان دەگەین کە تایبەت بە زەین و بیرەوەری نییە و پەیوەندیشی لەگەڵ شەوق و ئارەزوودا نیە.

کەواتە، گرفتی ئێمە فامی ئارەزووە، نە ئەوەی کە بۆکوێ ئەڕوات و لەکوێدا کۆتایی دێت؛ بەڵکو فامی ئاڕاستەی گشتی ئارەزوو، ئیشتیا، شەوق حەزو زەوقی زۆر. زۆرێك لە ئێمە هەستدەکەین دارایی کەم نیشانەی ڕزگاری لەبەند و داوی ئارەزووە، بە ڕاستی لە کەسانێکە زۆرکەمیان هەیە، چ پرسیارێك دەکرێت؟ لۆنگ و عابا، نیشاندەری ئەون کە ئارەزووەکانی ئێمە



لە چنگی ئارەزوو ڕزگار بوونە، گەرچی ئەمەش جگەلە کاردانەوەیەکی زۆر ڕواڵەتی شتیتر نیە. بۆچی ئەوکاتەی زەینی ئێمە داخوازیی، ئارەزوو، باوەڕە و ململانێ بێژمارەکان ئفلیجیان کردووە، ڕوودەنێن لەو دیوی شتە دەرەوەیەکانی تایبەت بە خۆتان؟ بێگومان دەبێت شۆڕش لەوێدا ڕووبدات، نەلە ڕێژەی دارایی، جۆرێ جل لەبەرکردن و ڕادەی کاتەکانی خواردنی ڕۆژانەی تاکەکان، بەڵام هۆی ئەوەی کە ئێمە دەکەوینە ژێر کاریگەری ئەم کارانەوە ئەوەیە کە زەینمان ئاستی و ڕەواڵەتییە.

گرفتی ئێوە و گرفتی من ئەمەیە کە بزانین ئایا زەین دەتوانێت خۆی لە بەند و داوی شەوق و ئارەزوو رزگار بکات یان نا ؟بێگومان داهێنان پەیوەندییەکی بە شەوقەوە نیە، ڕاستی، خودا یان هەرچی کە ئێوە ناوی دەنێن، دۆخێك نییە کە بکرێت وەك شەوقێك تەجرەبەی بکەیت، کاتێ شتێ تەجروبە دەکەن، چی ڕوودەدات؟ بەئێوە شەوقێکی تایبەت هەستێکی بەرز یان خەمۆکی دەدات. بێگومان ئێوە کۆشش دەکەن ئەم دۆخە خەمۆکییە وەلاوەبنێن و لێی دووربکەوەنەوە، بەڵام ئەگەر دۆخی خۆشی و هەستی بەرزبێت، شوێنی دەگرن، یانێ ئەزموونی ئێوە شەوقێکی شادی هێنەری پێکهێناوە و ئێوە خوازیاری شادی زیاترن و ئەم " زیاترە"، دەبێتەهۆی بەهێزکردنی ناوەندی مردووی زەین کە هەم دیسان لە ئارەزووی ئەزموونی زیاتردایە.

بەم جۆرە زەین، ناتوانێت هیچ شتێکی تازە تەجروبەبکات، لەبەرئەوە بەرەو ڕووبوونەوەی هەمیشە لە ڕێگای بیرەوەری و وێناکردنەوەیە. ئەوەی کە زەین جیای دەکاتەوە، ڕاستی و داهێنان نیە، ڕاستییەکەی ئەوەنییە. زەینێکی وا ناتوانێت ڕاستی تەجروبەبکات، تەنیا دەتوانێت شەوق تەجروبە بکات. ئەڵبەت شەوق، داهێنان نییە، داهێنان شتێکە هەمیشە لە تەواو ساتەوەختەکاندا تازەیە.

هەنووکە من دۆخی زەینی خۆم فام دەکەم، دەزانم کە ئامرازی دەستی شەوق و ئارەزووە یان چاکتر بڵێم، خودی شەوق و ئارەزووە و بەشێوەیەکی میکانیکی لەم نەگۆڕی و چەسپاوییەدا دیلبووە. زەینێکی لەم چەشنە هەرگیز ناتوانێت شتە تازەکان وەربگرێت یان هەستیان بکات. لەبەرئەوە هەرشتێ تازە دەبێت بەئاشکرا لە سنووری شەوق کە هەمیشە کۆنەیە، تێپەڕێت. کەوابوو ئەم ڕەوتە میکانیکییەی هاوڕێی شەوق، بۆخۆی دەبێت بە کۆتایی بگات.

داواکاری زیارترو چوون بەدوای هێما، وشە و وێنە و شەوقەکانیان، هەرهەمووی، دەبێـت بەکۆتایی بگەن و تەنیا لەوکاتـەدا بـۆزەین ئـەم دەرفەتـە فەراهـەم دەبێـت کـە لـەو دۆخـە تایبەتەی داهێناندا، کە تازەی هەمیشە تێدا لەدایك دەبێت، بوەستێت؛ ئەگەر تێگەیشتنی ئێوەبێ میس مێریزم (mes merism)، بێ وشە، خوو و خدە و خەیاڵەکان بێتـە ئـاراوە و بە کاریگەریی بەردەوامی باسی تازە لـە سـەرزەین بـزانین، ئـەوکات پێدەچـێت لـە ڕەوتـی ئارەزوو، نەگۆڕی،بێزاربوون و شەوقی بەردەوام بۆ ئەزموون تێبگەن.

بەم جۆرە، من هەست دەکەم کەهێدی هێدی بۆتان ڕوون دەبێتەوە کـە ئـارەزوو بایـەخێکی ئەوتۆی لە ژیانی مرۆڤێکدا کە بەراستی جۆست و جۆکارە نیـە. ڕوونـە، پێویـستی فیزیکـی دیاریکراوی وەك خۆراك، جل وبەرگ، شوێن پەناو شتی لەم جۆرە هەیە، بەلاّم ئەم پێویـستیانە هەرگیز بە ئارەزووی دەروونزانی، یانێ ئەوشـتانەی کـە زەیـن، خـانووی خـۆی لەسـەریان وەك ناوەندی ئارەزوو بنیات دەنێت، ناگۆڕدرێن.

هەر چەشنە ئارەزوویەك جیا لە پیداویستییەکانی فیزیکی— ئارەزووی گەورەیی، هەقیقەت یان خۆپارێزی — دەبێتـە ڕەوتێکـی دەروونناسـانە کـە زەیـن بەیارمـەتیان خـەیاڵی "مـن" دروستدەکات و خۆی وەك ناوەند، بەهێزدەکات.

کاتێ ئێوە ئەم ڕەوتە دەبینن و بێدژایەتی کردنی، بێ وەسوەسە، بێ ڕاوەستان و خۆڕاگری، بێپاساو دان و دادوەری، لێ ئاگادارن، ئەوا تێدەگەن کە زەین توانایی وەرگرتنی تازەی هەیەو ئەم تازەییە هەرگیز شەوق و ورووژان نییە، کەوابوو، هەر گیز ناناسـرێت و دووبـارە تەجروبـە ناکرێت. دۆخێکی دەروونی تایبەتە کەلەودا بەبێ دروستکردن و بیرەوەری،داهێنـان پێکـدێت، ئەمە ئەوشتەیە کە ناوی واقیعیەتە.

# فەسڵی چواردەیەم

## پەیوەندی و دوورەپەرێزی

ژیان ئەزموونە، ئەزموون لە پەیوەندیدا. هیچ کەس ناتوانێت لە دووره پەرێزیدا ژیان بکات، کەوابوو ژیان یانێ پەویوەندی و پەیوەندی یانێ پراکتیك. چۆن مرۆڤ توانای پێویستی بۆ فامی پەیوەندی کە ژیانە، هەیە؟ مەگەر نەئەوەی کەمانای پەیوەندی هەم دامەزراندنی پەیوەندی فیکری و هەستیارییە لەگەڵ خەڵك و هەم ناسینی تەنەکان و ئیدەکانە لە نزیکەوە؟ ژیان یانێ پەیوەندی کەبە شێوەی نزیك بوونەوە لەگەڵ تەن و خەڵك وئیدەکان نیشان دەدرێت،بۆفامی پەیوەندی دەبێت توانای ڕووبەڕوونەوەمان لەگەڵ ژیان بەتەواوی وپێویست هەبێت. کەوابوو گرفتی ئێمە توانایی نییە — لەبەر ئەوە توانایی جیا لەپەیوەندی نییە — بەڵکو گرفتمان فامی پەیوەندییە، کە بێگومان توانایی پێکدەهێنێت بۆ خۆگونجاندنی خێرا، هاوجێ کردنی خێرا و وەڵام دانەوەی خێرا.

پەیوەندی، بێگومان، ئەو ئاوێنەیە کە مرۆڤ خۆی تێدا دەبینێتەوە. بێ پەیوەندی، مرۆڤ بوونی نیە، بوون یانێ لە پەیوەندیدا بوون، لەپەیوەندیدا بوون یانێ هەبوون. مرۆڤ تەنیا لە پەیوەندیدا، بوون پەیدا دەکات، ئەگەر وانەبێت، بوونی نییە و بوون شتێکی بێمانا دەبێت، مرۆڤ هەستدەکات کە بوونی هەبوونی لەبەر ئەوەیە کە بیر دەکاتەوە، لەحاڵێکدا هەبوونی لەبەر پەیوەندیەتی و نەبوونی تێگەیشتن و مافی پەیوەندی، دەبێتە هۆی ناکۆکی.

هەنووکە ئێمە لە پەیوەندی شتێك فام ناکەین، چونکە ئێمەلە پەیوەندی، تەنیا وەك ئامرازێك بۆبەرزکردنەوەی دەستکەوتەکانمان، بەرزکردنەوەی ئاڵوگۆڕوبەرزکردنەوەی کران کەڵك وەردەگرین؛ بەڵام پەیوەندی، ئامرازێکە بۆدۆزینەوەی خۆ، چونکە پەیوەندی یانێ بوون، پەیوەندی یانێ هەبوون. بێ پەیوەندی من بوونم نیە. بۆفامی خۆمن دەبێت پەیوەندی فام بکەم. پەیوەندی ئاوێنەیەکە کەمن دەتوانم خۆم لەودا ببینم. ئەم ئاوێنەیە دەتوانێت هەم دەسکاری کراو بێت و هەم هەمان بێت (کەهەیە) و (ئەوەی هەیە) بداتەوە. بەڵام زۆربەی ئێمە لە پەیوەندیدا، لەوئاوێنەیەدا، شتێك دەبینین کە بەباشی دەزانین بیبینین، ئەوەی



کەهەیە نایبینین. ئێمە پێمان باشە ئیدە ئال دروستبکەین، هەڵبین، پێمان باشە لە داهاتوودا بژین نە ئەوەی کە ئەم پەیوەندییە لە زەمانی ڕانەبردووی خۆماندا کە ناچارین هەمان بێت فام بکەین.

هەنووکە ئەگەر خەریکی لێکۆڵینەوەی ژیانی خۆ و پەیوەندیمان لەگەڵ ئەوانیتردا بین. دەبینین کە ڕەوتێکی دووره پەرێزە. ئێمە بیرمان بەلای یەکترەوە نیە، با بوەستێ کەلەم بارەیەوە قسەی زۆردەکەین، لە کردەوەدا خەمساردین. تا کاتێ لەگەڵ کەسێکدا لە پەیوەندی داین کەئەو پەیوەندییە ئێمە ڕازی بکات، تا کاتێ کە بۆئێمە پشت وپەنایەك بێت، بەڵام هەرکە لە پەیوەندیدا کەم و کورتییەك بێتە ئاراوە کە ببێتە هۆی نارەحەتی خودی ئێمە، ئەو پەیوەندییە. دوور دەهاوێژین. بە دەربڕینێکی تر، پەیوەندی تاکاتێ هەیە کە ئێمە ڕازی دەبین. ئەمە لەوانەیە بە دلێرانە ببیسرێت، بەڵام ئەگەربەڕاستی لێکۆڵینەوەی وردی ژیانی خۆتان بکەن، دەبینن کەڕاستی هەیە و دووری لەڕاستی، یانێ ژین لە نەزانیندا کە هەرگیز نابێتە هۆی پێکهاتنی پەیوەندی دروست. ئەگەر لە ژیانماندا ورد ببینەوە و پەیوەندی بخەینە ژێر چاودێری، بۆمان دەردەکەوێت کە ڕەوتی پێکهاتنی خۆڕاگری لە هەمبەر ئەویتردایە، دروستکردنی دیوارێکە، کە بۆدیتن و ڕوانینی خەڵك دەبێت مل بەرز بکەینەوە.بەڵام دیوارەکە هەردەم رادەگرین و لە پشتییەوە دەمێنینەوە، چ ئەم دیوارە، دیواری ڕۆحی بێت و چ دیواری ماددی، ئابووری یان نەتەوەیی. تاکاتێك لە دووره پەرێزی و لەپشت ئەم دیوارەوە ژیان دەکەین، پەیوەندییەك لەگەڵ ئەوانی تردا نیە. ئێمە لە دووره پەرێزیدا دەمێنینەوە، چونکە زیاتر ڕازیمان دەکات و هەستدەکەین ئاسایشی زیاترمان هەیە. دونیا ئەوەندە شێواو پێداوە، ئەوەندە لە خەم و کەسەر پرە، ئەوەندە ئازارو شەڕو وێرانی وبەلای هەیە کە دەخوازین هەڵبێین و لە نێوان دیوارەکانی ئاسایشی بوونی دەروونی خۆماندا ژیان بکەین کەوابوو، پەیوەندی بۆچوونی زۆرێك لە ئێمە، ڕەوتێکی گۆشەگیرییە و بەشێوەیەکی ئاشکرا پەیوەندییەکی لەم جۆرە، کۆمەڵگایەك دروستدەکات کە ئەویش تەریك کەرەوەیە. ڕاست ئەمە هەرئەوەیە کە دەیەوێت لەسەرانسەری دونیا ڕوودەدات، مرۆڤ لە گۆشەگیری خۆیدا دەمێنێتەوە و دەستی لەبان دیوارەکەوە درێژ دەکاتەوە، ناوی دەنێت ناسیۆنالیزم، برایەتی و شتی تر، بەڵام لەڕاستیدا، حکوومەتەکان و دەسەڵاتە سەربازییەکان بەردەوامن ومرۆڤ لە حاڵێکدا هێشتا ئاوێزانی سنووره و بەربەستەکانی خۆیەتی، خەیاڵ دەکات کە دەتوانێت پێکهێنەری یەکێتی جیهانی و ئاشتی جیهانی — کەنابێت--- بێت. تاکاتێکە مرۆڤ

سنووری هەیە، چ ناسیۆنالیزم، چ سنووری ئابووری، مەزهەبی یان جڤاکی، ئەمە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە کە ئاشتییەك لە دونیادا بوونی نابێت.

ڕەوتی تەریکخوازی، ڕەوتی گەڕان بەدوای دەسەڵاتدایە، چ تاك بەتەنیایی بەدوایدا بگەڕێت وچ بۆگرووپێکی ڕەگەزی یان نەتەوەیی، لەهەرحاڵدا دووره پەرێزی هەیە، لەبەرئەوە هەبوونی هەمان ئارەزووی پلەوپایە و دەسەڵات جیاوازی خوازییە. لە هەرحاڵدا ئەمە شتێکە کە هەرکەس خوازیاریەتی. هەرکەس بەدوای پلە و پۆستێکی بەهێزەوەیە تابتوانێت، چ لەماڵ، ئیدارە یان ڕژێمێکی بۆرروکراتیکدا بالاَ دەست بێت. هەرکەس بەدوای دەسەڵاتەوەیە و لەم ڕەوتی گەڕان و بەدوادا چوونەدا، کۆمەڵگایەك داداەمەزرێنێت کەلەسەر بناغەی دەسەڵات، ئەرتەش، پیشەسازی، ئابووری و شتی لەم جۆرەیەوە کە ئەمەش ڕوونە. ئایا ئارەزووی هەبوونی دەسەڵات، خۆی لەخۆیدا، نابێت هۆی گۆشەگیری؟ هەستدەکەم فامکردنی ئەم باسە زۆر گرنگە، لەبەرئەوە مرۆڤێ کە خوازیاری جیهانی هاوڕێ لەگەڵ هێمنیایە، جیهانێك کەلەودا شەڕ، تێکدانی ترسێنەر و هەژارێکی لەرادە بەدەر نەبێت، دەبێت ئەم پرسیارە بنەڕەتییە تێبگات، قەبوولێتانە؟ لە تاکی سۆزدارومیهرەباندا، هەستی دەسەڵات نیە، کەوابوو، ئەم جۆرە تاکانە بەهیچ نەتەوە و ئالاَیەك بەستراوەنین، ئەوان ئالاَیان نیە.

شتێك بەناو ژیان لە دووره پەرێزیدا بوونی نیە، هیچ ولاَتێك، هیچ نەتەوەیەك، هیچ تاکێك ناتوانێت لە دووره پەرێزیدا ژیان بکات. سەرەڕای ئەمە، لەوێڕا کە مرۆڤ بە شێوازی جۆراوجۆر بەدوای دەسەڵاتدا دەگەڕێت، دووره پەرێزی دروستدەکات. ناسیۆنالیست تاکێکە نفرینکراو. لەبەرئەوە لەهەمان ڕۆحی ناسیۆنالیستی و نیشتمان پەروەرییەکدا، دیوارێك لە دووره پەرێزی بەدەور خۆیدا کێشاوە، ئەوەندە لەگەڵ ولاَتەکەیدا یەکسان بوو. کەدیوارێك لە هەمبەر ولاَتی دیکەدا دروستدەکات. بەراستی کاتێ لە هەمبەرشتێکدا دیوارێك دروستدەکەن، چی ڕوودەدات؟ ئەوشتە هەمیشە لە دیواری ئێوە دەدات، کاتێ لەهەمبەر شتێکدا خۆڕاگری دەکەن، هەرئەو خۆڕاگیرییە نیشانی دەدات کە ئێوە لەگەڵ شتێکی تردا لە دژایەتیدان. کەوابوو، ناسیۆنالیزم کە ڕەوتی تەریك خوازی و ئەنجامی گەڕان بەدوای دەسەڵاتدایە، ناتوانێت لە دونیا ببێت هۆی پێکهاتنی ئاشتی. مرۆڤێ کە ناسیۆنالیستە و قسە لە برایەتی دەکات، درۆدەکات، ئەولە دۆخێکی پارادوکسیکاڵدا دەژی. ئایا دەکرێت لە دونیا بێ ئارەزوو لە دەسەڵات و پۆست و دەسەڵاتداریەتی، ژیان بکرێت؟ ئەڵبەت کە دەکرێت. مرۆڤ دەتوانێت ئەم ئیشە بکات، بەمەرجێك خۆی لەگەڵ



شتێکی گەورەتر هاوشێوە نەکات. ئەم هاوشێوە بوونە لەگەڵ شتێ گەورەتر- وەك حیزب، ولاَت، ڕەگەز، مەزهەب. یان خوا — یانێ بە دوای دەسەڵاتەوە بوون. لەبەرئەوەی کە مرۆڤێکی وا لە دەروونی خۆیەوە بەتاڵ، لێڵ و لاوازە هەربۆیە دەیەوێت خۆی لەگەڵ شتی گەورەترلە خۆی هاوشێوە یەکسان بکات. ئەم ئارەزووی هاوشێوە بوونە لەگەڵ شتێ گەورەتردا پێدەڵێن ئارەزوو لە دەسەلاَت.

پەیوەندی، تۆیژینەوەیەکی دەروونییە و بێ خۆناسی، ڕێگەکانی زەین و دڵی مرۆڤ و دامەزراندنی ڕووتی نەزمێك، سیستەمێك و یاسایەکی زیرەکانەی دەرەوەیی مانای ئەوتۆی نیە. ئەوەی کە بایەخی هەیە ئەمەیە کە خۆمان لە پەیوەندی لەگەڵ ئەویتردا بناسین. ئەوکات پەیوەندی لە جیاتی ئەوەی کە ڕەوتێکی تەریك خوازبێت، دەبێت بەڕەوتێکی جوولاَن کەلەودا حەز و ئارەزوو، بیرکردنەوە و ئۆگریەکانی خۆ دەدۆزینەوە وهەر ئەم (اکتشاف) ە سەرەتایەکە بۆڕزگاری و گۆڕان.

# فەسڵی پانزەیەم

## بیر و بیرەوەر

لە تەواو ئەزموونەکانی ئێمەدا هەمیشە تاقیکراو، بینەر و کەسێ کە بۆخۆی زیاتروزیاتر کۆدەکاتەوە، یان تەرکی چێژ و لەزەتەکانی دەروون دەکات، هەیە. ئایا ئەمە ڕەوتێکی هەڵەنیە؟ ئایا ئەمە هەرلەو کارانە نییە کە داهێنانێکی لیٚ مەیسەرنابێت؟ ئەگەر ڕەوتێکی هەڵەیە. ئایا دەکرێت بە تەواوی لەنێوی بەرێت و بیهاوێژێتەلایەك؟ شتێکی وا تەنیا کاتێ مەیسەرە کەمن تەجروبەی بکەم، نەبەو جۆرەی کە بیرەوەرێك تەجروبەی دەکات. بەڵکو کاتێ من لە ڕەوتی هەڵە ئاگادارم و دەیبینم کە تەنیا دۆخێك هەیە، دۆخێکە لەودا بیرەوەر هەمان بیرە.

تاکاتێ کەمن تەجروبە دەکەم، تا کاتێ کەمن لە حاڵی کران دام، ئەم کردەوە دوولایەنە دەبێت ببێت، دەبێت بیرەوەری بیرببێت، وەك دوو ڕەوتی جیالەیەك، ولەکاردا تێکەڵییێك نابینرێت، هەمیشە ناوەندێك هەیە کە کارەکەی لەسەربناغەی ئیرادەی بەستراوە بە کردەوەی بوون و نەبوونە. چ بەشێوەی کۆمەڵ، چ تاك وچ نەتەوەیی. ئەم ڕەوتە لە تەواو جیهاندا هەرئەمەیە. تاکاتێ کە کۆشش لە نێوان تاقیکراو ئەزموونـدا جیاکراوەتەوە، دەبێت رەوتی هەڵدیری هەبێت. یەك پارچەی تەنیا کاتێ مەیسەرە کە بیرەوەر ئیترچاودێرنەبێت. بەواتایەکی تر، هەنوکە دەزانین کە هەردوولایەن هەیە: بیرەوەرو بیر، چاودێر، چاولێکراو، تاقی و تاقیکراو. هەوڵی ئێمە ئەوەیە کەلەسەر ئەم دوو فاقیەتی پەیوەندی درووستبکەین.

ئیرادەی بەستراوە بە پراکتیك هەمیشە دووفاقی تیدایە. ئایا دەکرێت لەم ئیرادە، کە شیکەرەوەیە، تێپەرین و دۆخێك بدۆزینەوە کە ئەم کردارە دووفاقەی تێدا نەبێت. دۆخێکی وا کاتێ فەراهەم دەبیت کە ئیمە ئەو دۆخەی کە لەودا بیرەوەر خودی بیرە بە شێوەی راستەوخۆ تاقیبکەینەوە. هەنووکە ئێمە خەیاڵ دەکەین کە بیر لە بیرەوەر جیایە، بەلام ئایا وایە؟



حەزدەکەین بەم شێوە بیربکەینەوە، چونکە لەوحاڵەدا، بیرەوەر دەتوانێت مەسەلەکان لە ڕێگای بیرکردنەوەکانیەوە باسبکات. هەوڵی بیرەوەر ئەمەیە کە یان زیاتر، یان کەمتربێت، کەواتە، لەو ململانێ و کردەوەیەدا کە سەرچاوەی لە ئیرادە بۆ کران گرتووە، هەمیشە هۆکاری بەرەو هەڵدێر بردن، هەیە؛ ئێمە شوێن ڕەوتێکی درۆینمان گرتووە، نەڕەوتێکی ڕاستین.

ئایا نێوان بیرو بیرەوەر جیاوازییەك هەیە؟ تا کاتێ کە ئەم دووانە جیا لەیەکترن، تێکۆشانی ئێمە بە فیرۆ چووە، ئێمە شوێن ڕەوتێکی درۆینمان گرتووەکە ڕووخێنەرە و هۆکارێکە بەرەو هەڵدێر بردن. ئێمە خەیاڵ دەکەین کە بیرلە بیرەوەرجیایە. کاتێ کە دەبینم چاوچنۆکم، لایەنگری خاوەنداریەتیم، دڕندە خۆم، خەیاڵ دەکەم کە نابێت هیچ یەك لەمانە بم.

ئەوکات بیرەوەر تێدەکۆشێت بیرکردنەوەکانی بگۆڕێت و هەوڵدەدات کە ((ببێت))، لەم رەوتەدا دوو ئاراستەی جیا لەیەك پەیدا دەبیت، لەحاڵێکدا تەنیا و تەنیا ڕەوتێك هەیە. من هەستدەکەم کە هۆکاری سەرەکی بەرەو هەڵدێر چوون لەمەدا شاراوەیە. ئایا ئیمکانی تاقیکردنەوەی ئەم دۆخە کاتێ کە تەنیا بوونێك هەیە، نەدوو ئاراستەی جیا لەیەکی تاقیکراو تاقی،لە ئارادایە؟ لەوانەیە لەوحاڵەدا، تێبگەین کەمانای خەلقکردن چییەو دۆخێك کەلەودا، لە هیچ زەمانێکدا و سەرەرای هەرپەیوەندییەك کە مرۆڤ هەیبێت، بەرەوهەلدێر چوون نابینرێت، کامەیە.

من چاوچنۆکم، من و تەماح، دوولایەنی جیاواز نین. تەنیا شتێك هەیە، ئەویش تەماحە. ئەگەرلە چاوچنۆکی خۆم ئاگاداربم، چی ڕوودەدات؟ من کۆشش دەکەم، لەبەرهۆکارەکانی کۆمەڵناسی یان مەزهەبی، چاوچنۆك نەبم، ئەم کۆششە هەمیشە لە بازنەیەکی بەرتەسکی بچووکدایە. کەوابوو هۆکاری هەڵدێری هەیە، بەلاٚم کاتێ بەوردی و قووڵی زیاتر سەیردەکەم، دەبینم کە پێکهێنەری کۆشش، خودی هۆکاری تەماحە و ئەو بۆخۆی تەماحی وێناکراوە، هەروەها دەبینم کەشتێ بە ناوی " من" و تەماح بەشێوەی جیا لە یەکترنییە. ئەوەی هەیە، تەنیا تەماحە و ئیترهیچ. ئەگەربزانم کە چاوچنۆکم، ئەگەر بزانم کە چاودێری چاو چنۆك بێمانایە، بەڵکو تەماح خودی منم، ئەوکات تەواوی مەسەلەی ئێمە جیاوازدەبێت و کۆششمان لایەنی ڕووخێنەری نابێت.

کاتێ تەواوی بوونتان تەماح پێکیدێنێت، کاتێ هەموو کردەوەکانتان دەبێت بەتەماح، چ دەکەن؟ بەداخەوە ئێمە لەم هێڵە هزریەدا نین. ئەوەی هەیە، "من"، بوونێکی بانترو سەربازێکە کە دەسەڵاتخوازە و کۆنترۆڵ دەکات. بەڕای من، ئەم ڕەوتە وێرانکەرە. هەڵەیەکە و ئێمە هۆکاری جێبەجێ بوونی دەزانین. من خۆم بە زۆرباش و زۆرخراپ دابەشدەکەم تا درێژەم هەبێت،هەنووکە ئەگەر تەنیا و تەنیا تەماح هەبێت، نە" من" وەك هۆکاری تەماح بەڵکو من سەرتاپێ تەماح بم، ئەوکات چی ڕوودەدات؟ گومانێك نییە کەلەوحاڵەدا، بەتەواوی ڕەوتێکی دیکە دەستبەکاردەبێت ومەسەلە دەبێت بەشتێکی تر. ئەمە هەرئەومەسەلەیەیە کە داهێنانی لێبەرهەم دێت، شتێکە کەلەودۆخەدا، " من" ی دەسەڵاتخواز کەدەبێت، بەهەرجۆر(ببێت) بە ئەرێنی یان نەرێنی، نیە. ئەگەرتوانیمان داهێنەربین دەبێت بەم دۆخە بگەین، لەم دۆخەدا، پێکهێنەری کۆشش بوونی نیە. مەسەلە بە قسەکردن یان کۆشش بۆ دۆزینەوەی زات وناوەڕۆکی ئەم هەلومەرجە تایبەت نابێت. ئەگەرلەم ڕێگەدا هەنگاوهەڵبگرن، ڕێگاکە ون دەکەن و هەرگیز بە شوێنێك ناگەن. ئەوەی کە گرنگە ئەمەیە کە ئەوکەسەی تێدەکۆشێت و ئەوشتەی کە کۆششی بۆدەکات، یەکێ بن، شتێکی وا پێویستی بە فام و وشیاری زۆرهەیە. تابزانین کەچۆن زەینی خۆی بە عال — ئاسایش و بوونی بەردەوام — و زۆرخراپ دابەشکردووە، بەڵام هێشتا لە ڕەوتی بیرو بەپەیڕەوی لەمەیش، لە ڕەوتی زەمانەدا ماوەتەوە. ئەگەر بتوانین ئەمە وەك ئەزموونێکی ڕاستەوخۆفام بکەین، ئەوا دەبینین کە هۆکارێکی بە تەواوی جیاوازی دیکە لەدایك دەبێت.

# فەسڵی شانزەیەم

## ئایا بیرکردنەوە دەتوانێت گرفتی ئێمە چارەسەر بکات؟

هزر گرفتی ئێمەی چارەسەرنەکردووە و هەستناکەم هەرگیز چارەسەری بکات. ئێمە دڵمان خۆشکردووە بە هۆشمەندی بۆئەوەی کە ڕێگای دەربازبوون لەم پێچاویەمان بۆدەستنیشان بکات، هەرچی هۆشمەندی زیرەکتر، پڕنهێنی تر و سەیر و سەمەرەتربێت فرە چەشنی سیستەمەکان. تئۆرییەکان، ئیدەکان زیاترە و ئیدەکان هیچ کام لە گرفتەکانی مرۆیی چارەسەرناکەن. نەزەین ڕێچارەی گرفتە، نە ڕێی بیرکردنەوە، ڕێگای دەربازکردنی ئێمەیە لە گرفتەکانمان. بەڕای من، ئێمە دەبێت سەرتا ئەم ڕەوتی بیرکردنەوەیە تێبگەین و لەوانەیە بتوانین لەمەش تێپەرین، لەبەرئەوە کاتێ بیرکردنەوە ڕاوەستێت، ئەوکات لەوانەیە بتوانین ڕێگایەك بدۆزینەوە کە یارمەتیمان بدات لە چارەسەرکردنی گرفتەکانماندا، نەبەشێوەیەکی تاك بەڵکو بەشێوەی کۆمەڵ. بیرکردنەوە گرفتی ئێمەی چارەسەرنەکردووە.

بیرمەند گەلێك وەك فەیلەسوفان، توێژەرانی زانستی وڕێبەرانی سیاسی، هیچ کام لە گرفتەکانی ئێمەیان کە هەمان پەیوەندی نێوان ئێوەوئەوانی ترو نێوان ئێوە ومنە، چارەسەرنەکردووە. تا ئێستا ئێمە زەین و وشیاریمان بۆیارمەتی بەخۆ و بۆلێکۆڵینەوە دەربارەی ئەم گرفتە بەکارهێناوە و هیوادارین کەلەو ڕێگاوە بەڕێگە چارەیەك بگەین. ئایا ڕۆژێ دێت کە بیربتوانێت گرفتی ئێمە چارەسەربکات؟ ئایا هزرهیچ کات لە شتێکی مەرجی کراو کەپشتیوانی خۆی و هۆکاری سەقامگیری خۆیەتی، پێ ئەولاتردەنێت؟ نا، مەگەر ئەوەی کە لە تاقیگە یان لەسەرتابلۆی وێنەکێشاندا بێت!!! ئایا چالاکی هزر، بەدەروخۆیدا نیە؟ ئایا هزرێکی بەم جۆرە دەتوانێت هیچ کام لەوگرفتانەی کەخۆی دایهێناوە، چارەسەربکات؟ ئایا هەرئەو زەینەی کە گرفتی خولقاندووە، دەتوانێت هەرئەو شتانەی کە خۆی هێناویەتییە بەرباس، بیگەیەنێت بەڕێگەچارەیەك؟ بێگومان بیرکردنەوە کاردانەوەیەکە. ئەگەرمن لە ئێوە پرسیارێك بپرسم، ئێوە بەو وەڵامێك دەدەنەوە، وەڵامی ئێوە بە بیرەوەری، دەمارگیری، پەروەردە، بارودۆخ و تەواو هەلومەرجەکانی مەرجی کراوی ئێوە پەیوەندی



هەیە، ئێوە بەگوێرەی ئەوانە وەڵام دەدەنەوە و بەگوێرەی ئەوانە بیردەکەنەوە. ناوەندی ئەم ڕابردووی زەینی " من"ە، لە ڕەوتدا کردەوەیە، تاکاتێك ئەم ڕابردووی زەینییە فام نەکرێت، تاکاتێ کە ئەو ڕەوتی بیرکردنەوە، ئەوخودەی کە گرفتەکانی دروستدەکات، فام نەکرێت وکۆتایی بەکاری نەهێنین، ئەو دژیەکبوون و پارادۆکسانەی دەروون و دەرەوە کە هاتونەتە ناوهزرو سۆز و کردەوە دەست لەسەرمان هەڵناگرن. هیچ چەشنە ڕێگە چارەیەك، هەرچەندە زیرەکانەش بێت، هەرچەندە چاك بیریشی لێکرابێتەوە، بە هیچ جۆرێك ناتوانێ بە ناسازگاری نێوان مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤ — نێوان من وئێوە — کۆتایی بێنێت. کەوابوو، ئێمە بەفامی ئەم مەسەلە و ئاگاداری لە چۆنیەتی سەرهەڵدانی هزرو سەرچاوەکەی دەپرسین: " ئایا لەوانەیە هزر ڕۆژێك بەکۆتایی بگات؟

ئەمە یەکێ لە گرفتەکانە، وانییە؟ ئایا هزردەتوانێت گرفتەکانی ئێمە چارەسەربکات؟ ئایا بە بیرکردنەوە لەسەر گرفتەکان، چارەسەرتان کردووە؟ هەرگرفتێك دەڵێم — ئابووری، جڤاکی، مەزهەبی — ئایا بیرکردنەوە هیچ گرفتێکی چارەسەرکردووە. لە ژیانی ڕۆژانەتاندا، هەرچی زیاتر لە گرفت بیربکەنەوە، گرفتەکە پێچاویتر دەبێ و چارەسەر ناکرێت، مەگەر جیالەمەیە؟ مەبەستم لەژیانی واقعی و ڕۆژانەماندایە. لەوانەیە کە ئێوە، لەکاتی بیرکردنەوە دەربارەی لایەنەکانی گرفت، بۆچوونی کەسێکی دیکە بە ئاشکرا ببینن، بەڵام هزر بەتەواوی گرفتەکە نابینێت، بەڵکوتەنیا بەشێکی دەبینێت و وەڵامی بەشێك، وەڵامی تەواونییە، کەاوبوو، بەڕێگەچارە دانانرێت.

هەرچی زیاتر دەربارەی گرفت بیربکەنەوە، زیاتر لە بارەیەوە توێژینەوە، ڕاڤە و باسدەکەن و گرفت پێچاوی تر دەبێ. کەوابوو ئایا دەکرێ کە بۆ گرفت بە شێوەیەکی گشتی و بەتەواوی بڕوانین؟ ئەم ئیشە بەچ شێوەیەك مەیسەرە؟ چونکە بەوجۆرەی کەمن هەستدەکەم، گرفتی سەرەکی ئێمە ئەمەیە. گرفتەکانی ئێمە ڕوولە زیادبوونە — مەترسی دەسبەجێی شەڕ هەیە- -- لە پەیوەندییەکانی ئێمەدا هەموو جۆرە گرفتێك هەیە، چۆن دەتوانین تەواوی ئەمانە بەشێوەی گشتی و بەشێوەی گشتێك فام بکەین؟ ئاشکرایە، کاتێ دەتوانین چارەسەری گرفت بکەین کەوەك گشتێك بۆی بڕوانین، نەبەش بەش و جیاکراوە. شتێکی وا کەنگێ مەیسەرە؟ بەدڵنیاییەوە، کاتێ کە ڕەوتی بیرکردنەوە — کە ڕکی لە "من"، " خود"، ڕابردووی نەریت، خۆگرتن، دەمارگیری، هیواداری و بێ هیوایی دایە — بە کۆتایی گەیشتبێت. ئایا دەکرێت لە " خود" نەبەراڤەکردن، بەڵکو بە دیتن بەوجۆرەی کە هەیە و ئاگاداربوون لێی وەك

هەقیقەتێك نە وەك تیۆریەك، تێبگەین؟ ئایا دەكرێت بۆ گەیشتن بەئەنجامێ بەدوای لەبەریەك هەڵوەشانی ((خود)) ە نەبین و چالاكی "خود" و"من" بە بەردەوامی لە كردەوەدا ببینین؟ ئایا روانین بۆ ئەوە،بەبێ هیچ جووڵەیەك بۆ ڕووخاندنی یان بۆ سنووردارکردنی، مەیسەرە؟ گرفت ئەمەیە، ئەگەرلە دەروونی هەریەك لە ئێمەدا، ناوەندی "من"، لەگەڵ ئارەزوویەكدا كە بۆ دەسەڵات و پۆست و بەردەوامی و هێشتنەوەی خۆی هەیەتی، نەدەبوو، بێگومان، گرفتی ئێمە لە نێودەچوو.

"خود" گرفتێكە كە هزر ناتوانێت چارەسەری بكات. دەبێت جۆرێ وشیاری كە بنەمای لە هزردا نەبێت بۆ ئەم كارە یارمەتیمان بدات، وشیاری، بێ مەحكووم كردن یان بە شیاوزانینی چالاكییەكانی خود — تەنیا وشیاری — بەسە. ئەگەر وشیاریتان بۆ ئەمەیە كە تێبگەن چۆن گرفتەكە چارەسەربكەن یان ئەمەی كە ئاڵوگۆڕی بەسەردا بێنن، یان بۆئەمەی كەبەئاكامێك بگەن، هەم دیسان لە چوارچێوەی خود و (من) دا ماونەتەوە. تاكاتێك بە دوای ئاكامدا دەگەڕێین، چ لە ڕێگای ڕاڤە، چ لەڕێگای وشیاری، بەیارمەتی توێژینەوەی بەردەوامی هەرهزرێك، هێشتا لە ژێر دەسەڵاتی هزرداین كە لە چوارچیوەی "من "دایەو دەروون، یان هەرچی كە ئێوە ناوی دەنێن. تاكاتێ كە چالاكی زەین هەیە، بەدڵنیاییەوە، ئەشق بوونی نیە، كاتێ عەشق هەبێت، گرفتێ بە ناوگرفتی كۆمەڵایەتیمان نابێت. بەڵام ئەشق شتێ نییە بەدەستی بێنێت؛ لە حاڵێكدا زەین بۆبەدەستهێنانی دەگەڕێت، وەك بیرێكی تازە، ئامرازێكی تازە،جۆرە بیركردنەوەیەكی تازە، بەڵام تا كاتێكە هزر بەدوای بەدەستهێنانی ئەشقەوەیە، زەین لە هەبوونی چۆنایەتی ئەشق بێبەشە، تاكاتێك زەین بەدوای بوونەوە لە بارودۆخی چاوچنۆك نەبووندایە، بەدڵنیاییەوە، هێشتا چاوچنۆكە، هەربەم جۆرە، تا كاتێك زەین ئارەزووی شتێكی هەیە و كارێك دەكات كە بكەوێتە بارودۆخێكەوە، كە لەودا ئەشق هەیە، گومانێك نییە كە ئەوبارودۆخە حاشا لێبكات.

دیتنی ئەم گرفتە، ئەم گرفتە پێچاویەی ژیان و ئاگاداربوون لە ڕەوتی بیركردنەوەی خودی خۆمان، هەروەها زانینی ئەم بابەتە، ئێمە بۆ شوێنی ڕێنوێنیێ ناكات---كاتێ ئەمە بەشێوەی قووڵ بزانین ئەوا بەدڵنیاییەوە جۆرێ دۆخی وشیاری پێكدێت كەنە تایبەت بە تاكەو نە بەكۆ----- ئەوا گرفتی پەیوەندی تاك لەگەڵ كۆمەڵگا، تاك لەگەڵ كۆمەڵ و تاك لەگەڵ ڕاستی، كۆتایی پێدێت، لەبەرئەوە وشیاری یانێ ئەمە، شتێكە نە تایبەتە و نە ناتایبەت. هەستی من ئەمەیە كە تەنیا ئەم وشیارییە و تەنیا هەرئەمە، توانای



چارەسەركردنی گرفتەكانی ئێمەی هەیە. ئەمە جۆرێ دەرئەنجامی نییە و تەنیا كاتێ دێتە ئاراوە كە ئێمە تەواوی و گشت ئەم شێوە بیركردنەوە، نەتەنیا لە ئاستی هەستدا، بەڵكو لە چینە خوارترو شاراوەكانی شعووری نەستی خۆشماندا تێبگەین. بۆتێگەشتنی هەریەك لەم گرفتانە، دەبێت زەینێكی زۆرئارام و لەسەرخۆمان هەبێت، بە جۆرێ كە زەین بتوانێت بێگۆڕان و ڕاڤەی خەیاڵەكان، یان بیرۆكەكان و بێ هیچ شێواندن و دەستكارییەك، سەرنجی گرفت بدات. ئەمە یەكێك لە گرفتەكانی ئێمەیە، لەبەرئەوە هزر بووەتە هۆی لادان. كاتێ بمەوێت شتێك تێبگەم، بۆشتێ بڕوانم، پێویست ناكات لەبارەیەوە بیربكەمەوە، بۆی دەڕوانم. هەركە دەست بەبیركردنەوەبكەین تا دەربارەی شتێ بیرۆكە و باوەڕێك گیربێنین، تووشی لادان هاتووین و لەشتێ كە دەبێت فامی بكەین، دووركەوتووینەتەوە. كەوابوو، كاتێ لەگەڵ گرفتێك بەرەوڕووی دەبین، هزردەبێتە هۆی لادان — مەبەست لەهزر، خەیاڵ، باوەڕ، داوەری و بەراوردە — كەئێمە لە ڕوانین و بەم جۆرە لە تێگەیشتن و چارەسەری مەسەلەكە دوور دەهێڵێتەوە. بەداخەوە، هزربۆ زۆرێك لە ئێمە زۆربایەخی پەیداكردووە. دەڵێین: " چۆن دەتوانم بێ بیركردنەوە، بمێنم؟ چۆن دەتوانم زەینێكی نەنووسراوم هەبێت؟ بۆهەبوونی زەینێكی نەنووسراو، دەبێت بچیتە دۆخێكی ئاشكرا و خەرەفاوی یان هەرچی كەناوی دەنێن و ریفلێكسی غەرزیری ئێوە، نیشانەی نەبوونی ئەم دۆخەیە. بەڵام بەدڵنیاییەوە، زەینێ كە زۆر ئارامە، زەینێكە لە ڕێگای بیركردنەوەی خۆیەوە بەلاڕێدا ناچێت، زەینێ كە كراوەیە، دەتوانێت بە چەشنێكی زۆرسادە و زۆر ڕاستەوخۆ سەرنجی گرفت بدات و تەنیا ڕێگە چارەی گرفت هەرلەم توانای سەرنجدان بە گرفتدایە، بێئەوەی كەهیچ لادانێك ڕووبدات و بۆئەم ئیشەش، دەبێت زەینێكی ئارام وهێمنت هەبێت. زەینێكی بەم چەشنە بەرهەمی شتێك نییە، بەدوایین بەرهەمی كردەوەیەك، بیركردنەوەیەك و كۆنترۆڵێك ناژمێردرێت. بێ هیچ دیسیپلین یان زۆر یان سەرنجێك بۆدونیای سەرەوە، بێ هیچ كۆششێ لەلایەن"من" ولەلایەن هزرەوە، بەرهەم دێت. كاتێ پێكدێت كە من ڕەوتی گشتی بیركردنەوە تێبگەم، كاتێك ڕاستییەك بێ چاوپۆشیكردن ببینم. لەودۆخە هێمن و ئارامە راستەقینەی زەیندا، ئەشق بوونی خۆی رادەگەیەنێت و تەنیا شتێ كەدەتوانێت گرفتەكانی مرۆڤ چارەسەربكات، عە_شقە

# فەسڵی حەڤدەیەم

## ئەرکی زەین

کاتێ ئێوە زەینی خۆتان دەخەنە ژێرچاودێری، نەتەنیا چینەکانی بەناو سەرەوەی زەین دەبینن، بەڵکو خەریکی ڕوانینی نەستیش دەبن. یانێ ئێوە چاودێری ئیشە پراکتیەکەکانی زەین دەکەن. بەم جۆرە نییە؟ ئەمە تەنیاڕێگەی توێژینەوەیە لەلایەن ئێوەوە. ئەوەی کەزەین دەبێت ئەنجامیبدات، ئەوەی کە دەبێت بیربکاتەوە و ئەنجامیبدات و کاروباری لەم چەشنە مەسەپێنن بەسەر زەیندا. لەبەرئەوە، کاری زەین ئاکامێکی جگە لەهەندێ دەربڕین نابێت. بەدەربڕێنکی تر، ئەگەر ئێوە بڵێن کە زەین دەبێت ئەم ئیشە ئەنجامبدات و ئەوئیشە ئەنجامنەدات، لەوحاڵەدا، تەواوی توێژینەوە و بیرکردنەوەکانتان ڕاگرتووە. گێڕانەوەی قسە لە دەسەلأتداران و پسپۆڕانیش هەرئەو ئاکامەی دەبێت. ئەگەر ئێوە لە بوودا، مەسیح، ئێکس و وای و زد گەواهی بدەن، بە هەموو بە دواداچوون، بیرکردنەوە و لێکۆڵینەوەکان کۆتایتان هێناوە. کەوابوو، دەبێت خۆمان لەهەمبەرئەوانەدا بپارێزین. ئەگەر دەربارەی گرفتی "خود" هەروەها "من" بیربکەینەوە، دەبێت نەرمی هێمنی زەین بەلاوەنێین.

ئەرکی زەین چییە؟ بۆتێگەیشتنی، دەبێت بزانین کە ئیشی راستەقینەی زەین چییە؟ زەینی ئێوە چ کارێك دەکات؟ تەواوی زەین ڕەوتێکی بیرکردنەوەیە، ئەگەر وانەبێت، زەینێ لەوێدا نەدەبوو. تاکاتێك زەین خۆویستانە یان خۆنەویستانە بیرناکاتەوە، هەستی وشیاربوونی نییە. ئێمە دەبێت تێبگەین کە زەینێکە لە ژیانی ڕۆژانەماندا کەڵکی لێوەر دەگرین، هەروەها زەینێکە زۆربەی ئێمە لە بوونی ئاگادارنین، لە پەیوەندی لەگەڵ گرفتەکانی ئێمەدا چ کارێك دەکات. دەبێت بۆزەین بەوجۆرەی کە هەیە، نە بەو جۆرەی کە دەبێت ببێت، بڕوانین.

ئێستا بزانین زەین هەربەوجۆرەی کە هەیە، چ ئەرکێك جێبەجێ دەکات. لەڕاستیدا زەین ڕەوتێکی تەریك خوازە. لەبنەڕەتدا ئەم ڕەوتە تایبەتە بە هزر. زەین، بیکردنەوەیە بەشێوەیەکی گۆشەگیرانە؛ کەوابوو بەشێوەی کۆ دەمێنێتەوە. کاتێ سەرنجی بیرکردنەوەی



خۆتان دەدەن، دەزانن کە ڕەوتێکی گۆشەگیرو لەت لەت بووە. بیرکردنەوەی ئێوە بەپێی کاردانەوەکانی ئێوەیە، کاردانەوەکانی بیرەوەری، ئەزموون، زانست و باوەڕی ئێوە. ئێوە لەبەرامبەر هەموو ئەمانەوە کاردانەوەتان دەبێت. ئەگەر من بڵێم کەدەبێت شۆڕشێکی بنەڕەتی ڕووبدات، ئێوە گورج دژکردەوە ئەنجامدەدەن. ئەگەر سەرمایە گوزاری زۆرتان کردبێت — چ مەعنەوی وچ جۆریتر — بەوشەی "شۆڕش" ناڕەزایەتی دەنوێنن. کەوابوو کاردانەوەی ئێوە بە زانست، باوەڕ و ئەزموونی ئێوەوە پەیوەندی هەیە. ئەمە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە. کاردانەوەکان جۆراو جۆرن. دەڵێن: " من دەبێت برایانە ڕەفتاربکەم"، دەبێت هاوکاری بکەم"میهرەبان بم، " سۆزم هەبێت " و لەم جۆرە قسانە. مانای ئەم قسانە چییە؟ تەواوی ئەمانە کاردانەوەن، بەلأم کاردانەوەی بنەڕەتی زەینی بیرکردنەوە ڕەوتی گۆشەگیرییە. ئێوە — یەکەیەکەتان — مژوڵی چاودێری بەسەر ڕەوتی زەینی خۆتاندان، یانێ مژوڵی چاودێری پڕاکتیك، باوەڕوزانست و ئەزموونی خۆتانن. تەواوی ئەمانە بەدڵنیاییەوە بە ئێوە ئارامی دەدەن و بە رەوتی بیرکردنەوە هێمنی ودەسەلأت دەدەن. ئەم ڕەوتە تەنیا "من"، " زەین" و "خود" بەهێزدەکات. چ ئەم((خودە)) بە نایاب بزانن و چ بە زۆر خراپ. تەواوی مەزهەبەکانی ئێمە، تەواوی سزا کۆمەلأیەتییەکان، هەموو یاساکانمان کە رازین لە سەر پشتگیری کردنی تاك، تاك یەکانگیرە و پراکتێك جیاوازیخوازە و نەیاری ئەم دۆخە، دەتوانین ئاماژە بە حاڵەتی تۆتالیتەر بدەین.

ئەگەر لە نەستدا دەست بە لێکۆڵینەوەی وردتر بکەین، هەر ئەو رەوتە لەوێدا دەبینین کە بەشدارە، هەموومان وەك کۆمەڵێکین کە کەوتووینەتە ژێر کارێگەری هەلومەرج، دەورووبەر، کۆمەڵگا، دایك، باب و باپیرە. لەوێدایش ئارەزووی ململانێ و بالأدەست بوون وەك تاك و((من)) بوونی هەیە.

ئایا کردەوەی زەین، بەوجۆرەی کەئێمە رابردووەکەیمان هەیە و بەو جۆرەی کە ئێمە ڕۆژانە ئەنجامیدەدەین، رەوتێکی تەریك خواز نییە؟ ئایا ئێوە بە دوای فیداکاری تاکەوە نین؟ ئێوە دەتانەوێت لە دوا رۆژدا ببنە کەسێك یا هەر لەم دونیا دەتانەوێت ببنە گەورە پیاوێك یا نووسەرێکی پایەبەرز. تەواو حەزەکانی ئێمە لە سەر ئەمەیە کە لە یەکتر جیا ببینەوە. ئایا زەین جگە لەمە کارێکی دیکەی لە دەست دێت؟ ئایا بۆ زەین ئەم دەرفەتە هەیە کە بە شێوەی جیاوازی خوازی لە خۆ چەقیو و لەت لەت بوو بیرنەکاتەوە؟ شتی وا مەیسەر نیە. کەوابوو ئێمە زەین دەپەرستین، زەین بە چەشنێکی بێ وێنە بایەخی بۆمان هەیە. مەگەر نەتان

دیوەکاتێك کە توزێك زیرەکی و وشیاری لە خۆتان پێشاندەدەن و تۆزێ زانست و زانیاری کۆ کراوەتان هەیە، چەندە لە کۆمەلگا بایەخ پەیدا دەکەن؟ ئایا بەمەتان زانیوە کەسانێك لە رووی وشیارییەوە بانترن، وەك مافناسان، مامۆستایان، وتاربێژان، نووسەرانی گەورە، راڤە کاران چلۆن دەپەرستن! زیرەکی و زەین ئێوە پەروەردەی دەکەن.

کاری زەین ئەوەیە کە جیا بێت، ئەگەر وا نەبێت، زەین نیە. بە سەرنجدان بەوەی کەچەندین سەدەیە ئەم رەوتە پەروەردە دەکەین، دەبینین کە شارەزای هاوکاری نین، تەنیا دەبێت ناچارمان بکەن، ناچار بین و بە هۆی دەسەلاٚتداران و ترسەوە----ترسی ئابووری یان مەزهەبی_ بەرێوەبچین. ئەگەر دۆخی راستەقینە ئەمەیە، نەك تەنیا بە شێوەی خۆ ویست، بەلکو هەروەها لە ئارەزووە، بریار و بە دواداچوونەکانماندا، چلۆن ئەکرێت چاوەریێ هاوکاری بین؟ چلۆن دەکرێت کۆبوونەوەی رۆشنبیریت هەبێ بۆ جێ بە جێ کردنی کارێك؟ چونکە ئەم کارە مەیسەر نابێت، مەزهەبەکان و حزبە کۆمەلاٚیەتییەکان، ریکخراوەکان،تاك ناچار دەکەن کەشێوەی رێك و پێکی تایبەت بە خۆ بگرن، ئەو کات بۆ کۆبوونەوە و پێکەوە کارکردن، دیسپلین دەسەپێت. تا کاتێك نەزانین چلۆن ئەکرێت بەم هزرە جیاوازی خوازە و ئەم رەوتە پێداگرە لە سەر((من))و((هی من))، چ بە شێوەی تاك و چ بە شێوەی کۆ، گەشە پێ بدەین. هیچ کات ئاشتی و ئارامی بە دەست ناهینین و رووبەرووی دژایەتی و شەڕی هەمیشەیی دەبینەوە. گرفتی ئێمە ئەوەیە کە چلۆن کۆتایی بەم رەوتە بیرکردنەوەی جیاوازی خوازە بێنین. ئێستا کە بیرکردنەوە رەوتی قسەکردن و کاردانەوەیە، ئایادەتوانێت((خود)) لە نێو ببات؟ هزر شتێك نییە جیا لە کاردانەوە، هزر ناتوانێت داهینان بکات. ئایا وەها هزرێك دەتوانێت کۆتایی بە بوونی خۆی بێنێت؟ ئەمە هەر ئەو شتەیە کە ئێمە هەولّدەدەین بیدوزینەوە. کاتێ ئاراستەی بۆچوونی من لە سەر ئەم جۆرە میتۆدەیە کە: ((من دەبێت دیسپلین بدەم))،((دەبێت دروستتر بیر بکەمەوە))، ((دەبێت فلان و فیسار کار ئەنجامبدەم))، ((هزر مژولی پالّنەر و زۆر و دیسپلینی خۆیەتی تا شتێ بێت یان نەبێت. ئایا ئەم رەوتە تەریك خواز نییە؟ کەوابوو شتی بە ناوی زیرەکی تەواو کە بە شێوەی گشتێك کار بکات و چاوەروانی هاوکاری لێ بکرێت، بوونی نییە. چلۆن دەبێت بگەینە کۆتایی هزر. یان چاکتر وایە بلّێین، چلۆن هزر، هزرێك کە گوشەگیر، لەت لەت و بەش بەش کراوە، دەبێت کۆتایی پێ بێت؟ چلۆن دەبێت ئیشەکە دەست پێ بکرێت؟ ئایا ئەم بە ناو دیسپلینی ئێوە، لە نێو دەبات؟ ئاشکرایە کەلە



ماوەی ئەم سالاٚنەدا سەرکەوتنێکتان بە دەست نەهێناوە، ئەگینا لێرەدا نەدەبوون. تکایە لەم رەوتە دیسپلین خوازە کە تەنیا رەوتێکی هزرییە و لەودا خستنەداو، سەرکوت،کۆنترۆل و دەسەلاٚت خوازی بوونی هەیە و تەواوی ئەمانە لە سەر نەست کە دواتر هاوتەریب لە گەلّ پیربوونی ئێوە دێنە ئاراوە، تۆیژینەوە بکەن. هەنووکە دوای ئەم کۆششە دوور و درێژ و بێ ئاکامە دەبێت تیگەیشتن کە دیسپلین، بە دلّنیاییەوە، رەوتێ: نییە کە((خود)) لە نێو ببات. ناکرێت بە دیسپلین((خود)) لە نێو بەرێت، لە بەر ئەوە دیسپلین رەوتی بە هێز کردنی خودە. کەوابوو،تەواوی مەزهەبەکان پشتیوانی لێدەکەن و تەواو بیرکردنەوە و بانگەشەکانی ئێمە لە سەر بنەمای ئەویە.

ئایا زانست((خود)) لە نێو دەبات؟ ئەی باوەر چی؟ بە واتایەکی تر، ئایا هیچ کام لەو کار و چالاکییانەی کە هەنووکە بە مەبەستی گەیشتن بە بنەما و ریشەی((خود)) ئەنجامی دەدەین، سەرکەوتن بە دەست دێنێت؟ئایا هەموو ئەم کارانە، بە لە کیس چوونێکی بنچینەیی لە رەوتێکی فیکری کە رەوتی گۆشەگیری و کاردانەوەیە، نایێتە ئەژمار؟ کاتێك کە بە شێوەی بنەرەتی و قوولّ تێدەگەین کە بیر ناتوانێت بە بوونی خود کۆتایی بینێت، چ دەکەن؟ چی روو دەدات؟ ئاگاداری خود بن. کاتی ئێوە بە تەواوی لەم راستییە ئاگادارن، چی روودەدات؟ دەزانن کە هەموو کاردانەوەکان مەرجی کراوە، ئەمەش دەزانن کە لە بەرئەم مەرجی بوونە شتی بە ناوی ئازادی نەك لە سەرتاوە و نەك لە بنەڕەتا بوونی نییە و ئازادی هەمیشە لە سەرتادایە، نەك لە بنەتا. کاتێك تێدەگەن کە هەر چەشنە کاردانەوەیەك جۆرێك مەرجی بوونە. لەم رووەوە،((خود)) بە شێوەی جۆراوجۆر بەردەوام دەبێتەوە. لە راستیدا چ شتێك روو دەدات. دەبێت لەم مەسەلەدا زۆر وشیار بن. باوەر، زانست، دیسپلین، ئەزموون، تەواوی رەوتی گەیشتن بە ئەنجامێك یان ئامانجێکی کۆتایی، فراوانخوازی، بە شتێ بوون لەم ژینەدا یان لە ژیانی داهاتوودا، تەواوی ئەمانە رەوتێکی تەریك خوازە، رەوتێ کە وێرانی بەلاٚ و شەڕ دروستدەکات و کاری بە کۆمەلّ_ هەرچەندەش هەڕەشە بۆ راگرتنی لە کەمپەکان و شتانی لەم جۆرەش زیاد بێت_ ریگای دوور کەوتنەوە لەم رەوتە نییە. ئایا ئێوە ئاگاداری ئەم راستییەن؟ بارودۆخی زەینێ: کە دەلّێت: ((بەم جۆرەیە))، ((گرفتی من ئەمەیە))،((من بە راستی لێرەدام))، ((لە توانایی زانست و دیسپلین ئاگادارم و دەزانم فراوانخوازی چ دەکات)) چۆنە؟ بە دلّنیاییەوە ئەگەر ئێوە هەموو ئەم شتانە دەزانن، کە وابوو هەنووکە رەوەتێکی دیکە لە ئارادایە.

ئێمە ریگاکانی زیرەکی دەزانین، بەلاّم ریگای عەشق نـابینین. ریگـای عەشـق نابێـت لـە ریگای زیرەکییەوە بە دەست بێت. زیرەکی، بە تەواوی لق و پۆ، ئینتما و فـراوان خـوازی و بـە دواداچونەکانی دەبێت بە کۆتایی بگات تا رێگا بۆ لە دایك بوونی ئەشق خۆش بکات.

دەزانن ئەو کاتەی کە عاشقن روو لە هاوکاری دەنـێن و لـە بـیری((خـود)) دا نـین؟ ئەمـە بەرزترین شێوەی زیرەکییە، نە کاتێك بە شێوەی بوونەوەرێکی شـەریف ئاشـقن یـان کاتـێ پۆستێکی شیاوتان هەیە کە شتێ جگە لە ترس نییە. کاتی بەرژەوەندی دیـاریکراوی ئێـوە لـە جییێ خۆیدایە، ئەشق بێ مانایە. تەنیا شتێ کە هەیە، رەوتی چەوساندنەوەیە کـە لـە ترسـەوە سەرچاوەی گرتووە. کەواتە ئەشق سەردەمێ سەرهەڵدێنێ کە زەین لەودا ریگای نەبێت. کـە وا بوو دەبێت ئاگاداری تەواوی رەوتی زەین و ئەرکەکانی بن.

تەنیا کاتێك شێوازی دەربڕینی خۆشەویستی بە یەکتر بزانین، هاوکاری، کردەی تیکەڵ بە زیرەکی و کۆبوونەوە بۆ چارەسەری گرفتەکان پێکدێت. تەنیا لەو کاتە دایە کە دەزانـین خـوا کییە و راستی چییە؟ هەنووکە ئێمە تیدەکۆشین کە لە ریگای زیرەکی و گیراڤـەوە_کـە بـت پەرسـتییە_ راسـتی بـە دەسـت بیـنین. تـەنیا کاتێکـە_ لـە رێگـای فـام_ تـەواوی پێکهاتـەی((خـود)) بهاوێژینـە دوور، ئـەوەی بـێ کۆتاییـە، جیـا لـە زمانـە و ناپێورێـت دروستدەبیت. ئێوە نا توانن بۆ لای ئەو بچن، ئەو خۆی بەرەو لای ئێوە دێت.

# فەسڵی هەژدەیەم

## خۆخەڵەتاندن

دڵم دەخوازێت مەسەلەی خۆخەڵەتاندن یان ئەو خەیاڵە پووچانەی کە زەینی مرۆڤ خۆی دەدات بە دەستیانەوە و دەیسەپێنێت بەسەرخۆی و ئەوانیتردا، بخەینە ژێرسەرنج و ڕوانینمان یان دەربارەی باس و گفتوگۆبکەین. ئەمە باسێکی زۆرجددیە، بەتایبەت لەم جۆرە قەیرانەی کە دونیا لەگەڵی بەرەو ڕووە، بەلاّم بۆ تێگەشتنی تەواوی ئەم مەسەلەی خۆخەڵەتاندنە دەبێت ئەوە نەلەئاستی وشەدا، بەڵکو بەشێوازێکی دەروونی، بنەڕەتی و قووڵ بەدوایدا بچین. وشەکان و دژی وشەکان ئێمە بەئاسانی ڕازی دەکەن، ئێمە لە کاروباری دونیاییدا ئاقڵین و لەبەرئاقڵ بوون لە کارەکانی دونیادا تەنیا ئیشێك کە دەتوانین ئەنجامی بدەین ئەوەیە کە هیواداربین شتێ ڕووبدات.

دەزانین کە باسکردنی شەڕ نابێتە کۆسپی سەرهەڵدانی شەڕ، مێژووناسان، مەزهەبییەکان، شارەزایانی زانستی ئیلاهی کە شەڕ پێناسە دەکەن و هۆکارەکانی سەرهەڵدانی باسدەکەن؛ هۆکارەکانی سەرهەڵدانی لەژمار نەهاتوو دەزانن، بەلاّم دووبارە شەڕەکان، لەوانەیە ڕووخێنەرتر لەوەی کە تائێستا بوونە، درێژەیان هەیە. کەسانێ لە ئێمە کە بەڕاستی جیدین، دەبێت لە سنووری قسە پێ ئەولاتر بنێین، دەبێت لە دەروونی خۆیاندا بگەڕێن بە دوای ئەم شۆڕشە بنەڕەتییەدا. ئەمە تەنیا عیلاجێکە کە دەتوانێت بۆمرۆڤ ئازادی هەمیشەیی و بنچینەیی بە دیاری بێنێت. هەروەها کاتێ دەربارەی ئەم جۆرە خۆخەڵەتاندنە قسە دەکەین، هەستدەکەین دەبێت لە بەرامبەر هەرجۆرە باسکردن و وەلاّمی دیفاعی ڕووکەشیانە دژایەتی بکەین. ئێمە دەبێت، ئەگەربکرێت پێشنیازی وابکرێت، نەتەنیا گوێ بۆ بێژەر بگرین، بەڵکو گرفتەکە بەو جۆرەی کەلە ژیانی ڕۆژانەماندا دەیناسین، شوێن بگرین. بە دەربڕینێکی تر، ئێمە دەبێت لە کاتی بیرکردنەوە و کردەوەدا چاودێری خۆمان بین و چاودێربین کە بە چ شێوەیەك کاریگەری لەسەر ئەوانیتر دادەنێین و چۆن خۆمان کارەکە بە کارامەیی ئەنجامدەدەین.



هۆکار و بنەمای خۆخەڵەتاندن چییە؟ چەند کەس لە ئێمە بەڕاستی دەزانین کە خەریکین خۆمان دەخڵە تێنین؟ بەرلەوەی کە بتوانین بە پرسیاری؛ ((خۆخەڵەتاندن چییە و چۆن دروستدەبێت)) وەلاّم بدەینەوە، ئایا نابێت لە مەسەلەکە ئاگاداربین کە ئێمە خۆمان دەخڵەتێنین؟ ئایا دەزانین کە خۆمان دەخڵەتێنین؟ مەبەستمان لەم فریوە چییە؟ هەستدەکەم زۆر گرنگە، لەبەرئەوە هەرچی زیاتر خۆمان دەخڵەتێنین، هێزی فریو زیاتردەبێت.لەبەرئەوە ئەم کارە جۆرێ شادمانی، وزە و جۆری توانایی بە ئێمە دەدات کە ئاکامەکەی سەپاندنی فریوی خۆمانە بەسەر ئەوانیتردا. کەوابوو بەرە بەرە ئێمە نە تەنیا فریو دەسەپێنین بەسەرخۆماندا، بەڵکو دەیسەپێنین بەسەر ئەوانیتریشدا. شتێکی وا شێوازی دانوستانی فریوە. ئایا ئیمە لە بوونی ئەم ڕەوتە ئاگادارین؟ ئێمە هەستدەکەین کە دەسەلاّتی ئەوەمان هەیە بە شێوەیەکی ڕوون، هەدەف مەند و ڕاستەوخۆ بیربکەینەوە، بەلاّم ئایا دەزانین کەلەم شێوازە بیرکردنەوەدا خۆخەڵەتاندن هەیە؟

ئایا فیکر بۆخۆی ڕەوتێکی گەڕان، بە دواداچوون و پاساو و شێوازێك بۆئاسایش و خۆخەڵەتاندن نییە؟ ئایا ئەمە ئارەزوو نییە کە خەڵك دەربارەی ئێمە چاك بیربکەنەوە یان پۆست و بایەخ و دەسەلاّتمان هەبێت؟ ئایا ئەم ئارەزووە، لە ڕووی سیاسی یان مەزهەبی و کۆمەڵناسییەوە ناتوانێت هۆی سەرەکی خۆخەڵەتاندن بێت؟ هەرلەو چرکەیەدا کە من خوازیاری شتێك دەبم، جگەلە پێداویستییە داراییە سەرەتاییەکان، ئایا هۆکاری بارودۆخێك نیم کەبەئاسانی وەردەگریت؟ نموونەیەك باسدەکەم، فرێ لە ئێمە حەز دەکەین بزانین دوای مردن چ شتێ ڕوودەدات؟ هەرچی پیرتربین ئۆگریمان زیاترە. دەمانەوێت ڕاستی مەسەلەکە تێبگەین. بە چ شێوەیەك تێدەگەین؟ بەدڵنیاییەوە نە لە ڕێگای خوێندن و نە لە ڕێگای باسکردنی هەمەلایەنە.

بە چ شێوەیەك لێیتێدەگەین؟ سەرەتا دەبێت زەینی خۆت لە هەر هۆکارێك کە ڕێگرە — تەواوی هیواکان، تەواوی ئەو ئارەزووانەی کە بەردەوامن و هەموو ئەو حەزانەی کەبە دوای ئەوەوەن لەولاوە چ شتێ دەدۆزیتەوە — خاوێن بکەینەوە. لەوێڕا کە زەین هەمیشە بەدوای ئاسایشەوەیە، حەزدەکات بەردەوام بێت و هیواداره کە ئامرازێك بۆ سەلماندنی خۆی و بۆ بوونی داهاتووی بدۆزێتەوە. زەینێکی وا ڕاستە کە بەدوای دۆزینەوەی ڕاستی ژیانی دوای مردنە کە ناوی گۆڕان یان هەرچی کەهەیە. بەلاّم ناتوانین ڕاستی بدۆزینەوە. ئەوەی کە بایەخی هەیە ئەمە نییە کە ئایا تناسخ ڕاستە یان نا، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە چۆن زەین لە ڕێگای

خۆخەڵەتاندنەوە خەریکی پاساوی ڕاستییەکە کە لەوانەیە بوونی هەبێت یان نەبێت. ئەوەی کە گرنگە شێوەی بەرەو ڕووبونەوەی لەگەڵ مەسەلەکەدایە، یانێ ئەمەی کە بە چ پاڵنەرێك یا چ راکێشێك، یا چ مەیلێك بەرەو ئەو گرفتە دەڕۆن

کەسێ کە بەدوای شتەکاندا دەگەڕێت هەمیشە ئەم فریوە بەسەرخۆیدا دەسەپێنێت، هیچ کەس ناتوانێت ئەوە بسەپێنێت بەسەر ئەودا، ئەم ئیشە بە دەستی خودی ئەو ئەنجامدەبێت. ئێمە فریوی خەلق دەکەین، ئەوجا دەبین بە کۆیلەی. هۆکاری بنەڕەتی خۆخەڵەتاندن، حەزی بێبڕانەوەی بە شتێ بوون لەم دونیاو لەدونیای دوای ئەمەدایە. ئێمە ئاکامی مەیل بەشتێ بوون لەم دونیا دەزانین. بەرهەمەکەی شێواوی تەواوە، لە شوێنێکدا کە هەرکەس لەگەڵ ئەویتر خەریکی کێبڕکێیە، هەرکەس بە ناوی ئاشتییەوە ئەویتر دەکوژێ و دەبڕێ. ئێوە لەگەڵ تەواوی ئەم یارییەی کە پێکەوە دەیکەین، لەگەڵ شتێ کە شێوەیەکی بێوێنە لە خۆخەڵەتاندنە، شارەزان. هەروەها ئێمە خوازیاری پۆست و ئاسایش لە دونیای دیکەداین.

کەواتە، هەرئەو چرکەی کە ئەم راکێش کردنە درۆینانە بۆ بوون، بۆکران و بۆگەیشتن دەستپێدەکات، خۆخەڵەتاندنیش دەستپێدەکات، ئەمە ئەو شتەیە کە زەین بە ئاسانی ناتوانێت لێی رزگاربێت. ئەمە یەکێ لە گرفتە سەرەکییەکانی ژیانی ئێمەیە. ئایا دەکرێت لەم دونیا ژیان بکەن و شتێ نەبن. تەنیا ئەو کاتە دەکرێت لە بەندوداوی هەموو فریوەکان ڕزگاربین. لەبەر ئەوە تەنیا لەوکاتەدایە کە زەین لە بەدواداچوونی ئەنجام، لەگەڕاندان بە دوای وەلامێکدا کە ڕازی بکات، لە گەڕان بەدوای هیچ چەشنە پاساوێکدا، لە گەڕان بەدوای هیچ چەشنە ئاسایشێك لە پەیوەندی لەگەڵ هیچ شتێکدا، نابێت. شتێکی وانییە کاتێ ڕوودەدات کە زەین پێداویستی و دەقیقەکانی فریوبناسێت و بەم جۆرە، بەفام و فامین، هەرچەشنە پاساو وئاسایشێك وێڵ و ئازاد بکات کە ماناکەی ئەوەیە کەلەوکاتەدا، زەین توانایی هیچ بوونی تەواوی هەیە. ئایا شتێ وانییە لە کران هاتووە؟. تاکاتێك بەهەرشێوەیەك، ئێمە خۆمان دەخڵەتێنین، ئەشق بوونی نابێت. تا ئەودەمەی کە زەین تواناى داهێنان و سەپانی خەیاڵی پووچی بەسەرخۆیدا هەیە، بە دڵنیاییەوە خۆی لە تێگەیشتنی گشتی بێبەری دەکات. یەکێ لە گرفتەکانی ئێمە ئەوەیە کە شێوازی هاریکاری نازانین.

تەنیا شتێ کە دەزانین، پێکەوە کارکردن بۆ گەیشتن بە ئاکامێك کە خۆمان پێکیدێنین. هاریکاری کاتێ مەیسەرە کە ئێوە ومن ئامانجێکی هاوبەشمان کە فیکر دایهێنابێت، نەبێت.



ئەوەی کە دەبێ بیزانین ئەوەیە کە هاوکاری تەنیا و تەنیا کاتێ مەیسەرە کە ئێوە و من ئارەزووی ئەمەمان نەبێت کە ببین بەشتێك. هەرکات ئیوە و من بمانەوێت ببین بە شتێك ئەوکاتە باوەڕ و شتی دیکە پێویست دەبن و ئۆتۆپیایەك کەخۆت وێنەت کێشاوە پێویست دەکات. بەلاّم ئەگەر ئێوە ومن بەشێوەیەکی نەناسراو، بێ خۆ خلەتاندن، بێ هیچ بەربەستێکی باوەڕی وزانستی و بێ حەزکردن لە ئاسایش، زیرەك بین، ئەوا هاوکاری ڕاستەقینە بوونی دەبێت.

ئایا بۆئێمە دەرفەتی هاریکاری و لە دەور یەك کۆبوونەوە بێئەوەی کە ئامانجێکمان لەبەر چاوبێت هەیە؟ ئایا ئێوە و من دەتوانین بێ ئەوەی کە بە دوای ئەنجامێکەوە بین، پێکەوە کار بکەین؟ گومانێك نییە کە هاوکاری راستەقینە وایە.

ئەگەر ئێوە و من لە بیری ئەنجامدا بین، بۆ ئەنجامەکە هەوڵبدەین و بۆ ئەنجام، پلان دابنێین و لە گەڵ یەکتر بۆ گەیشتن بەوئەنجامە کار بکەین، ڕەوتێکی وا ناوی چییە؟ فیکرمان و زەینە وشیارەکانمان بە دڵنیاییەوە پێکەوەن، بەلاّم لە رووی سۆزەوە لەوانەیە تەواوی بوونمان لە بەرامبەریدا رادەوستێت، شتێ کە فریو خەڵقدەکات، شتێ کە لە نێوان ئێوە و (من) دا ناسازگاری دروستدەکات.

ئەمە راستییێکی روونە. لە ژیانی رۆژانەماندا و دەکرێت ببینرێت. ئێوە و من پێکەوە دەسازێین کە کارێك بە شێوەێکی روشنبیرانە جێ بە جێ بکەین. بەلاّم بە شێوەیەکی خۆ نەویست و لە دەروونەوە، ئێوە و من دژایەتی یەکتر دەکەین. من بۆ رازی کردنی خۆم بە دوای ئەنجامەوەم، من بە دوای دەسەلاّت خوازیەوەم، دەخوازم ناوم لە پێش ناوی ئێوەوە بێت، لێ گەرێین کە بە من دەلێین لە گەڵ ئێوەدا کار دەکەم. کەوابوو، هەر دووی ئێمە کە داهێنەری ئەو پرۆژەیەن، لە راستیدا لە بەرامبەر یەکتردا راوەستاوین، گەر چی بە ڕەواڵەت من وتۆ لە سەر ئەو پرۆژە رەزامەندیمان دەڕبڕیوە. ئایا ئەمە گرنگ نییە کە تێبگەین ئێوە و من دەتوانین پێکەوە هاوکاری بکەین و فیکر و هەستمان یەکێك بێت و لە دونیایەکدا کە ئێوە و من هیچین، سەر هەلێنین؟ ئایا دەتوانین بە شێوەیەکی راست و دروست پێکەوە هاوکاریمان هەبێت، نەك بە رەواڵەت، بەلکو بە شێوەیەکی بنچینەیی؟ ئەمە یەکێ لە گەورەترین دژوارییەکانی ئێمەیە، لەوانەیە گەورەترین دژواریمان بێت. من خۆم لە گەڵ شتێکدا یەکسان دەکەم وتۆیش خۆت لە گەڵ هەمان شت. ئێمە هەر دوومان ئۆگری ئەوین، هەر دوو دەمانەوێت ئەو شتە رووبدات. بە دڵناییەوە رەوتێکی وا بیرکردنەوەیەکی زۆر

رووکەشیانەیە، لە بەر ئەوە ئێمە بە هۆی هاوشێوە سازی جیایی دروستدەکەین، شتێ کە لە ژیانی ئەمڕۆی ئێمەدا زۆر روونە. ئێوە هیندون و من کاسولێك، هەر دوو بانگەشەی برایەتی دەکەین، بەلاّم لە راستیدا گەرووی یەکتر دەگوشین، بۆچی؟ ئەمە یەکێ لە گرفتەکانی ئێمەیە، وانیە؟ ئێوە بە شێوەیەکی خۆ نەویست و قووڵ، باوەڕی خۆتان هەیە و منیش باوەڕی خۆم هەیە. بە قسە کردن دەربارەی برایەتی لە چارەسەرکردنی گرفتی گشتی باوەڕەکاندا سەرکەوتنمان بە دەس نەهێناوە بەلاّم تەنیا بە شێوەی تیۆری و بە شێوەیەکی رۆشنبیرانە پێکەوەسازاوین کە دەبێت وا بێت. بەلاّم لە دەروونەوە پێکەوە دژین. تا کاتێك ئەم رێگرە کە جۆرێ خۆ خەلەتاندنە و بە ئێمە جۆری شادمانی دەدات، لە نێو نەبەین. نێوان ئێوە و من هیچ جۆرە هاوکارییەك بوونی نابێت، هاوکاری لە ریگای هاوشێوە بوون لە گەڵ گرووپێك، ئایدیایەکی دیاریکراو و ولاّتێکی تایبەت، هەرگیز دروستنابێت.

باوەڕ هاوکاری دروستناکات، بە پیچەوانەوە جیایی دەخولّقێنێت. دەیبینین کە چلۆن حزبێکیی سیاسی، دژی ئەویترە و هەر کام باوەڕی بە جۆرێ رووبەروبوونەوە لە گەڵ گرفتە ئابوورییەکاندا هەیە و سەرئەنجام هەموو پێکەوە لە شەر و دژایەتی دان. بۆ نموونە ئەوان نین بە دوای دوزینەوەی ریگە چارەیەك بۆ گرفتی برسییەتی.بیری ئەوان بە لای ئەو بیرۆکانەوەیە کە دەیانەوێت ئەو گرفتە چارەسەر بکەن. ئەوان بە راستی سەرنجی خودی گرفتەکان نادەن، بەڵکو بیریان بە لای ئەو میتۆدانەوەیە کە لە رێگای ئەوانەوە گرفت چارەسەر دەبێت. کەوابوو، دەبێت لە نێوان ئەم دووانەدا شەڕ بێت، لە بەر ئەوە ئەوان بەستراوە بە خەیاڵ نەك گرفت. هەروەها کەسانی بە باوەڕیش دژی یەکترن، ئەوان دەڵێن_ هەڵبەتە بە شێوەی زارەکی_ ژیانێك و باوەڕێکیان هەیە. خۆمان هەمووی ئەم مەسەلانە دەزانین. بەلاّم باوەڕ، مەرام و ئەزموونیان لە دەروونەوە خەریکی لە نێو بردنی ئەوانە و ئەوانی لێك جیا کردووەتەوە.

ئەزموون لە پەیوەندی مرۆیی ئێمەدا دەبێتە هۆکارێکی شیکەرەوە، ئەزموون شێوەیێکی فریوە. ئەگەر من شتێکم ئەزموون کردبێت، پێداگری لەسەر دەکەم،من بیر لە گشت گرفتی رەوتی ئەزموونەکە ناکەمەوە، بەلاّم لە بەر ئەوەی ئەزموونم کردووە، بەسە، کە وابوو پێی لە سەر دادەگرم و بەوجۆرە و بە یارمەتی تەجروبە، خۆ خەلەتاندن دەسەپێنم.

گرفتی ئێمە ئەمەیە کە هەر کام لە ئێمە لە گەڵ باوەڕێکی تایبەت شێوە یان شێوازی پێك هێنانی خۆشی و دروستکردنی هاوسەنگی ئابووری، وا وەك یەکمان لێهاتووە کە زەینمان دیلی



ئەمانە بووە و ئیتر ناتوانین لە گرفتەکەدا زۆر دابچین. کە وابوو، خوازیاری ئەوەین کە بە شێوەی تاك، بە شێواز، باوەڕ و ئەزموونە تایبەتییەکانی خۆمانەوە دوورە پەرێز بمێنینەوە. تا کاتێك لە ریگای تیگەیشتنەوە_ نەك تەنیا تێگەیشتنی رواڵەتی، بەڵکو تێگەیشتنی قوولتر- ئەوانە لە نێو نەبەین، ئاشتی لە دونیادا مەیسەر نابێت. هەر بەم هۆیە بۆ کەسانێکە بە ڕاستی جیددین، فامی گشت ئەم مەسەلە_حەز بە کران، گەیشتن و دۆزینەوە- نەك تەنیا بە شێوەی رواڵەتی، بەڵکو بە شێوەی قوول و بنچینەیی جیێ بایەخە. بە پێچەوانە، شتێ بە ناوی ئاشتی لە جیهاندا بوونی نابێت.

ناکرێت راست و دروستی شتێ بەدەستبێنێت. ئەشق بەرەو لای ئەوانەی کە ئارەزووی هەبوونی ئەویان هەیە، یان ئەوانەی کە حەز دەکەن وەك ئەویان لێ بێت، نارِوات. راستییەکەی ئەوەیە کە شتانێ بەم جۆرە کاتێ دروستدەبن کە زەین لە گەڕان و بە دواداچووندا نەبێت و بە تەواوی ئارام بێت. ئیتر نە جووڵەیەك دروستبکات و نە باوەڕێك کە پاڵی پێوە دات یان دەسەلاّتێکی دیاریکراوی لێ بگرێت کە نیشانەی خۆ خەلەتاندنە. تەنیا کاتێکە زەین ئەم رەوتە گشتییەی ئارەزوو فام بکات، دەتوانێت ئارام ببێت. تەنیا ئەو کاتەیە کە زەین جوولانێکی بۆ بوون یان نەبوون نییە.

تەنیا ئەو کاتەیە کە دەرفەتی دۆخێك کە لەودا هیچ جۆرە فریوێك نەبێت، دروستدەبێت.

# فەسڵی نۆزدەیەم

## چالاکی خود سەنتەر

هەستدەکەم زۆربەی ئێمە دەزانین کە بۆ ئەو هەمووە ئێمە هاندەدرێین، بۆ ئەوەیە کە لە بەرامبەر چالاکییەکانی خۆ سەنتەردا راوەستین. ئیسمەکان لە رێگای وادە و بەڵێنەکان و لە رێگای دروستکردنی ترس لە رەخنە گرتن، لە رێگای مەحکووم کردنی هەمە جۆر و بە شێوازی جۆراوجۆر تێکوشاون کە مرۆڤ لەم رەفتارە بەردەوامەی کە لە ناوەندی((مـن))ەوە پێکدێت، دەست هەڵگرێت. لەئاکامی دۆڕانی (ئەوان) دا دەرفەت بۆ رێکخراوە سیاسییەکان رەخساوە. هەم دیسان تەماح و چاوچنۆکی، دیسانەوە هیوای کۆتایی ئوتۆپیایی. هەموو جۆرە یاسادانانێك، لە بەرتەسکترین تا رادیکال ترینیان، وەك گرتووخانەکانی زیندانییە سیاسییەکان، بۆ بەربەرەکانێ لە گەڵ ئەوان دانراوە و جێ بە جێ دەکرێن. بەم حاڵە، ئێمە بە چالاکی خۆ سەنتەر خۆمان کە وەك بڵێیێت تەنیا ئیشێکە کە دەیزانین، درێژە دەدەین. ئەگەر بێتو دەربارەی بیر بکەینەوە، تۆزێ هاوسەنگی دەکەین. ئەگەر لێی ئاگادار بین، ئاراستەکەی دەگۆڕین. بەڵام گۆڕانێکی قوول و بنچینەیی پێك نایەت و وەستانی بنەڕەتی کردەوەکەش نایەتە دی. بیرەوەران لەم مەسەلە ئاگادارن، ئەمەش دەزانن کە تەنیا کاتێ ئەم چالاکییە لە ناوەندەوە بوەستێت، خۆشی مانا پەیدا دەکات. زۆربەی ئێمە سروشتی بوونی چالاکی خۆ سەنتەر بەشتێکی روون دادەنێن و دەڵێین کە تەنیا دەرکەوتەکانی ئەوەیە کە دوورە پەرێزێکی لێی ناکرێت، دەبێت هاوسەنگ و رێك و پێك و کۆنترۆل بکرێت. هەنووکە کەسانێ کە تۆزێ جیددی تر و گەرمترن، بەڵام نەك بە راستگۆیی- لە بەر ئەوە راستگویی ریگای خۆ خەلەتاندنە- دەبێت تێبگەن کە ئایا دوای ئاگاداربوون لەم رەوتە گشتییە بێ وێنەی چالاکی خۆسەنتەر دەکرێت لێی تێپەرین.

بۆ تێگەیشتن لە خودی ئەم چالاکییەی کە ناوەندەکەی لە((خود)) دایە دەبێت بە شێوەی روون تۆیژینەوە لەو بارەوە ئەنجامبدرێت، سەرنجی پێبدرێت، لە رەوتە گشتییەکەی ئاگادار بن. ئەگەر لێی ئاگادار بین، ئەوا لەوانەیە بتوانین لە نێوی ببەین، بەڵام ئاگادار بوون لێی، پیویستی



بە تێگەیشتنێکی تایبەت هەیە. پێویستی بە بڕیارێکی روون بۆ رووبەروو بوونەوە لە گەڵ مەسەلەکە بەو جۆرەی کە هەیە- راڤە، هاوسەنگ و مەحکوم کردن- پێویست ناکات. دەبێت لەوەی کە دەیکەین، لە تەواوی ئەو چالاکیانەی کە لەم دۆخەی وا خود سەنتەرە، سەرچاوە دەگرێت، ئاگادار بین و فامی بکەین.

یەکێ لە گرفتە سەرەتاییەکانی ئێمە ئەمەیە هەر کە لەو چالاکییە ئاگادار بووین، دەمانەوێت رێکی بکەین، کۆنترۆلی بکەین، مەحکوومی بکەین یان هاوسەنگی بکەین؛ کەوابوو بە دەگمەن دەتوانین راستەوخۆ بۆی بڕوانین. کاتێکیش سەرنجی دەدەین، تەنیا رێژەیەکی کەم لە ئێمە دەزانین دەبێت چ بکرێت. دەزانین کە چالاکییەکانی خود سەنتەر، رووخێنەر و زیان بارن، هەروەها دەزانین کە هەر چەشنە هاوشێوەیی، لە تەك ولاّت، گرووپی تایبەت، حەزێکی دیاریکراو کە بە دوای ئەنجامدا دەگەڕێت چ لێرەدا بێت یان ئەو دونیا، گەورە کردنەوەی خەیاڵەکان، دوای سەرمەشق کەوتن، گەڕان بە دوای خۆپارێزی و دشکردن و تاد... بوون، لە بنەڕەتدا ئێشی مرۆڤێکی خود سەنتەرە. تەواو پەیوەندییەکانمان لە گەڵ سروشت، خەڵك و خەیاڵ ئەنجامی هەمان چالاکییە. ئێستا بە ئاگادار بووون لە هەمووی ئەمانە ئەرکی مرۆڤ چییە؟ تەواو چالاکییەکانی لەم چەشنە دەبێت بە شێوەی خۆویست کۆتایی پێ بێت. بێ ئەوەی بسەپێت بە سەر (خۆ) دا، بکەوێتە ژێر کاریگەریی یان ئاراستەی پێ بدرێت.

زۆربەی ئێمە دەزانین کە ئەم چالاکییەی خود سەنتەر خراپەکاری و بشێویی دروستدەکات، بەڵام ئێمە تەنیا لە بەر هەندێ هۆ پێی دەزانین یان لە ئەوانی تردا دەیبینین و لە کارەکانی خۆمان بێ خەبەرین، یان چونکە ئاگاداری ئێمە لە کردەوەی خۆ سەنتەرمان لە پەیوەندی لە گەڵ ئەوانیتردایە، دەمانەوێت تووشی ئاڵ و گۆڕ ببین، جێ نشین بدۆزینەوە یان لەوەی کە هەین، تیێپەرین. بەر لەوەی کە بتوانین لەگەڵی بەرەوروو بین، دەبێ بزانین کە شێوازی دروستبوونی ئەو رەوتە چۆنە. بۆ ئەوەی کە شتێ فام بکەین، دەبێت تواناییمان هەبێت بۆی بڕوانین و بۆ لێ روانینی دەبێت چالاکییە جۆراوجۆرەکانی لە ئاستە جیاوازەکاندا، چ لە بەشی وشیارو چ لە نا وشیاردا بناسین.

من تەنیا کاتێ لەم چالاکییەی((من)) ئاگادار دەبم کە دژایەتی بکەم؛ کاتێ کە هەست بێ هیوا بێت،کاتێ کە ((من)) ئارەزوو مەندی گەیشتن بە ئەنجامێك بێت، یان کاتێ لە بوونی ئەم ناوەندە ئاگادار دەبم کە چێژ و لەزەت بە کۆتایی بگات و دڵم بخوازێت زیاتر لەوەم هەبێت، ئەو کات خۆراگری پێکدێنم و لە بەر ئامانجێکی دیاریکراو، شێوەیەکی دیاریکراو بە زەین دەدەم

کە بە من شادی بدات و رازیم بکات. کاتێ من لە خۆ چالاکییەکانم ئاگادار دەبم کە وشیارانە بڕوم بە دوای خۆپارێزیدا. بە دڵنیاییەوە، هەر کە وشیارانە بڕوات بە دوای خۆ پارێزیدا، دژکام نییە. خاکەرایی شتێ نییە کە بکرێت بچێت بە دوایدا، جوانی خاکەرایی لەمە دایە.

ئەم رەوتەی خود سەنتەر ئاکامی زەمانەیە. تا کاتێ کە ئەم ناوەندی چالاکییە لە هەر ئاراستەیەکدا کە هەیە، هۆشیار یان ناهۆشیار، بوونی هەیە، رەوتی زەمان هەیە و من لە رابردوو و رانەبردوو لە پەیوەندی لە گەڵ داهاتوودا ئاگادارم. چالاکی خود سەنتەری((من))، رەوتێکی زەمانییە. زاکرەیە کە بە چالاکی ئەم ناوەندە کە ناوی((من))ە، بەردەوامی دەدات. ئەگەر((خود)) ببینن و لەم ناوەندەی چالاکی ئاگادار بن، دەیبینن کە تەنیا رەوتێکە لە زەمان، بیرەوەری، ئەزموون و وەرگێڕانی هەر ئەزموونێك لە رووی بیرەوەری؛ هەروەها دەیبینن کە چالاکیی سەرەکی بڕیتییە لە وێنا کردنی و دووبارە ناسی، کە ئەویش رەوتی زەینە.

ئایا زەین دەتوانێت لە هەمووی ئەمانە رزگار بێت؟ بەڵێ، زۆر بە دەگمەن شتی وا مەیسەرە، ئەگەری رووداني بۆ زۆربەی ئێمە ئەو کاتەیە کە کردەوەیەك خۆ نەویست و بێ مەبەست و ئامانج ئەنجامبدەین. بەڵام ئایا زەین هەرگیز ئیمکانێکی وای هەیە کە بتوانێت بە تەواوی لە چالاکی خود سەنتەر رزگاری بێت؟ ئەمە پرسیارێکی زۆر گرنگە کە دەبێت لە خۆمان بپرسین. لە بەر ئەوە تەنیا بە هێنانە بەر باسی پرسیارێکە وەڵامەکە دەدۆزینەوە. ئەگەر ئێمە لە رەوتی گشتی ئەم چالاکییەی کە ناوەندەکەی((خود))ە ئاگادار بین و چالاکییەکانیشی لە ئاستە جیاوازەکانی شعووری خۆماندا بناسین، ئەو کات بە دڵنیاییەوە دەبێت لە خۆ بپرسین ئایا بۆ ئەم چالاکییە ئیمکانی لە نێو چوون هەیە یان نا؟ ئایا دەکرێت بە پێی زەمان بیرنەکەینەوە، بە پێی ئەوەی کە دەبێت ببین، بە پێی ئەوەی کە بووین و ئەوەی کە هەین بیرنەکەینەوە؟ لە بەر ئەوە هەموو رەوتی چالاکی خود سەنتەر هەر لەم بیرەوە دەستپێدەکات، بڕیاری کران، بڕیاری هەڵبژاردن و دووری کردن کە هەموو رەوتێك لە زەمان دەژمێردرێن هەر لەوێوە دەستپێدەکات. لەم رەوتەدا ئێمە شایەتی خراپەکاری بێ سنوور، بەڵا، پەریشانی، شێواندن و بەرەو هەڵدێر دەبینەوە.

به دڵنیاییەوە رەوتی زەمان رەوتێکی شۆڕشگێڕانە نیە. لە رەوتی زەماندا گۆڕانێك نیە، تەنیا بەردەوامی دەبینرێت و کۆتاییێکی لێ بە دی ناکرێت، شتێکی جگە لە وینا



کردن و دووبارە ناسی پی نیە. شۆڕش، گۆڕان، تازە بوونەوەی شتێ تەنیا کاتێ مەیسەرە کە رەوتی زەمان وچالاکی((خود)) بە تەواوی راوەستێت. هەنووکە بە ئاگادار بوون لە تەواویەتی رەوتی((من))، لە کاتی کردەوەدا ئەرکی زەین چییە؟ تەنیا لە رێگای ژیانەوە، لە رێگای شۆڕش- نەك لە رێگای پێگەیشتن، نەك لە رێگای دروستبوونی من، بەڵکو لە رێگای لە نێو بردنی بە تەواوی من- تازە، لە دایك دەبێت. رەوتی زەمان ناتوانێت پێکهێنەری تازەیی بێت، زەمان شێوەیەکی گونجاو بۆ داهێنان نیە. نازانم هیچ کام لە ئێوە چرکەیەك دۆخی داهێنانتان هەبووە.

مەبەستی من لەم قسە بە کردەوە دەرهێنانی گومانێك نیە. مەبەستی من ئەو چرکە لە داهێنانە کە وێنا کردن و دووبارە ناسی تیدا نییە. لەو چرکەدا مرۆڤ تووشی دۆخێکی بێ وێنەیە کە لەو دۆخەدا، ((من)) وەك چالاکێك لە ریگای وێناکردنەوە راگیراوە. ئەگەر ئێمە وشیار بین، دەبینین کە لەو دۆخەدا نە تاقی کراوێك کە بە بیر بێنیتەوە، وەرگێڕدراوی شتێ بێت، بناسێت و دواتر شوناس دیاریبکات، هەیە، نەك شتێ بە ناو رەوتی فیکر کە تایبەت بە زەمانە. لەو دۆخی داهێنانەدا، دۆخی داهێنانێکی تازە کە زەمانی لە گەڵدا نیە، کردەوەی((من)) بە هیچ جۆر نیە. کەوابوو دوور لە گومان پرسیاری ئێمە ئەمەیە: ئایا لەودۆخەدا ئەگەری بوونی زەین هەیە؟ ئەلبەت نەك بە شێوەی کورت خایەن و نەك لە چرکە دەگمەنەکاندا، بەڵکو- پێم باشە لە وشەی((هەرمان)) یان((هەمیشە)) کەڵك وەرنەگرم، لە بەر ئەوە ئەم وشانەش ئاماژە بە زەمان دەکەن- بێ سەرنجدان بە زەمان. بە دڵنیاییەوە ئەمە بۆ هەر یەك لە ئێمە دەسکەوتێکی گرنگە، لە بەر ئەوە ئەم دەرگا بەرەو ئەشق دەکرێتەوە، تەواوی دەرگاکانی دیکە بۆ چالاکییەکانی ((خود)) دەکرێنەوە. لە هەر کوێ خود سەرچاوەی کردەوە بێ، ئەشق نیە. ئەشق تایبەت نییە بە زەمان. ئەشق مەشق ناکرێت. ئەگەر ئەم ئیشە بکەن، ئەوا کردەوەی خۆ ویستی((من))ە کە هیوادارە لە رێگای حەزکردنەوە بە ئەنجامێك بگات.

ئەشق پەیوەندییێکی بە زەمانەوە نییە، گەیشتن بە ئەشق لە رێگای هیچ تێکۆشانێکی وشیارانە، هیچ رێ و شوێنێك و ئاشنایێك کە هەمووی تایبەتە بە رەوتی زەمان، مەیسەر نیە. زەین کە شتێك جیا لە رەوتی زەمان نازانێت، ناتوانێت ئەشق بناسێت. ئەشق تەنیا شتێکە کە هەمیشە تازەیە و هەتا هەتاییە. چونکە زۆربەی ئێمە زەینمان پەروەردە کردووە کە بەرهەمی زەمانە، خودی ئەشق ناناسین. سەبارەت بە ئەشق قسە دەکەین، دەڵێین عاشقی خەڵك، عاشقی

منالاَن، هاوسەر، دراوسێ و سروشتین، بەلاَم هەر کە زانیمان ئاشقین، چالاکی((خود)) دروستدەبێت، کەوابوو ئیتر ناوی ئەشق نابێت.

ئەم رەوتە گشتییەی زەین دەبێت تەنیا لە رێگای پەیوەندییەوە ـ پەیوەندی لە تەك سروشت، خەلْك، فرافکنیەای خۆمان و لە تەك هەرچی لە دەوروبەرمان دایە ـ بناسرێت. ژیان شتێ جگە لە پەیوەندی نیە. گەرچی لەوانەیە بۆ دووری لە پەیوەندی تەنانەت هەولێش بدەین، بەلاَم بێ ئەو ناتوانین ژیان بکەین. گەرچی لەوانەیە پەیوەندی بەژان بێت، بە گۆشەگیرکردنی خۆو پەنابردن بۆ دونیای پارانەوە و خۆپارێزی، ناتوانین لێی دوور بکەوینەوە. تەواوی ئەم شێوازانە نموونەکانی چالاکی "خود"ە. بە دیتنی ئەم وێنە گشتییەو ئاگاداربوون لە تەواوی رەوتی زەمان وەك وشیاری، بێ هیچ هەلْبژاردن، بێ هیچ نیازێکی روون و مەبەست دارو بێ هیچ ئارەزوویەك بۆ گەیشتن بە ئامانج، دەبیینن کە هەر ئەم گەندە رەوتەی زەمان بە شێوەیەکی خۆویست بە کۆتایی دەگات، بێ ئەوەی کە تەلْقینی بێت یان بەرهەمی ئارەزوویەك. تەنیا کاتێ ئەو رەوتە بە کۆتایی بگات، ئەشق لە دایك دەبێت، ئەشقێ کە بۆ هەتاهەتایە تازەیە.

پێویست ناکات بە دوای هەقیقەتدا بگەرێن. هەقیقەت شتێ نییە کە دوور بێت. هەقیقەت یانێ راستییەك کە دەربارەی زەینە، یانێ راستییەك کە دەربارەی کردەوەکانە کە چرکە بەچرکەیە. ئەگەر ئێمە لەم هەقیقەتە چرکە بە چرکەیە و لەم رەوتە گشتییەی زەمان ئاگادار بین، ئەو زانیارییە دەبێتە هۆی بلاَوبوونەوەی جۆرێ هۆشیاری و وزە کە ناوی زیرەکی یان ئەشقە. تا کاتێکە زەین لە هۆشیاری وەك چالاکیی خۆی کەلْك وەردەگرێت، زەمان بە تەواوی بەلاَ، ناکۆکی، خراپەکاری و فریوە قین لە دلاَنەکانیەوە سەر هەلْدێنێت، تەنیا لەو کاتەدایە کە زەین بە تێگەیشتنی ئەم رەوتە گشتییە رادەوەستێت و ئەشق دەتوانێت بوون پەیدا بکات.

# فەسڵی بیستەم

## زەمان و گۆڕان

حەز دەكەم تۆزێك دەربارەی ناوەرۆكی زەمان قسە بكەم، چونكە بەڕای من، دەوڵەمەندی، جوانی و بایەخی ئەوەی كە جیا لە زەمانە، ئەوەی كە راستییە، تەنیا كاتێ دەكرێ تەجروبەی بكەیت كە بتوانیت تەواوی رەوتی زەمان بناسیت. بە هەر جۆر، هەموومان، هەركەس بە شێوازی خۆی لە گەڕان بە دوای جۆرێ بەختەوەری بێئاتاجی دایە. بە دڵنیاییەوە، ژیانێ كە خاوەنی مانایە و پڕ لە بەختەوەریی راستەقینەیە، پێوەندی بە زەمانەوە نییە. ئەم جۆرە ژیانە، وەكو ئەڤین، جیا لە زەمانە و بۆ فامی ئەوەی كە زەمانی لەتەكدا نییە، ناكرێت لە رێگای زەمانەوە لە گەڵی بەرەوڕوو ببێت. بەڵكو لە جیاتی ئەم كارە دەبێت زەمان فام بكەیت. ئێمە نابێت لە زەمان وەك ئامرازێك بۆ بەدەستهێنان، سەلماندنی و فامینی بێ زەمانی كەڵك وەرگرین و ئەمە ئەو شتەیە كە لە زۆربەی تەمەنی خۆماندا ئەنجامی دەدەین: كات بۆ بەدەسهێنانی ئەوەی كە زەمانی نیە، لە كیس دەدەین. كەوابوو دەبێت بزانین مەبەستمان لە زەمان چییە؟ چونكە بەڕای من، رزگاری لە چنگ زەمان مەیەسەرە. ئەڵبەت گرنگ ئەوەیە كە ئێمە زەمان بە شێوەی تەواو بناسین، نە ناتەواو و ناقز.

سەرنجڕاكێشە بزانین كە ژیانی ئێمە زۆرتر لە زەماندا لە كیس دەچێت، مەبەست لە زەمان، ریزی بەرواری رووداوەكان لە سەر بنەمای دەقەكان، ساتەكان، رۆژەكان و ساڵ نییە، بەڵكو بارودۆخی دەروونناسانەی زەینی جێی ئاماژەیە. ئێمە بە پێی زەمان دەژین و بەرهەمی زەمانین. زەینی ئێمە بەرهەمی زۆری لە دوێنێكانە و رانەبردوو تەنیا تێپەڕینی رابردوو بۆ داهاتووە. زەینی ئێمە، چالاكییەكانی ئێمەو بوونی ئێمە، لەسەر زەمان دامەزراوە، بەبێ زەمان بیركردنەوە مەیسەر نییە چونكە هزر بەرهەمی زەمانە، هزر بەرهەمی دوێنێ زۆرەكانەو هیچ هزرێك بەبێ بیرەوەری بوونی نیە. بیرەوەریی زەمانە؛ چونكە دوو جۆر زەمانمان هەیە، یەكیان تایبەتە بە زنجیرەی رووداوەكان و ئەویتر بە دەروونناسی. جۆرێك "دوێنێ" هەیە كە لە رووی سەعاتەوە نیشاندەدرێت و جۆرێكیتر كە لە رووی بیرەوەرییەوە دەیناسن. زەمانێ كە بە



زنجیرەی مێژووی رووداوەكانەوە پەیوەندی هەیە. ناكرێ ڕەتی بكەینەوە. شتی وا عەیبە، بۆ نموونە لە شەمەندەفەر بەجێ دەمێنین؛ بەڵام ئایا لە بنەڕتدا بێجگە لە زنجیرەی مێژووی رووداوەكان، زەمانێكیتریش هەیە؟ بێگومان زەمانێك وەك دوێنێ هەیە، بەڵام ئایا زەمانێكی واش هەیە كە زەین بەو شێوە دەربارەی بیر دەكاتەوە؟ ئایا زەمانێك هەیە كە جیا لە زەین بێت. بە دڵنیاییەوە، زەمان ـ زەمانی تایبەت بە دەروونناسی بەرهەمی زەینە ـ بەبێ بنەمای هزر، مانای نییە، مەبەستم زەمانێكە كە تەنیا بیرەوەری دوێنێ لە پەیوەندی لەگەڵ ئەمڕۆدا بێت و چوارچێوەیەك بۆ سبەی. بە دەربڕینێكیتر، بیرەوەری ئەزموونی دوێنێ لە وەڵامی رانەبردوودا داهاتوو دروستدەكا كە دووبارە رەوتی بیركردنەوەیە و رێبازی زەین. شێوازی بیركردنەوە دەبێتە هۆی پێشكەوتنی دەروونناسانە لە زەماندا. بەڵام ئایا بە ئەندازەی زنجیرەی مێژوویی راستی هەیە؟ ئایا ئێمە دەتوانین لەو زەمانەی كە تایبەت بە زەینە وەك ئامرازێك بۆ فام و هەرمانی و بێزەمانی كەڵك وەرگرین؟ هەروا كە گوتم، خۆشی تایبەت بە رابردوو نیە، خۆشی بەرهەمی زەمان نیە، خۆشی هەمیشە لە زەمانی رانەبردوودایە، دۆخێكە بێزەمان. نازانم ئێوە لە چركەی پڕ شوورو شەوقدا كە جۆرێ خۆشی داهێنەرەو كۆمەڵەیەكە لە هەورە روونەكان لە گەمارۆی هەورە لێڵەكاندا، تێگەیشتوون كە زەمان نییە و ئەوەی كە هەیە، تەنیا رانەبردووی نەپچڕاوەو هیچیتر، نا؟

زەین كە دوای تەجروبە لە زەمانی رانەبردوودا بە بیر دێنێتەوەو خوازیاری بەردەوامییە، بوون پەیدا دەكات، هەرچی زیاتر لە خۆی كۆ دەكاتەوە و بەو شێوە زەمان خەڵق دەكات. كەوابوو زەمان خولقاوی "زیاتر"ە، زەمان هاوكات كە دەكرێت بە دەستی بێنیت، جیایشە كە دووبارە بەدەس هێنانی زەینە. كەوابوو، پەروەردەكردنی زەین بە تەنیا لە چوارچێوەی كاتدا، مەرجداركردنیشی هەر لەو چوارچێوەیەدا كە یادی پێ دەگوترێت، بێگومان ناتوانێت پەردە لەسەر ئەوەی كە لە دەرەوەی كاتە لابدات.

ئایا گۆڕان پەیوەندی بە زەمانەوە هەیە؟ زۆربەی ئێمە عادەتمان كردووە هەستبكەین كە زەمان بۆ گۆڕان پێویستە: من شتێكم و گۆڕانم لەوەی كە هەم بۆ ئەوەی كە دەبێت ببم، پێویستی بە زەمان هەیە. من بە تەماحم بەوەی كە بەرهەمی تەماحە، یانی شێواوی، دوژمنی، دڕایەتی و بەڵاو هەستدەكەم كە بۆ پێكهێنانی ئاڵوگۆڕ كە نەبوونی تەماحە، پێویستم بە زەمان هەیە. بە دەربڕینێكیتر، هەستدەكەین كە زەمان ئامرازێكە بۆ پێگەیشتن (تكامل) بە شتی گەورەترو بۆ بوون بە شتێك. گرفت ئەمەیە: كەسێ خاوەنی

توندوتیژی، تەماح، بەخیلی، تووڕەیی، خراپەکاری و هەوەسە. ئایا بۆ گۆڕانی ئەوەی کە هەیە، زەمان پێویستە؟ یەکەم دەبێت بگۆترێت بۆچی دەبێت ئەوەی هەیە بگۆڕدرێت، یان لەودا گۆڕان پێکبێت؟ راستی بۆچی؟ لەبەر ئەوە لەوەی کە هەمانە رازی نین، ئەوەی کە هەمانە، هۆکاری پارادۆکس و شێواوییەو ئێمە کە خۆشمان لێی نایەت، خوازیاری شتی چاکترو شتی بەنرخترو شتی رئالیستیترین. کەوابوو لەبەر ئەوە ئێش و ئازار، ناڕەحەتیو پارادۆکس هەیە. خوازیاری ئاڵوگۆڕین. بەڵام ئایا پارادۆکس لە لایەن زەمانەوە دەبەزێت؟ ئەگەر بڵێین ئەرێ، هەم دیسان لەپارادۆکسدا دەژین. لەوانەیە بڵێین کە بۆ رزگاری لە چنگی پارادۆکس، بۆ گۆڕینی ئەوەی کە هەیە، بیست رۆژ یان بیست ساڵ کات پێویستە، بەڵام دووبارە لە نێوان ئەو ماوەدا تووشی پارادۆکسن. کەوابوو، زەمان، ئاڵوگۆڕ پێك نایەنێت. کاتێ ئیمە لە زەمان وەك ئامرازێك بۆ بەدەسهێنانی چۆنایەتییەك، جۆری خۆپارێزی یان دۆخێکی دەروونی کەڵك وەردەگرین، تەنیا ئەوەی کە هەیە خستوومانەتە دواوە لە رووی زەمانییەوە یان دووریمان لێ کردووە کە بەڕای من فامی ئەم خاڵە بایەخی هەیە. تەماح یان توندوتیژی لە دونیای پەیوەندی ئێمە لەگەڵ ئەوانیتردا ـ کۆمەڵگا ـ ئێش و شێواوی پێکدێنێت و ئێمە بە ئاگاداربوون لەم دۆخی ئاژاوە کە ناوەکەی زارەکی تەماح یان توندوتیژی دەنێن، بە خۆمان دەڵێین: "لە کاتی دیاریکراودا لە چنگی رزگار دەبم، روو لە دژی توندوتیژی دەکەم، بە خیلی نابەم، ئاشتی هێمنایەتی دەکەمە رێبازی خۆم". بەڵێ، نیەتی روونان لە دژی توندوتیژیتان هەیە، لەبەر ئەوە توندوتیژی دۆخێکی پارادۆکس و ئاژاوەیەو ئێوە هەستدەکەن کە لە کاتی دیاریکراودا بە دژی توندوتیژی دەگەن و بەسەر پارادۆکسدا سەردەکەون. بزانین بەراستی چ شتێ روو دەدات؟ لەبەر ئەوە لە دۆخێکی دژو پارادۆکس دان دەتانەوێت بگەنە دۆخێك کە لەودا پارادۆکس نیە. ئایا ئەم دۆخە نەبوونی پارادۆکس، ئاکامی زەمان یان ئاکامی مانەوەیە؟ بەڕاشکاوی نەخێر، لەبەر ئەوە هاوکات کە بە دۆخێکی دژی توندوتیژی دەگەن، هێشتا توندوتیژن، کەوابوو هێشتا لە پارادۆکس دان.

گرفتی ئێمە ئەمەیە کە ئایا دەکرێ لە ماوەی زەمانێکی دیاریکراودا بەسەر پارادۆکسێك یان ئاژاوەیەکدا سەرکەویت، چ ئەم زەمانە چەند رۆژ بێت، چەند ساڵ و یان تەنانەت چەند تەمەن؟ کاتێ ئێوە دەڵێن: "من دەمەوێت تا ماوەیەکی دیاریکراو دژی توندوتیژی بگەمە رێبازی خۆم" چی روو دەدات؟ خودی ئەم کردەوە نیشاندەری ئەوەیە کە ئێوە لەپارادۆکسدا



خەریکن دەخنکێن. ئەگەر نەتانویستبا لە بەرامبەر پارادۆکسدا راوەستن ئەم ئیشەتان نەدەکرد، ئێوە دەڵێن کە بۆ سەرکەوتن بەسەر پارادۆکسدا پێویستە لە بەرامبەریدا راوەستیت و بۆ ئەم خۆڕاگرییە دەبێت کاتتان هەبێت. بەڵام خودی ئەم خۆڕاگرییە لە هەمبەر پارادۆکسدا بەش بە حاڵی خۆی جۆرێ پارادۆکسە.

ئێوە وزەی خۆتان لە خۆڕاگری لە بەرامبەر ناکۆکیدا بەشێوەی ئەوەی کە تەماح، بەخیلی یان توندوتیژی ناو دەنێن، وەگەڕ دەخەن، بەڵام زەینتان هێشتا لە ناتەباییدایە. کەوابوو گرنگ ئەوەیە کە لە درۆ بوونی رەوتی پشت بەستن بە زەمان وەك ئامرازگەلێك بۆ سەرکەوتن بەسەر توندوتیژیدا ئاگادار بن و بەو جۆرە لە چنگی ئەم رەوتە رزگار بن. ئەوکات دەتوانن ئەوەی کە هەیە ببێت، ئاژاوەیەکی دەرونناسانە کە خودی توندوتیژیە.

بۆ تێگەیشتنی هەر شتێ یان هەر گرفتێکی زانستی یان مرۆیی، شتێك گرنگو سەرەکییەو ئەویش هەبوونی زەینێکی ئارامە. زەینێ کە بڕیارو ئامانجی فامین بێت. نە زەینێکی مۆنۆپۆلیست کە تەنیاو تەنیا بیری بە لای ئامانجێکەوە بێت کە ئەمەش کۆششێك لە راستای خۆڕاگری دایە. ئەگەر بمانەوێت بەڕاستی شتێك تێبگەین، دۆخێکی دەسبەجێ ئارامی زەین دروستدەبێت. کاتێ دەتانەوێت گوێ لە موسیقا بگرن یان بۆ وێنەیەك کە حەزتان لێیەو بەرامبەری هەستێکتان هەیە بڕوانن، زەین دەکەوێتە چ بارودۆخێکەوە؟

لە وەها دۆخێکدا، زەین گورج ئارام دەبێت. کاتێ گوێ لە موسیقا دەگرن، زەینی ئێوە ئاوارەی ئەملاو ئەولای شوێنێك لە تێدان نابێت. ئێوە بەڕاستی گوێ لە مۆسیقا دەگەن. هەر بەم جۆرە، کاتێ ئامانجتان فامی ناسازگارییە، ئیتر بە هیچ جۆر پشت بە زەمان نابەستن، بەڵکو ساف و سادە لە تەك ئەوەی هەی یانێ پارادۆکس، بەرەوڕوو دەبن. ئەوجا ئارامییەکی دەسبەجێ دروستدەبێت. لەو دۆخەدا کە زەین ئامادەیە بەڵام هاوکات پاسیڤ، تێگەیشتن هەیە، تا کاتێ کە زەین لە ناسازگاری، خۆڕاگری، مەحکەم کردن و گەڕان بەدوای کەم وکوڕی دایە، شتێ بەناو تێگەیشتن بوونی نابێت. ئەگەر من ئامانجم فامینی ئێوە بێت، روونە کە نابێت مەحکوومتان بکەم. ئەوەی کە دەتوانێت لە ئێوەدا ببێتە هۆی گۆڕان، هەمان زەینی هێمن و هەمان زەینی ئارامە و ئیتر هیچ. کاتێ کە زەین ئیتر خۆڕاگرییەك نەکات، ئیتر دووری نەکات و ئیتر "ئەوەی کە هەیە" دوور نەهاوێژێت و مەحکوومی نەکات، بەڵکو ساف و سادە و بە شێوەیەکی پاسیڤ وشیار بێت، هەرکات بە

شێوەیەکی ئۆبجێکتیڤ لێکۆڵینەوە لە گرفتەکە بکات، هەر لە دۆخی پاسیڤیدا لەگەڵ شتێ بەرەورووە دەبێت کە گۆڕانی ناوە.

شۆڕش تەنیا لە ڕانەبردوودا مەیسەرە نە لە داهاتوودا، ژیانی نوێ ئەمڕۆیە، نە سبەی. ئەگەر ئەوەی کە دەڵێم تاقیبکەنەوە، لە بوونی بەردەوامی جۆرێ تازەیی، ژیانەوە و پاکی تێدەگەن، لەبەر ئەوە زەین لە کاتی ئۆگری، خوازیاربوون یان کاتێ کە نیەت و بڕیاری فامینی هەیە، هەمیشە ئارامە. گرفتی زۆربەی ئێمە ئەوەیە کە نیەتی فامینمان نیە، لەبەر ئەوە دەترسین کە فامی ئێمە ببێتە هۆی کردەوەیەکی شۆڕشگێڕانە لە ژیانماندا. کەوابوو، ڕادەوەستین. کاتێ کە زەمان یان ئیدەئالێك وەك ئامرازێك بۆ گۆڕانی هەنگاوبەهەنگاو کەڵك وەردەگرین، ڕوومان لە میکانیزمێکی دیفاعی ناوە.

کەوابو ژیانەوە تەنیا لە زەمانی ڕانەبردوودا مەیسەرە، نە لە داهاتوو نە لە سبەیدا. کەسێ کە بە زەمان وەك ئامرازێکە لە ڕێگای ئەوەوە دەتوانێت بە خۆشی یان فامی ڕاستی یان خوا بگات، پشت دەبەستێت. تەنیاو تەنیا خۆی دەخڵەتێنێت، ئەو لە تاریکیدا ژیان دەکات، کەوابوو، لە پارادۆکسایە.

مرۆڤێ کە دەزانێ زەمان، ڕێگەی هەڵاتنێك بۆ ڕزگاری لە گرفتەکان نییە و لەم ڕووەوە لەناڕاستییەکان دوورە بێگۆمان نییەت و بڕیاری فامینی هەیە. کەوابوو، زەینی بێزۆرو بێمەشق دەسبەجێ ئارام دەبێت. کاتێ زەین هێمن و ئارام بێت و نەڕوات بە دوای وەڵام یان ڕێگەچارەیەکدا، نە خۆڕاگری دەکات و نە دووری. تەنیا ئەو کاتەیە کە ژیانەوە بوونی دەبێت، چونکە لەو کاتەدا، زەین دەتوانێت ئەوەی کە ڕاستییە هەستی پێ بکات و ئەوەی کە هۆکاری ئازادییە ڕاستییە، نە تێکۆشانی ئێوە بۆ ئازادبوون.

# فەسڵی بیست و یەکەم

## دەسەڵات و فام

دەبینن کە گۆڕانێکی بنەڕەتی لە کۆمەڵگاو لە خۆماندا لە پێوەندیی تاك و گرووپی ئێمەدا پێویستە، ئەم گۆڕانە چۆن دەبێت دروست بێت؟ ئەگەر گۆڕان لە ڕێگای هاوجێ بوون لەگەڵ نموونەیەکدا بێت کە لە ڕێگای زەینەوە، لە ڕووی نەخشەیەکی باش و بە تەواوی موتاڵاکراوەو داڕێژرابێت، هێشتا لە چوارچێوەی زەیندایە. کەوابوو ئەوەی ئەنجامی زەین بێت، وەك ئامانج دیاریدەکرێت و دەبێت بە خەونێك کە ئێمە ئامادەین خۆمان و ئەوانی تریش فیدای بکەین. ئەگەر ئەمەتان قەبووڵبێت، ئەوجا ئەنجامی لۆژیکیی کارەکە ئەمەیە کە ئێمە وەك مرۆڤ بەس تەنیا دروستبووی زەینین کە ئاماژە بە هاوجێ بوون، زۆرەکی، دڕندەخۆیی، دیکتاتۆری، ئوردوگای دیلی‌و هەموو شتێ لەم چەشنە، دەکات. پەرستنی زەین هەمووی ئەمانە لە دڵی خۆیدا هەڵدەگرێت. ئەگەر ئەمە فام بکەین، ئەگەر لە بێهوودەیی دیسیپلین و کۆنترۆڵ ئاگادار بین، ئەگەر بزانین کە شێوە جۆراوجۆرەکانی سەرکوت، تەنیا دەبێتە هۆی بەهێزکردنی "من"و "هی من" ئەما دەبێت چ بکرێت؟

بۆ ئەوەی بە تەواوی لێکۆڵینەوە لەم مەسەلە بکەین، دەبێت بڕۆینە سەر مەسەلەی زاتی فام. نازانم ئێوە خۆتان بە شەخسە لەم بارەوە بیرتان کردووەتەوە یان بە وتەی خاوەن ڕایان لەم بارەوە قەناعەتتان هێناوە؟ نازانم تێگەیشتنی ئێوە لە ئەزمونی خۆتان و لە خوێندنەوەی خۆتان لە بواری فامدا چ بووە؟ نە تەنیا فامی چالاکییەکانی ڕۆژانە و ئۆگرییەکان، بەڵکو فامی شاراوە، فامی قووڵتر، دەوڵەمەندترو ئەوەی کە دەستڕاگەیشتن بەو دژوارترە. ئەگەر بڕیار لەسەر ئەمە بێت کە ئێمە دەربارەی ئەم مەسەلەی گۆڕانی بنچینەیی لە خۆمان و بەو پێیەش لە دونیا، باسبکەین و لەم گۆڕانە بۆ پێکهێنانی ئاسۆیەکی دیاریکراو و شەوق هیواو دڵنیاییەك کە بە ئێمە خوازیاری پێویست بۆ کردەوە بدات، کەڵك وەربگرین، پێویستە سەرەتا مەسەلەی فام بخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە. ئەوە کە مەبەستی ئێمەیە لە فام لە ئاستی دەرەوەی زەین، گرفت نییە. بە شێوەی ڕوون شێوازی هزرین یان خودی هزرە. هزر، بەرهەمی



وەبیرهێنانەوەیە و دەربڕین، نێونان، تۆمارو ڕێكوپێك کردنی ئەزموونی تایبەت. بە جۆرێك بکرێت لەگەڵیان پێوەندی دابمەزرێنێت، ئەڵبەت لەم بوارەدا، مەنع کردن، کۆنترۆڵ، دیسیپلین و سزای تایبەتیش هەیە. ئەگەر تۆزێك وردتر ببینەوە، بە تەواوی کۆکراوەکانی پێوەندیدار بە ڕەگەز، پاڵنەرە نادیارەکان، فراوان خوازییەکانی تاکی و گرووپی‌و دەمارگرژییەکان دەگەین کە ئاکامی خەیاڵ، پێوەندی و ئارەزوون. ئەم فامە گشتییە، چ دیارو چ نادیار، لە دەوروبەری خەیاڵی "من" یان "خود"دا کۆ بووەتەوە.

کاتێ دەربارەی پێکهێنانی گۆڕان باسدەکەین، بەگشتی مەبەستمان گۆڕان لە ئاستی بەرچاوی دایە. لە ڕێگای بڕیار، دەرئەنجام، باوەڕ، کۆنترۆڵ و مەنع کردن، کۆششمان ئەوەیە کە بە ئامانجێکی ڕواڵەتی کە خوازیاری ئەوەین بگەین و هیواداریین کە ئەم کارە لە ڕێگای نەست یان چینێکی خوارووتری زەینەوە بە ئاکام بگەیەنین. لە بەر ئەم هۆیە کە هەستدەکەین پەردەلادان لەسەر قووڵایی دەروونمان پێویستە. ئەڵبەت نابێت لە بیر بکرێت کە لە نێوان ئاستی بەرچاویی و بەناو قووڵتردا ـ کە هەموو دەروونناسان و تەواوی ئەوانەی کە ڕۆیشتوون بە دوای خۆناسیدا، بە تەواوی لێی ئاگادارن ـ پارادۆکسی بێ‌کۆتایی هەیە.

ئایا ئەم پارادۆکسە دەروونییە دەبێتە هۆی گۆڕان؟ ئایا سەرەکیترین و گرنگترین پرسیار لە ژیانی ئێمەدا ئەمە نییە کە: بە چ شێوەیەك دەتوانین لە خۆماندا گۆڕانێکی سەرەکی و بنچینەیی پێکبێنین؟ ئایا گۆڕانی ڕووتی ڕواڵەتی ئەوە پێکدێنێت؟ ئایا فامی چینە جۆراوجۆرەکانی فام و "من"، پەردە لادان لە ڕوخساری ڕابردوو و ئەزموونی جۆراوجۆریی شەخسی لە منداڵییەوە تا ئێستاو پشکنینی دەروونی ئەزموونە گشتییەکانی خۆم کە لە باب، دایك، ئەژدادو ڕەگەزی خۆم پێم گەیشتووەو مەرجی کرانی کۆمەڵگایەکی تایبەت کە تێیدا دەژیم، ئایا ڕاڤەی هەمووی ئەمانە، دەبێتە هۆی گۆڕانێك کە ناکرێ پێی بڵێین بەراوردکردن.

من هەستدەکەم و بە دڵنیاییەوە ئێوەش دەبێت وەها هەستێکتان هەبێت کە گۆڕانکاری بنچینەیی لە ژیانی تایبەتیدا پێویستە، گۆڕانێکە دژکردەوەی ڕووت یان ئاڵۆزی و دژواری داواکارییەکانی دەوروبەر نەبێت. ڕاستی بە چ شێوەیەك دەبێت گۆڕانکاریی وا پێکبێنیت؟ فامی تاك، کۆی ئەزموونەکانییە لەگەڵ پێوەندیی تایبەت لە تەك ڕانەبردوو، ئایا شتێکی وا نییە دەبێتە هۆی گۆڕانکاری؟ ئایا شێوازی توێژینەوە لە فامی خودی تاك، چالاکییەکانی یان ئاگاداری لە بیروسۆزی ئەو و هێمنایی زەین بۆ لە ژێر چاوەدێری خستنی بێ مەحکوم کردن، دەبێتە هۆی گۆڕانکاری؟ ئایا دەکرێ لە ڕێگای باوەڕ یان هاوشێوەیی لەگەڵ وێنەیەکی لە پێشدا لەبەرچاو

گیراو بە ناوی ئیدەئال، بگەیت بە گۆڕانکاری؟ ئایا تەواوی ئەمانە ئاماژە بە جۆرێك پارادۆكس لە نێوان ئەوەی کە هەم و ئـەوەی کـە دەبـێ بم، نیـە؟ ئایـا پـارادۆكس دەبێتـە هـۆی گۆڕانکـاریی بنچینەیی؟ من لە تەك دەروون و کۆمەڵگای خۆمدا لە خـەبات و شـەڕی بێوچـان دام. هـەروەها خەباتێکی بەردەوام لە نێوان ئەوەی هەم و ئەوەی دەخوازم بم، بوونی هەیە. ئایا ئەم پـارادۆكس و کێشمەکێشە، دەبێتە هۆی گۆڕانکاری؟ من دەزانم کـە پێـك گۆڕانێـك لـە پێویـستییەکانە. ئایـا دەتوانم بە پشکنینی تەواو شێوازی فامی خۆم، بە دانی دیسیپلین و کەڵك وەرگرتن لـە سـەرکوتی جۆراوجۆر، دروستی بکەم؟ من هەستدەکەم کە ئەم شێوازە نابێتە هـۆی گۆڕانکـاریی بنـچینەیی. تاك دەبێت بۆ کارێکی لەم جۆرە، بە تەواوی دڵنیا بێت و ئەگـەر ئـەم ڕەوشـە نـەتوانێت گـۆڕانی بنچینەییو شۆڕشی دەروونی قووڵی پێویست دروستبکات، ئەی چ شتێ ئەم کارە دەکات؟

راستی بە چ شێوەیەك دەتوانن شۆڕشـی راسـتەقینە پێکبێـنن؟ ئـەم دەسـەڵات و وزەی داهێنەرەی کە دەبێتە هۆی ئەم شۆڕشە، چ زات و نێوەرۆکێکی هەیەو چۆن دەبێت پێکبێت؟ ئێوە ئیسمگەلێکتان تاقیکردۆتەوە، رۆیشتوون بەدوای ئیدەئال و ئەو تئۆریانەی کە لە سـەر بنەمای ئەرێ و نەرێن، ئایا بەڕاستی گەیاندن و سەلماندنی ئەم ئیـدەئال و تئۆریانـە دەبێتـە هۆی گۆڕانکاریی بنچینەیی؟ سەرەتا وای بۆ دەچن کە راستییەك هەیەو ئێوە بەشێکن لەوەو لە دەوروبەری ئەودا، تئۆری، مەزەندەکردن، باوەڕ، دۆکترین و گریمانەی جۆراوجۆر کە لەسەر بنەمای ژیان دەکەن، دادەمەزرێنن، ئەوجا بە بیرکردنەوە و کـارکردن لـە رووی ئـەو نموونـە، چاوەڕوانن گۆڕانێکی بنچینەیی دروستبکەن. گریمان کە ئێوە وەك زۆرێك لە خەڵکانی بـەناو مەزهەبی، وای دادەنێن کە لە دەروونی ئێوەدا بە شێوەیەك بنەڕەتی و قووڵ زاتی راسـتییەك هەیە، ئێستا ئەگەر لـە رێگـای پـەروەردەی خۆپـارێزی و شـێوەی جۆراوجـۆری دیـسیپلین، کۆنترۆڵ، سەرکوت، حاشاو فیداکارییەوە بتوانن لەگەڵ ئەو راسـتییە پێوەنـدی دامـەزرێنن، ئەوکات گۆڕانکاری پێویست پێکدێت. ئایا ئەم بۆچوونە دووبارە بەشێك نییە لە هـزر؟ ئایـا ئەمە دەرکەوتەی زەینێکی مەرجی کراو نیە؟ زەینێکە پـەروەردە کـراوە تـا بـە شـێوازێکی تایبەت و لەسەر بنەمای نموونە و سەرمەشقە دیاریکراوەکان بیر بکاتەوە؟ دوای ئـەوەی کـە ئێوە دەستان کرد بە خۆڵقاندنی وێنە، خەیاڵ، تئۆری، باوەڕو هیوا، سەرنجی خۆڵقانـدنی خـۆ دەدەن تا ئەم گۆڕانکارییە بنچینەییە پێکبێنن.

تاك دەبێت سەرەتا چالاکییە کارامەکانی "من"ی زەین ببینێـت، هـەروەها دەبێـت لـە خەیاڵ، باوەڕ، گومان و مەزەندەکران ئاگادار بێت و بیانخاتە لاوە، چونکە ئەمانە جگـە لـە



فریو شتێکیتر نین. هەندێ کەس لەوانەیە راستیان تاقیکردبێتەوە، بەڵام ئەگەر ئێوە تاقیتـان نەکردۆتەوە، بەراوردکردن دەربارەی یان خەیاڵی ئەمەی کە خودی ئێـوە لەڕاسـتیدا شـتێکی راستی، نەمرو خوائاسان، چ قازانجێکی هەیە؟ شتێکی واش دووبارە لە چوارچێوەی هزر دایە و هەرچیش لە هزر سەر هەڵبێنێت، مەرجی کراوە و بـە زەمـان و بیرەوەرییـەوە پەیوەنـدی هەیە، کەوابوو راستی نیـە. ئەگـەر کەسـێ بەڕاسـتی ئـەوە فـام بکـات ـ نـە بـە شـێوەی بەراوردکردن و نە بە شێوەی خەیاڵ یان بە شێوەیەکی گەمژەیی، بەڵکو بەڕاستی ئەم راستییە ببینێت کە هەر چالاکییێکی زەین، لە بەدواداچوونی تێکەڵ بە بـەراوردی خـۆی، لـە رێگـای پەیداکردنی فەیلەسوفان هەروەها هەر گریمانێك، هەر خەیاڵێك، هەر چاوەڕوانییەك، جگە لە فریوو کەڵەك شتێ نییە ـ کەوابوو کام دەسـەڵات و وزەی داهێنـەرە کـە ئـەم گۆڕانکارییـە بنچینەییە دروستدەکا؟

لەوانەیە بۆ گەیشتن بەم خاڵە، لە زەینی وشیار کەڵکمان وەرگرتـووە، هـەروەها بـە شـوێن گرتنی ئەم شەڕە قسە قەبووڵمان کردووە یـان ڕەتمـان کردۆتـەوە، لەوانەیـە نـاو بۆمـان روون و ئاشکراو لەوانەشە تاریك و نادیار بووە. بۆ پێشترچوون و ئەزموونکردنی قووڵتر پێویستیمان بە زەینێکە کە بۆ پەیداکردن ئارام و وشیار بێت. لێرەدا ئیتر باس لە پەیرەویکردن لە خەیاڵ نیـە، بەدوای خەیاڵداچوون یانێ بەدواداچوونی ئەوەی لە رێگای بـیرەوەرەوە دەگوترێـت و سـەرئەنجام دروستکردنی دوو فاقییە. ئەگەر دەتانەوێت لـەم مەسـەلەی گۆڕانکارییـە بنـچینەییەدا بڕۆنـە پێش، هێمنایی زەینی چالاك بە تەواوی پێویستە؟ بێگومان تەنیا کاتێ کـە زەیـن ئـارام بێـت دەتوانێت ئەم گرفتە گەورەو ئاماژەپێدراویی پێچاوی بیروبیرەوەر وەك دوو رێبازی جیا لە یـەك ـ تاقیو تاقیکراوە، چاوەدێرو چاودێرکراو ـ تێبگات. شۆڕش، ئـەم شۆڕشـە داهێنـەرە دەروون ناسانە کە لەودا "من" بوونی نیە، کاتێ روو دەدات کە بیرو بیرەوەر یەکێك بن. کاتێ کە دوو فاقی، لە چەشنی بیرەوەر وەك کۆنترۆڵ کاری بـیر نـەبێت و بـە ڕای مـن تـەنیا ئەزموونـە کـە دەتوانێت رەنگ دانەوەی ئـەو وزە داهێنەرانـە بێـت کـە بـەش بـە حـاڵی خـۆی شۆڕشـێکی بنچینەیی دروسدەکات و "من"ی دەروون ناسانە تێك و پێك دەدات. رێگاو رەوشی دەسـەڵات دەناسین، دەسەڵات لە رێگای دەسەڵاتخوازی، دەسەڵات لە رێگای دیسیپلین، دەسەڵات لە رێگای خورتی و زۆر. لە رێگای دەسەڵاتی سیاسییەوە، هیوا لەسەر ئەمەیە کە گۆڕانکاری بنـچینەیی دروستبکەین. بەڵام دەسـەڵاتێکی بـەم شـێوە دەبێتـە هـۆی تـاریکی، نـەمان، خراپـەکاری و بەهێزکردنی "من". ئێمە شێوازە جۆراوجۆرەکانی بەدەسهێنان ـ تاکی و گرووپـی ـ دەناسـین،

بەڵام هەرگیز پێمان نەناوەتە ڕێگای ئەڤین و تەنانەت ماناکەیشی نازانین، تا کاتێ کە بیرەوەرو ناوەندێك بە ناوی "من" هەیە، ئەڤین مەیسەر نیە.*

بێگومان تەنیا شتێ کە دەتوانێ گۆڕانێکی بنچینەیی دروستبکات، جۆرێ ئازادیی داهێنەری دەروونناسانە هاوڕێ لەگەڵ هۆشیاریی هەمەلایەنەو ئاگاداریی چرکە بەچرکە لە پاڵنەر، هەست، هەروەها نەستمانە. کاتێ تێگەیشتین کە ئەم ئیسمانە، باوەڕو ئیدەئالەکان تەنیا "من" بەهێز دەکەن و سەرەنجام بە تەواوی بێئاکامن، کاتێ ئێمە لەم خاڵە بە شێوەی ڕۆژانە ئاگادار دەبین و بە ڕاستییەکەی دەزانین، ئایا ناگەین بەم خاڵە سەرەکییە کە بیرەوەر بە شێوەی بەردەوام خۆی لە بیر، ڕوانین و ئەزموونەکانی جیا دەکاتەوە؟ تا کاتێ کە بیرەوەر جیا لە بیری خۆی دەژیت ـ شتێ کە هەوڵدەدات بەسەریدا زاڵبێت ـ گۆڕانی بنچینەیی بوونی دەرەکی نابێت. تا ئەو کاتەی کە "من" چاودێرە، ئەو کەسەی کە خەریکی کۆکردنەوەی ئەزموون دەبێت، خۆی لە ڕێگای ئەزموونەوە بەهێز دەکات، نە لە گۆڕانکاری بنچینەیی خەبەرێك هەیەو نە لە ئازادیی داهێنەر. ئازادیی داهێنەر کاتێ بەدیدێت کە بیرەوەر خودی بیر بێت، بەڵام بە هیچ کۆششێك لەم مەودا پەیوەندی دروستنابێت. کاتێ زەین تێبگات کە هەر جۆرە بەراوردو زۆربێژیو هەرچەشنە بیرێك تەنیا دەسەڵات بە "من" دەدات، کاتێ بزانێت تا ئەو کاتەی کە بیرەوەر جیایە لە بیر، کەموکوڕی و پارادۆکس و دووفاقی هەیە، کاتێ زەین ئەمە فام بکات، ئەوکات دەبێت بە چاوەدێرو بۆ هەمیشە دەزانێت کە چۆن خۆی لە ئەزموون، ئوتوریتەنواندن و بەدوای دەسەڵاتەوە بوون دوور ڕاگرێت. بە هەبوونی ئەو زانیارییە، بە مەرجێ کە زەین، هەرچی قووڵترو بەرینتر بە دوایدا بچێت، بەبێ ئەوەی کە بەدوای ئامانج یان مەبەستەوە بێت، بارودۆخێك پێکدێت کە لەودا، بیرو بیرەوەر دەبنە یەك. لەم دۆخەدا نە کۆششێك هەیەو نەکران و نە ئینتیمایەك بە گۆڕان. لەو دۆخەدا "من" نیە، لەبەر ئەوە گۆڕانێك هەیە کە لە زەینەوە سەرچاوە ناگرێت.*

داهێنان تەنیا کاتێ ڕوو دەدات کە زەین خاڵی بێت، ئەڵبەت مەبەستم ئەم بەتاڵبوونە ڕواڵەتییەی کە زۆربەی ئێمە هەمانە نیە. زۆربەی ئێمە بەڕواڵەت خاڵین و ئەم خاڵیبوونە خۆی لە ئینتیما بە لادان نیشاندەدات. ئێمە دەمانەوێت سەرگەرم بین، بۆیە ڕوو دەنێین لە کتێب و ڕادیۆ، دەڕۆین بۆ کۆبوونەوەی قسەکردن و دەچین بۆ لای پسپۆڕان، بەم شێوە زەین بەردەوام خۆی پڕ دەکات. مەبەستی من لە خاڵیبوون، بێفکری نیە، بە پێچەوانە، من لە بەتاڵبوونێك



قسە دەکەم کە لە بیرەوەربوونی بێوێنە پێکدێت، مەبەست ئەو کاتەیە کە زەین لە دەسەڵاتی خۆی لە خولقاندنی خەیاڵی هیچ و پووچدا ئاگادارەو هەنگاوێك لەو ئەولاتر دەنێت.

تا کاتێ کە بیرەوەرێك هەیە کە بۆ کۆکردنەوەی ئەزموون و بەهێزکردنی خۆی چاوەڕێو چاوەدێر دەوەستێت و خەریکی ڕوانین دەبێت، بەتاڵبوونی داهێنەر مەیسەر نیە. ئایا زەین دەتوانێت خۆی لە تەواوی هێماکان، وشەکان و کاریگەریەکانیان خاڵی بکات، بە جۆرێ کە تاقیکراوێك خەریکی کۆکردنەوەی تاقی نەبێت؟ ئایا بۆ زەین ئەم دەرفەتە هەیە کە تەواوی بەڵگەهێنانەوەکان، ئەزموونەکان، سەپاندن و هەموو خاوەن دەسەلاتەکان بەگشتی وەلاوە بنێت تا بڕواتە دۆخی خاڵیبوون؟ بێگومان ئێوە ناتوانن وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە، وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بۆ ئێوە مەیسەر نیە، لەبەر ئەوە ئێوە وەڵامەکەی نازانن و هەرگیز لەم بارەشەوە ڕەنجێکتان نەکێشاوە، بەڵام پێشنیاری من ئەمەیە کە گوێ بۆ پرسیارەکە بگرن و لێیگەڕێن ئەم پرسیارەتان لێبپرسن، لێگەڕێن ئەم تۆوە بچێنرێت، ئەگەر بەڕاستی گوێی بۆ بگرن لە هەمبەریدا ڕانەوەستن، ئەم تۆوە دێتە بەر.*

ئەوەی دەتوانێت گۆڕان پەیدا بکات، تازەیە نە کۆنە. ئەگەر بڕۆن بەدوای سەرمەشقی کۆنەدا، هەر جۆرە گۆڕانێك بەردەوامی کۆنەیەکی هاوسەنگ کراوەو هیچ جۆرە تازەییەکی تێدا نیە، هیچ چەشنە داهێنانێکی تێدا نابینرێت. داهێنان تەنیا کاتێ پێکدێت کە خودی زەین تازە بێت و زەین تەنیا کاتێ دەتوانێت بژیەتەوە کە توانایی چاودێری هەموو چالاکییەکانی خۆی هەبێت، نە تەنیا لە چینەکانی سەرووتر، بەڵکو لە قووڵایی دەرووندا. کاتێ زەین چالاکیی خۆی ببینێت، لە ئارەزوو، داخوازیی، حەز، ئوگری، خۆلقاندنی دەسەلاتدارەکان لەریگای خۆیەوە و لە ترسەکانی خۆی ئاگادار دەبێت کاتێ بەچاوی خۆی خۆراگرییك ببینێت کەخۆڵقاوی دەست دیسیپلین، کۆنترۆڵ و هیوایە کە دەربڕی باوەڕو ئیدەئالەکانە، کاتێ زەین بە وردی بیر بکاتەوە و لە تەواوی ئەم ڕەوتە ئاگادار بێت، ئایا دەتوانێت تەواوی ئەمانە بهاوێژێتە لایەك و تەڕو تازە ببێتەوەو بە شێوەیەکی داهێنەر، خاڵی؟ ئاگاداربوون لە توانایی یان بێتوانایی زەین لەم بارەوە کاتێ مەیسەرە کە ئەزموون لە تەك بیروباوەڕدا هاوتەك نەبێت و کەسێك نەڕوات بەدوای ئەزموونی ئەو دۆخە داهێنەرەدا. ئەگەر خوازیاری ئەزموون کردنی بن، ئەزموونی دەکەن، بەڵام ئەوەی کە ئێوە تاقیدەکەنەوە، خاڵیبوونی داهێنەر نیە، بەڵکو تەنیا جۆرێ گشتاندنی ئارەزووە. ئەگەر ئێوە خوازیاری ئەزموونی تازە بن، تەنیا خۆتان لە خەیاڵ و گوماندا نوقم دەکەن: "بەڵام

ئەگەر خەریکی چاودێری بن، ئەگەر لە چالاکییەکانی ڕۆژانەی خۆتان، چرکە بەچرکە ئاگادار بن و وەك بڵێت لە ئاوێنەدا، تەواوی ڕەفتاری خۆتان سەیر بکەن، ئەوا بە قووڵ بیرکردنەوەی زیاترو زیاتر پرسیاری کۆتایی ئەم بۆشاییە، کە تازە، تەنیاو تەنیا لەودا پەیدا دەبێت، دەدۆزنەوە.

ڕاستی، خوا یان هەرچی دەخوازن ناوی بنێن، شتێ نییە بکرێت ئەزموونی بکەیت، لەبەر ئەوە، ئەو کەسەی کە تەجروبە دەکات، بەرهەمی زەمانە، ئەنجامی بیرەوەری و ئاکامی ڕابردووە تا کاتێ کە تاقیکراوێك هەیە، ڕاستی بوونی نابێت، ڕاستی تەنیا کاتێ خۆی نیشان دەدات کە زەین بەگشتی لە چنگی ڕاڤەکار، ئەو کەسەی تەجروبە دەکات و ئەو شتەی تەجروبە دەکرێت ڕزگار بێت. ئەوکات بە وەڵام دەگەن، ئەوکات دەبینن کە گۆڕانکاری بێئەوەی کە ئێوە بتانەوێت، ڕوو دەدات. دەبینن کە بارودۆخی بەتاڵبوونی داهێنەر شتێ نییە پەروەردە بکرێت، هەر لەوێ دایە، لە تەنیایی خۆیدا بیر دەکاتەوە. بەبێ بانگێشتن دێت، تەنیا لەم بارودۆخەدا ژیانەوە، تازەیی و شۆڕش مەیسەرە.

## ١-دەربارەی قەیرانی هەنووکەیی

**پرسیار: دەڵێن کە قەیرانی هەنووکەیی بێوێنەیە، لە چ ڕوویەکەوە بە دەگمەنی دەزانن؟**

**کریشنا مورتی:** ڕوونە کە قەیرانی هەنووکەیی لە سەرانسەری دونیا شتێکی دەگمەنە. لە هەموو ماوەی مێژوودا قەیرانی جۆراوجۆری کۆمەڵایەتی، نەتەوەیی و ڕامیاری لە سەردەمە جۆراوجۆرەکاندا هەبووە. قەیرانەکان دێن و دەڕۆن، دابەزینەکانی ئابووری دێن، هاوکێش دەبن و بە شێوەیەکی دیکە درێژە دەکێشن. ئێمە ئەمە دەزانین و ڕەوتەکەی دەناسین. بێگومان قەیرانی نوێ جیاوازە. لەم ڕووەوە جیاوازە کە یەکەم، پەیوەندیی ئێمە نە بە پارەوەیەو نە بە شتانی بەرچاو، بەڵکو لەگەڵ خەیاڵەکانە. قەیران لەم ڕووەوە دەگمەنە کە لە چوارچێوەی خەیاڵپەروەری دایە، ئێمە لەگەڵ خەیاڵەکان لە شەڕ داین، ئێمە دەمانەوێت کۆشتن ڕەوایی پێ بدەین، لە هەموو شوێنێکی دونیا ئێمە خەریکین کوشتار وەك ئامرازێك بۆ گەیشتن بە دادوەری پاساو دەدەین. شتێکیش کە بەش بە حاڵی خۆی بێ نموونەیە. لە کۆندا شەڕیان شەڕ دەناسی، بەڵام ئەمڕۆ کوشتن ئامرازێك بۆ بەدەسهێنانی ئەنجامی شەرافەتمەندانەیە، کوشتن چ پەیوەندیی بە تاکێکەوە بێت چ گرووپێ لە خەڵك، لەم ڕووەوە بە ڕەوا دەزانرێت کە بکوژ یان گرووپێ کە بکوژ نوێنەری ئەوانە ئەوە وەك ئامرازێك بۆ



بەدەسهێنانی ئەنجامێ کە قازانجی بۆ مرۆڤ هەیە، پاساو دەدات. بە دەربڕینێکیتر ئێمە ئێستا فیدای داهاتوو دەکەین و جیاوازییەك نییە کە چ ئامرازێك بەکار دەبەین، گرنگیی بابەت ئەوەیە کە ئامانجی ڕاگەیەنراوی ئێمە کە دەڵێین بۆمان قازانجی هەیە، بە ئاکام بگات. کەوابوو ئاماژەی مەسەلەکە لەسەر ئەمەیە کە ئامرازێك هەڵە بە ئامانجێکی ڕاست دەگات و ئێوە بەم ئامرازە هەڵە بە یارمەتیی خەیاڵپەروەری ڕەوایی پێدەدەن. لە قەیرانە جۆراوجۆرەکاندا کە پێشتر ڕوویداوە، مەسەلەی جێی باس چەوساندنەوەی تاکەکان یان شت و مەك بووە، هەنووکە چەوساندنەوەی خەیاڵەکان لە ئارادایە. شتێ کە زیانبارترو پڕ مەترسیترە، لەبەر ئەوە چەوساندنەوەی خەیاڵەکان بەڕاستی وێرانکەرو ڕووخێنەرە. هەنووکە ئێمە بە دەسەڵاتی پڕوپاگەندەمان زانیوەو ئەمە یەکێ لە بەڵا گەورەکانە کە دەتوانێت ڕوو بدات، کەڵك وەرگرتن لە خەیاڵ بۆ گۆڕانی مرۆڤ، ئەمە هەر ئەو شتەیە کە ئەمڕۆ لە دونیادا خەریکە ڕوو دەدات. مرۆڤ ئیتر بایەخی نیە، بەڵکو ئەوەی بایەخی هەیە، سیستەمو خەیاڵەکانە. مرۆڤ ئیتر هیچ بایەخێکی نیە. ئێمە دەتوانین بە میلیۆن مرۆڤ لە نێو ببەین، بەو مەرجەی کە بە ئەنجامێك بگەین و ئەم ئەنجامەش خەیاڵپەروەریی ئێمە ڕەوایی پێدەدات.

ئێمە خاوەن پێکهاتەیەکی بە سام لە خەیاڵەکانین بۆ پاساودانی خراپەکاری و گومانێك نییە کە شتی وا نموونەی نیە. شەڕ، شەڕە، لە شەڕ خێر پێك نایەت. شەڕ ئامرازێك بۆ گەیشتن بە ئاشتی نیە. شەڕ لەوانەیە بەرژەوەندییەکی دووهەمی لەگەڵ بێت، بۆ نموونە فڕۆکەکانی کاراتر، بەڵام شتێ بە ناوی ئاشتی بەدیاری ناهێنێت. شەڕ بە شێوەیەکی ڕۆشنبیرانە وەك ئامرازێکی ئاشتیهێنەر پاساو دەدەن، بەڵێ، کاتێ کە زیرەکی لە ژیانی مرۆڤدا باڵادەستە، قەیرانە بێوێنەکان دەخولقێنێت.*

ئەڵبەت بەڵگەی دیکەش بۆ ئەوەی کە ئەم قەیرانانە بێنموونەن، هەیە. یەکێ لەوانە ئەمەیە کە مرۆڤ بایەخێکی بێوێنە بە بایەخە دونیاییەکانی وەك ماڵ و مناڵ، ناو، هۆز، وڵات و هتد داوە. ئێوە یان موسوڵمانن یان هێندو یان مەسیحی یان کۆمۆنیست. ناوو ئەو شتانەی کە بەستراون بە مرۆڤ، هۆزو وڵات لە هەر شتێ زیاتر بایەخی پەیدا کردووە کە ماناکەی ئەمەیە مرۆڤ دیلی بایەخە دونیاییەکان بووە، بایەخی شتەکان، چ دروستکراوی دەستی مرۆڤ بێت، چ دروستکراوی زەینی ئەو.

دەستکردەکانی مرۆڤ ئەوەندە بایەخیان پەیدا کردووە کە ئێمە لەبەر ئەوانە خەریکی کوشت و بڕ، وێرانی، قەسابی و لە نێوبردنی یەکترین. ئێمە لە لێواری کەنداڵ نزیك بووینەتەوە، هەر

ئیشێك كە ئەنجامی دەدەین، ئێمە دەكێشێتە ئەوێ، هەر كارێكی رامیاری یان ئابووری ناچار ئێمە بەرەو هەڵدێر دەبات، ئاڵۆزی و پشێوی و شێواوی تووشی ئێمە دەكات. كەوابوو قەیرانی بێوێنە پێویستی بە هەنگاوی بێوێنە هەیە. تەركی قەیران یان دەربازبوون لێی پێویستی بە هەنگاوێكی جیا لە زەمانە، هەنگاوێك كە پشتی بە بیرۆكە یان سیستمێك نەبەستبێت. لەبەر ئەوە هەر كارێك كە پشتی بە سیستم یان بیرۆكەیەك بەستبێت، ناچار بە ئاكامێك ناگات. هەنگاوێكی وا تەنیا ئێمە لە رێگایەكی ترەوە دەباتەوە بۆ نێو ئەو گێژاوە. لەوێڕا كە قەیرانێكی بێوێنەیە، هەنگاوی پێویستیش دەبێت بێنموونە بێت، مانای ئەم قسە ئەمەیە كە ژیانەوەی تاك دەبێت دەسبەجێ جێبەجێ بێت، نە لە درێژەی زەماندا. دەبێت هەر ئێستا روو بدات، نە سبەی، چونكە سبەی، رەوتێكی لەت لەت كەرە. هەر كات بۆ گۆڕینی خۆ لە بیری سبەیدا بن، بە پێشوازی شێواوییەوە دەڕۆن و هێشتاش لەچۆارچێوەی وێرانكاریدان. ئایا ئیمكانی گۆڕان هەر لەم زەمانەدا هەیە؟ ئایا ئەم دەرفەتە هەیە كە خۆمان بە شێوەی خێراو هەر ئێستا، بگۆڕین؟ من دەبێژم ئەرێ، ئەم دەرفەتە هەیە.*

گرنگ ئەمەیە كە بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ قەیرانێكدا كە زاتێكی دەگمەنی هەیە، دەبێت لە بیركردنەوەی ئێمەدا شۆڕش پێكبێت و ئەم شۆڕشە، ناتوانێت لە رێگای هیچ كەسێكیتر، هیچ كتێب یان هیچ رێكخراوێكەوە بێتە دی، دەبێت لە رێگای خودی ئێمەو لە رێگای تاك تاكی ئێمەوە روو بدات. تەنیا لەو حاڵەدا دەتوانین كۆمەڵگایەكی نوێ، پێكهاتەیەكی نوێ، دوور لە ترسو دوور لەم هێزە لە رادەبەدەر رووخێنەرانە كە بە كۆكردنەوەو كەڵەكەكردنی ئەوانەوە مژولن، دروستبكەین و گۆڕان كاتێ دێتە ئاراوە كە ئێوە وەك تاكێك، خودئاگاهی لە هەر هزرو هەنگاوو هەستێكدا دەسپێبكەن.

## ٢-دەربارەی ناسیۆنالیزم

**پرسیار: كاتێ ناسیۆنالیزم دەڕوات، چ شتێ دێت؟**

**كریشنا مورتی:** روونە، زیرەكی، بەڵام خەیاڵ دەكەم كە ئەمە مانای راستەوخۆی پرسیارەكە ناگەیەنێت. مانای ناڕاستەوخۆی ئەمەیە كە دەكرێ چ شتێ لە جیاتی ناسیۆنالیزم دابنرێت؟ هەر جێنشین كردنێك، هەنگاوێكە زیرەكی پێكنایەنێت. ئەگەر من پەیڕەوی مەزهەبێك بم‌و بڕۆمە سەر مەزهەبێكیتر، یان حیزبێكی سیاسی تەرك بكەم و دواتر پەیوەست ببم بە حیزبێكی دیكەوە، ئەم جێنشین كردنە بەردەوامە، نیشانەی دۆخێكە كە زیرەكی تێدا نیە.*



بزانین ناسیۆنالیزم چۆن دەڕوات؟ فامی قووڵی تەواوی چەمكی ناسیۆنالیزم و توێژینەوەو ئاگاداربوون لە بایەخی، لە هەنگاوی دەرونی‌و دەرەكیدا تەنیا رێگەچارەیە. لە رووی دەرەكییەوە ناسیۆنالیزم جیایی دەخاتە نێوان خەڵك و دەبێتە هۆی دابەشكردنی چینایەتی، شەڕو وێرانی كە روونە بەلای چاودێرانەوە. لە رووی دەروونی یان دەروونناسییەوە، ئەم هاوشێوەیی لەگەڵ گەورەتر، لەگەڵ وڵاتێك و لەگەڵ خەیاڵێك، بە ئاشكرا جۆرێ خۆ گەورە كردنە. كاتێ من لە گوندێك یان شارێكی گەورەدا ژیان دەكەم، كە سێ نیم، بەڵام ئەگەر خۆم لەگەڵ شتێ گەورەتر یان لەگەڵ وڵات هاوشێوە بكەم، ئەگەر ناوی هیندو لەسەر خۆ دانێم، ئەم كارە دڵخۆشییەكی بێبناغە دەدات بە خۆخوازیم، رەزامەندی، بایەخ و جۆری هەستی ژیان باشی دەدات بە من و ئەم هاوشێوەیی لەگەڵ گەورەتردا كە بۆ ئەوانەی كە خۆ گەورەكردن بە پێویست دەزانن، لە پێویستییەكانە، لەگەڵ ئەوەی كە پارادۆكس و كێشمەكێشی نێوان تاكەكانی لە تەك دایە. بۆیە ناسیۆنالیزم نە تەنیا هۆكاری پارادۆكسی دەرەوەییە، بەڵكو بێئاكامی دەروونیشی لە تەك دایە. كاتێ كەسێك ناسیۆنالیزم ـ تەواوی پرۆسەی ناسیۆنالیزم ـ تێبگات، ناسیۆنالیزم دادەكەوێت. فامی ناسیۆنالیزم لە رێگای زیرەكییەوە و لە رێگای روانینی وردو لێكۆڵینەوە و بیركردنەوەی قووڵ لە رەوتی گشتیی ناسیۆنالیزم یان نیشتمانپەروەری پێكدێت. زیرەكی ئەنجامی ئەم لێكۆڵینەوەیە و بە هەبوونی زیرەكی، هیچ شتێك جێنشینی ناسیۆنالیزم نابێت. هەر كە مەزهەب جێنشینی ناسیۆنالیزم بكەن، مەزهەبیش دەبێت بە ئامرازێكی دیكە بۆ خۆ گەورەكردن، سەرچاوەیەكی دیكە بۆ پەرێشانی رۆحی و دەبێتە ئامرازێك بۆ خۆراكی خود لە رێگای باوەڕەوە، بۆیە هەرچەشنە جێگرێك، هەرچەندەش شەریف بێت، جۆرێ تاریكییە. وەك مرۆڤێكە كە بنێشت یان جۆری چەرەز لە جیاتی جگەرەكێشان دادەنێت. بەڵام ئەگەر تاك تەواو مەسەلەی جگەرەكێشان، رموودەیی، پێداویستییە ماددییەكان، داخوازییە رۆحییەكان و باقیی مەسەلەكان تێبگات، ئەوا جگەركێشان تەواو دەبێت. فامی ئەم خاڵە كاتی مەیسەرە كە باری وشیارییەكەی باشتر بێت و ئەركی خۆی بەجێ بێنێت. بەڵام هەركات قسە لە جێگر بێتە ناو، زیرەكی نیە. لە جیاتیی دانان، تەنیا جۆرێ بەرتیل دانە بە خود تا ئێوە هەڵخڕێنێت كە ئەم ئیشە نەكەن و ئەو ئیشە بكەن. ناسیۆنالیزم ـ بە ژارە مەترسیەدارەكەیەوە و بە بەڵاو شەڕی دنیایی ـ تەنیا كاتێ لە نێو دەچێ كە زیرەكی هەبێت و زیرەكی تەنیا بە تەواوكردنی تاقیكردنەوە و خوێندنەوەی كتێب بەدەس نایەت. زیرەكی كاتێ دێتە ئاراوە كە گرفتەكان بەو جۆرەی كە سەرهەڵدەدەن، تێبگەین. كاتێ مەسەلە لە ئاستە جۆراوجۆرەكاندا فام بكرێت ـ نە تەنیا لە بەشی دەرەوە، بەڵكو هەروەها لە بەشی

ناوخۆیی‌و ئاماژەپێدراویی دەروونناسانە ـ ئەوا زیرەکی لەم ئاراستەدا لە دایك دەبێت. کەوابوو هەرکات زیرەکی ببێت، لە جیاتی دانان مانای نییە و هەرکات زیرەکی ببێت، ناسیۆنالیزم و نیشتمانپەرستی کە شێوەیەکە لە گەمژەیی، لە نێو دەچێت.

## ٣ـ مەبەست لە هەبوونی مامۆستایانی رۆحانی چییە؟

**پرسیار: ئێوە دەڵێن کە پێویست بە رێبەران نیە، بەڵام من بە چ جۆر دەتوانم بێیارمەتی ئاقڵانەو رێنوێنی کە تەنیا لە رێبەرێك دەوەشێتەوە، دەستم بە ڕاستی رابگات؟**

**کریشنا مورتی:** پرسیار ئەمەیە کە ئایا پێویست بە رێبەر هەیە یان نا؟ ئایا دەکرێ لە رێگای کەسانی ترەوە راستی گیر بێنین؟ هەندێك دەڵێن ئەرێ و هەندیکی تریش دەڵێن نا. ئێمە بە دوای دۆزینەوەی راستی ئەم پرسەوەین، نە ئەوەی کە بیروڕامان بە بەراورد لەگەڵ بیروڕای ئەویتر چیە؟ من دەربارەی ئەم مەسەلە رایەکم نیە. یان بەم شێوەیە یان بەم شێوە نیە. مەسەلەی پێویست بوون یان نەبوونی رێبەر، مەسەلەیەکی بڕوایی نیە. راستی ئەم مەسەلە بە باوەڕەوە، هەرچەندەش ئەم باوەڕە قووڵ، زانایانە، خەڵك پەسندو گشتی بێت، پەیوەندی نیە، بەڵکو دەبێت دەستی بخەیت.

سەرەتا هەبوونی رێبەر بۆ چییە؟ دەڵێین پێویستیی ئێمە بە رێبەر لەم رووەوەیە کە ئێمە شێواوین و رێبەر لە پیشاندانی راستی بە ئێمە بەکەڵکە، ئەو لە فامی مەسەلەکاندا یارمەتی ئێمە دەدات. ئەو سەبارەت بە ژیان زیاتر لە ئێمە دەزانێت، ئەو لە فێرکردنی ئێمە لە ژیاندا لە جێی باب و مامۆستایە، ئەو ئەزموونێکی فرە فراوانی هەیەو ئێمە ئەزموونێکی فرەکەم. ئەو بە ئەزموونە زۆرەکانی یارمەتی ئێمە دەدات و لەم جۆرە قسانە. بەدەربڕینێکیتر، کاتێ تاك سەردانی مامۆستایەك دەکات کە حەیرانەو ئەگەر خاڵێکی ناڕوون لە دەروونیدا نەبێت، پێویستی بە رێبەر نییە. بە راشکاوی ئەگەر تاك بە شێوەیەکی قووڵ خۆشحاڵ ببوایەت، گرفتێکی نەدەبوو و بە تەواوی لە ژیان تێدەگەیشت، بۆ لای هیچ رێبەرێك نەدەچوو، بەڵام لەبەر حەیران بوونمان، بەدوای مامۆستادا دەگەڕێین تا رێگای ژیانمان فێر بکات، هێمنیی‌و ئارامی بدات بە حەیران بوونمان و راستیمان بۆ پەیدا بکات. بەدوای رێبەرێکدا دەچین بۆ ئەوەی کە حەیرانین و هیواداریین ئەوەی لێی دەخوازین، لەبەر دەستمان دابنێت. بە دەربڕینێکی تر، رێبەرێك هەڵدەبژێرین کە داخوازییەکانمان جێبەجێ بکات، هەڵبژاردنی ئێمە بە پێی رەزامەندییە کە ئەو دەیدات بە ئێمەو ئەوەی کە ئێمە هەڵمان بژاردووە، هەر ئەو شتەیە کە



ئێمە رازی دەکات. هیچ کەس بەدوای رێبەرێکدا ناڕوات کە بڵێت: "پشت بە خۆت ببەستە"، هەڵبژاردنی رێبەر لەسەر بناغەی دەمارگیرییەکانە. کەوابوو لەوێڕا کە ئێوە رێبەری خۆتان بە پێی ئەو رەزامەندییەی کە بە ئێوەی دەدات هەڵدەبژێرن، بەدوای راستییەوە نین. بەڵکو بەدوای سەفەرێکەوەن بۆ رزگاری لە سەرلێشێواویتان و بە هەڵە ئەم رێگا هەڵاتن لە سەرلێشێواوییە، راستی دەزانن. ❊

ئیزن بدەن سەرەتا ئەم خەیاڵەی کە رێبەر دەتوانێت هێمنی و ئارامی بە سەرلێ‌شێواویمان بدات، بخەینە بەرباس و لێکۆڵینەوە. ئایا کەسێ هەیە کە بتوانێت بە حەیرانیمان کە ئاکامی دژکردەوەکانمانە هێمنی و ئارامی بدات؟ ئێمە خۆمان ئەم سەر لێ‌شێواویەمان خولقاندووە؟ هەستدەکەن هۆکاری ئەم بێ‌دەرەتانی، ئەم خەباتەی کە هەیە لە تەواوی ئاستەکانی ژیاندا چ لە دەروون و چ لە دەرەوە، کەسێکی دیکە بێت؟ نا، ئەمە ئەنجامی نەبوونی زانستی ئێمەیە دەربارەی خودی خۆمان. لەبەر ئەم هۆیەی کە ئێمە لە خوو، پارادۆکسەکان، کاردانەوەو بێ‌دەرەتانییەکانی خۆ ئاگادار نین، روو دەنین لە رێبەران. لەبەر ئەوە خەیاڵ دەکەین کە ئەوان بۆ رزگاری لە چنگی سەر لێشێواوییەکان یارمەتیمان دەدەن. تێگەیشتنی ئێمە لە خۆمان تەنیا لە رێگای پەیوەندی لەگەڵ باری دەروونی دایە و خودی ئەم پەیوەندییە، نە کەسێك لە دەرەوە، واتا رێبەر، ئەگەر کەسێك لەم پەیوەندییە تێنەگات، هەرچی کە رێبەر بڵێت بێ‌کەڵکە، لەبەر ئەوە کاتێ تاك تێگەیشتنێکی سەبارەت بە پەیوەندی ـ پەیوەندی خۆ لەگەڵ شتە تایبەتییەکان، تاك و ئایدیا ـ نەبێت، کێ دەتوانێت پارادۆکسی دەروونی ئەو چارەسەر بکات؟

بۆ چارەسەری پارادۆکس، خودی من دەبێت ئەوە بناسم، واتا خودئاگاهی من لە رێگای پەیوەندییەوە بێت. بۆ وشیاری پێویست بە هیچ رێبەرێك نیە. ئەگەر من خۆم نەناسم، چ کارێك لە دەستی رێبەر دێت؟ هەروا کە رێبەری سیاسی لە لایەن کەسانێکەوە هەڵدەبژێردرێت کە لە حەیراندا دەژین، کەوابوو هەڵبژێراوەکەیشیان حەیرانە، هەڵبژاردنی رێبەر لە لایەن ئێمەیشەوە هەروایە. هەڵبژاردنی رێبەر لە لایەن ئێمەیشەوە لە رووی حەیرانیمانەوەیە، کەوابوو ئەویش وەك رێبەری سیاسی حەیرانە. ❊

گرفتی گرنگ ئەمە نییە کە هەق بە کێیە، ئایا هەق بە منە یان ئەوانەی کە دەڵێن رێبەر پێویستە. هەستکردن بەم مەسەلەیە کە بۆچی پێویستی بە رێبەر هەیە، بایەخی هەیە. بوونی رێبەر بە مەبەستی کەڵکی جۆراوجۆرە، بەڵام ئەمە پێوەندی بە مەسەلەکەوە نیە. ئەگەر کەسێ بە ئێوە بڵێت خەریکە پێشدەکەون، رازیدەبن، بەڵام پەیداکردنی ئەم خاڵەی کە بۆچی بوونی

ڕێبەر پێویستە، کلیلی مەسەلەکەیە. کەسێك لەوانەیە ڕێگەکە نیشانبدات، بەڵام ئەو کەسەی کە هەموو کارەکان ئەنجامدەدات، ئێوەن، تەنانەت ئەگەر ڕێبەرێکیشتان هەبێت. لەوەێڕا کە ئێوە ناتانەوێت لەگەڵ هەموو ئەم مەسەلانەدا بەرەوڕوو بن، بەرپرسایەتی دەخەنە ئەستۆی ڕێبەر. کاتێ خودئاگاهی هەندەکی بێت، ڕێبەر بێکەڵك دەبێت. هیچ ڕێبەرو هیچ کتێب و هیچ نووسراوێك ناتوانێت خودئاگاهی بە ئێوە بدات. خودئاگاهی کاتێ دێتە دی کە ئێوە لە ڕێگای پەیوەندییەوە لە خۆ ئاگادار بن. بوون واتا هەبوونی پەیوەندی، ئاگادار نەبوون لە پەیوەندی واتا بەڵا، واتا شەڕ. ئاگادار نەبوون لە پەیوەندیی خۆ لەگەڵ شتە تایبەتیو بەستراوەییەکان، یەکێ لە هۆکانی حەیرانە. ئەگەر تاك پەیوەندی دروستی خۆی لەگەڵ شتە تایبەتی و بەستراوەییەکانی نەناسێت، بێگومان ناکۆکی دروستدەبێت، شتێ کە دەبێتە هۆی روو لە زیادبوونی ناکۆکی لە کۆمەڵگا، ئەگەر ئێوە پەیوەندیی خۆتان لەگەڵ خودو هاوسەرتان، هەروەها لەگەڵ خودو منداڵتان نەناسن، چ جۆر چاوەڕوانن تاکێکی تر ناکۆکییێك کە لەم پەیوەندییە سەری هەڵداوە چارەسەر بکات؟ هەر بەم شێوەیەش دەربارەی ئایدیا، باوەڕو کاریێ لەم چەشنەش.

هۆی ئەوەی کە ئێوە بەدوای ڕێبەردا دەچن، ئەوەیە کە پەیوەندیی ئێوە لەگەڵ خەڵك، پێداویستییە شەخسییەکان و ئایدیا شێواوەکانە. ئەگەر ئەو ڕێبەرەی کە ئێوە بە دوایەوەن، ڕێبەرێکی راستەقینە بێت، بە ئێوە دەڵێت کە خۆتان فام بکەن. ئەوەی کە بووەتە سەرچاوەی ئەم لێك نەگەیشتن و شێواوییە، خودی ئێوەن و خودی ئێوە دەتوانن ئەم ناکۆکییە تەنیا لە ڕێگای فامی خۆ لە پەیوەندیدا، چارەسەر بکەن.

پەیداکردنی راستی لە ڕێگای ئەوانیترەوە مەیسەر نیە. چ جۆر شتی وا مەیسەرە. راستی شتێکی مەند نیە، شوێنێکی نەگۆڕی نیە، بە ئامانجیش ناژمێردرێت، بە پێچەوانە شتێکە زیندوو، دینامیك، هۆشیارو وریا. چ جۆر دەتوانێت ئامانج بێت؟ ئەگەر راستی خاڵێکی چەسپاو بێت، ئیتر راستی نیە. لەو شێوەدا بڕوایەکی رووتەو هیچیتر. راستی شتێکە نەزانراو و زەینێ کە هەرکەس بەدوای راستییەوە بێت، هەرگیز پەیدای ناکات. لەبەر ئەوە زەین لە زانراوەکان پێکهاتووە، ئەنجامی رابردوو بدەی زەمانە. شتێ کە خودی ئێوە دەتوانن بیبینن. زەین ئامرازی دەست زانراوەکانە. کەوابوو ڕێبەر بەدوای پەیداکردنی زانراوەکانەوە نیە، تەنیا دەتوانێت لە زانراوەکانەوە بڕوات بۆ نەزانراوەکان. کاتێ زەین بەدوای راستیدا دەچێت- راستییەك کە لە کتێبەکاندا خوێندوویە ـ بە دوای راستیدا دەڕوات، بەدوای وەدانی خۆ وەیە



نەراستی. کەوابوو، ئیدەئال شتێکە خۆ وێنەکراو، شتێکە ناڕاستەقینە، شتێکە خەیاڵی. ئەوەی راستییە، هەر ئەو شتەیە کە هەیە، نە پێچەوانەی. بەڵام زەینەکە بەدوای راستی، خوداو زانراوەکانەوەیە.

کاتێ ئێوە بیرلە خودا دەکەنەوە، خودای ئێوە وێنەیەکی لە بیری خۆتان و بەرهەمی کاریگەرییە کۆمەڵایەتییەکانە. ئێوە تەنیا دەتوانن لە بیر زانراوەکانڕا بن، ئێوە ناتوانن دەربارەی نەزانراوەکان بیر بکەنەوە، ئێوە ناتوانن پشت بە هەقیقەت ببەستن. هەر ئەو چرکەی کە دەکەونە بیر نەزانراوەکان، مەبەستتان زانراوە خۆ وێنە کراوەکانە. راستی یان خودا، شتانێك نین کە بکرێت بیریان لێ بکەیتەوە. ئەگەر لەم بارەوە بیر بکەنەوە، دەربارەی راستی بیرتان نەکردووەتەوە.*

راستی شتێك نییە کە بەدوایدا بگەڕێین، راستی شتێکە کە بەرەولای ئێوە دێت. ئێوە تەنیا دەتوانن بڕۆن بە دوای زانراوەکاندا. تەنیا کاتێ زەین دیلی ئازاری زانراوەکان یان کاریگەریی زانراوەکان نەبێت، دەتوانێت خۆی دەربخات. راستی لە هەر گەڵایەکدا، لە هەر دڵۆپە فرمێسکێکدا هەیەو شتێکە کە دەبێت چرکە بە چرکە، بزانرێت. هیچ کەس ناتوانێت ئێوە بەرەولای راستی ڕێنمایی بکات و ڕێنوێنی لە لایەن هەر کەسێکەوە بێت، بەرەو زانراوەکانەو هیچی تر.*

راستی تەنیا دێتە ناو ئەو زەینەی کە خاڵی بێت لە زانراوەکان و لە دۆخێکدا تێدەچێت کە زانراوەکان ئامادە نین و سەرقاڵی کردەوە نین. زەین عەمباری زانراوەکانە، پاشەڕۆکی زانیارییەکان و بۆ ئەوەی کە زەین لە دۆخێکدا بێت کە نەزانراوەکان سەرهەڵبێنن، دەبێت لە خۆی و ئەزموونی رابردووی خۆی ـ چ خۆ ویست چ خۆ نەویست ـ دژکردەوە، وەڵام و پێکهاتەی خۆی ئاگادار بێت. کاتێ کە خودناسیی تەواو هەبوو، زانراوەکان بە کۆتایی دەگەن و ئەوجا زەین لەوانە چۆڵ دەبێت، ئەو کاتەیە کە راستی بانگێشت نەکراو دێتە ناوەوە. راستی هی من یان هی تۆ نیە. ئێوە ناتوانن ستایشی بکەن. هەر لە چرکەیەکدا کە بزانرێت ئیتر راستی نیە، نە هێما راستییەو نە وێنە، بەڵکو هەرکات فامی خودی خۆ مەیسەر بێتو "خود" راوەستێت، هەتاهەتایی بوون پەیدا دەکات.

## ٤ـ دەربارەی زانست

**پرسیار: لە قسەکانی ئێوە وا تێدەگەم کە فێربوون و زانست ڕێگرن. ئەگەر وایە، ئەوانە ڕێگری چ شتێکن؟**

**کریشنا مورتی:** بێگومان، زانست و فێربوون ڕێگری مافی تازەکان و ئەو شتانەن کە جیا لە زەمان و نەمرن. پێکهێنانی تەکنیکێکی تەواو، مرۆڤ ناکات بە داهێنەر. ئێوە لەوانەیە شێوازی وێنەکێشان بە شێوازێکی نایاب بزانن، لە تەکنیکی تەواو بەهرەمەندن، بەڵام بە وێنەکێشێکی داهێنەر نەژمێردرێن. هەروەها لەوانەیە کە ئێوە شێوازی شیعر وتن بزانن و لە رووی تەکنیکیشەوە عەیب و کەموکوڕییەك لە کارەکانتاندا نەبێت، بەڵام شاعیر نەبن. شاعیربوون واتا هەبوونی توانایی تێگەیشتنی تازەکان، نیشاندانی حەساسیەتی تەواو بۆ وەڵامدانەوە بە شتە نوێیەکان. بۆ زۆربەی ئێمە زانست یان فێربوون بووە بە جۆرێ خۆگرتن و ئێمە خەیاڵ دەکەین کە لە ڕێگای زانینەوە دەبینە داهێنەر. زەینێ کە زۆر قەرەباڵغە، زەینێ کە لە قەفەزی راستیو زانستدا دیلکراوە، ئایا بەڕاستی توانایی وەرگرتنی شتی نوێ، لە ناکاو و دەسبەجێ هەیە؟ ئەگەر زەینی ئێوە لە ناو ئەڵقەی قەرەباڵغیی زانراوەکاندا بێت، ئایا لەو هەلومەرجەدا هەیە کە بتوانێت شتێك لە نەزانراوەکان وەربگرێت؟ بێگومان، زانست هەمیشە شتێکە کە بە زانراوەکانەوە پەیوەندی هەیەو ئێمە بەم زانراوانە لە هەوڵداین کە ئەو نەزانراوانەی کە لە پێواندا ناگونجێن، تێبگەین.

بۆ نموونە سەرنج بدەنە شتێکی زۆر ئاسایی کە بۆ زۆربەی ئێمە پێش دێت، کەسانێك مەزهەبی نین ـ ئێستا مەزهەبی بوون بە هەر مانایەك کە بێت ـ تێدەکۆشن لە خودا بۆخۆیان وێنەیەکی زەینییان هەبێت یان ئەمەی کە تێدەکۆشن بزانن خودا چییە. کتێبی زۆریان خوێندۆتەوە، دەربارەی ئەزموونی پاکان، مۆرشیدان، مۆهاتماکان و کەسانی لەم جۆرە خوێندنەوەیان هەبووەو هەوڵدەدەن لەم ئەزموونانەی ئەوانیتر بۆخۆیان وێنەیەکی خەیاڵی بکێشن یان هەستێکیان لێی بێت. بە دەربڕینێکیتر، لە ڕێگای زانراوەکانەوە نزیك دەبنەوە لە نەزانراوەکان. ئایا ئەمە بەڕاستی مەیسەرە. ئایا دەکرێت لە بیری شتێکدا بێت کە نەناسرابیت؟ نا، توانایی ئێمە لە بیرکردنەوەدا دەربارەی ئەوانەیە کە دەیانناسین، بەڵام هەنووکە ئەم لادانە بێوێنە لە دونیادا خەریکە روو دەدات، ئێمە خەیاڵدەکەین کە ئەگەر زانیاریی زیاتر، کتێبی زۆرتر، راستی زیاترو بابەتی چاپکراوی زیاترمان هەبێت، توانایی فام و تێگەیشتنمان دەبێت.



بۆ ئاگاداربوون لە شتێ کە وەدانی زانراوەکان نەبێت، دەبێت بە یارمەتی تێگەیشتن، ڕێچکەی زانراوەکان لە نێو ببردرێت. بەگشتی بۆچی دەبێت زەین ئەمەندە دەستەو داوێنی زانراوەکان بێت؟ ئایا لەبەر ئەوە نییە کە هەمیشە بەدوای دڵنیاییو ئاسایشەوەیە؟ سروشتی زەین تێکەڵی زانراوەکان و زەمان بووە، چ جۆر وەها زەینێك کە بنەو بنچینەی لەسەر رابردوو و زەمانە، ئەزموونی بێزەمانی دەکات. زەینێکی وا لەوانەیە نەزانراوەکان بە شێوەیەکی ڕێكوپێك دەربێنێت و وێنەو وێناکردنێکی لەوان هەبێت. بەڵام تەواوی ئەمانە کارێکی بێسەمەرە، نەزانراو، کاتێ دێتە ئاراوە کە زانراو فام بکرێت، لە نێو بچێت و وەلاوە بنرێت. شتی وا لەڕادەبەدەر دژوارە، لەبەر ئەوە هەر کە تاك لە شتێ ئەزموونی بەدەست هێنا، زەین بە وشەی زنراوە وەری دەگێڕێت و لە چوار دیواری رابردوودا زیندانیی دەکات. نازانم چ سەرنجێکتان بەوە داوە کە هەر ئەزموونێکی خێراو بە پەلە وەردەگێڕدرێت، ناوی لێ دەنرێت، ڕێكوپێكو سەفت و زەفت دەبێت. کەوابوو جووڵانی زانراوەکان زانستە و بێگومان فێربوون و زانایییەکی وا جگە لە کۆسپی ڕێگا شتێ نیە.*

گریمان کە ئێوە تا ئێستا هیچ کتێب، چ مەزهەبی و چ دەروونناسیتان نەخوێندۆتەوەو ناچار بن چەمك و مانای ژیان تێبگەن. لە کوێڕا دەستی پێدەکەن؟ گریمان هیچ مورشید، ڕێکخراوی مەزهەبی، بووداو هیچ مەسیحێك نیەو ئێوە دەبێت لە سەرەتادا دەستپێبکەن. چ جۆر دەس پێدەکەن؟ سەرەتا دەبێت ئاراستەی بیری خۆتان تێبگەن. وێنەیەك لە خۆتان و هزرتان لە داهاتوودا مەکێشن و خواوەندێك کە ئێوە رازی بکات، دروستمەکەن. شتی وا زۆر منداڵانەیە. بۆیە دەبێت سەرەتا شارەزای ئاراستەی فیکریتان بن. ئەمە تەنیا ڕێگای پەیداکردنی هەر شتێکی تازەیە. کاتێ دەڵێین فێربوون و زانست ڕێگرن، ئێمە زانستی تەکنیکی ـ وەك لێخوڕینی ئوتومبیل، چۆنیەتیی وەگەڕخستنی دەزگاکان یان توانایی ئەم زانستە لە جێبەجێکردندا هاوپێچ ناکەین. بۆچوونی ئێمە شتێکی بەتەواوی جیاوازە، مەبەستمان ئەو دۆخە خۆشەی رەوشە کە زانست و فێربوون، هەرچەندەش بن پێکهێنەری نین. داهێنەربوون بە مانای واقیعیی وشە، واتا رزگاربوون لە تەواوی چرکەکانی رابردوو، چونکە ئەمە رابردووە کە لەسەر حاڵی ئێمە قورسایی دەکات، تەنیا ئاوێزان بوون بە زانیاری و ئەزموونی ئەوانیتر، بەوەی کە ئەوانیتر گوتوویانە، هەرچەندەش بایەخی هەبێت و هەوڵدان بۆ خۆ تەریك کردنەوە لەوەی کە ئەوانیتر کردوویانە، واتا زانست ، مەگەر وانیە؟ بەڵام پەیداکردنی هەر شتێکی نوێ دەبێت بە تەنیاییەوە دەسپێبکرێت، دەبێت رووت و قووت، بەتایبەت رووت لە زانست سەفەر

دەسپێبکەن، لەبەر ئەوە لە ڕێگای زانست و باوەڕەوە دەسختستنی ئەزموون زۆر ئاسانە، بەڵام ئەم ئەزموونانە تەنیا بەرهەمی خۆگشتاندنە و لەم ڕووەوە بەتەواوی ناڕاست و درۆی ڕووتن. ئەگەر دەتانەوێت بە تەنیایی تازەکان پەیدا بکەن، هەڵگرتن و بردنی کۆڵێك کۆنەی قورس، بە تایبەت کۆڵێك لە زانستی کۆنی ئەویتر ـ هەرچەندەش بایەخی ببێت ـ بێ سەمەرە. ئێوە لە زانست وەك ئامرازێك بۆ پاراستنی خۆتان کەڵك وەردەگرن و دەتانەوێت دڵنیابن کە ئێوەش هەمان ئەزموونتان هەیە کە بوودا، مەسیح یان فلاّن و فیسار هەیان بوو. بەڵام مرۆڤێ کە بەردەوام بە یارمەتیی زانست لە خۆی پشتیوانی دەکات، بەڕاشکاوی تاقیبکاری ڕاستی نیە.

بۆ پەیداکردنی ڕاستی ڕێگەیەك نیە. دەبێت بڕۆیتە ناو دەریایەکی نەناسراو، دەریایەك کە نابێتە هۆی خەمۆکی، دەریایەك کە مەترسیهێنەر نیە. کاتێ دەتانەوێت شتێکی نوێ پەیدا بکەن، کاتێ مژووڵی ئەزموونی شتێکن، زەینتان دەبێت بە تەواوی ئارام بێت. ڕاستیو زانست کە زەینی ئێمەش تووشی قەرەباڵغی دەکەن، کۆسپی ڕێگای مەسەلە تازەکانن. گرفتی زۆربەی ئێمە ئەوەیە کە زەین ئەوەندە گرنگ و ئەوەندە بە بایەخ بووە کە لە کاری ئەوەی کە تازەیەو ئەوەی کە لەوانەیە زەمان لەگەڵ زانراوەکاندا هەیبووبێت، دەست وەردەدات. کەوابوو زانست و فێربوون بۆ تاقیبکاران و ئەو کەسانەی کە لە هەوڵی ئەوەدان ئەوەی کە زەمانی نییە فام بکەن، کۆسپێك زیاتر ناژمێردرێن.

## ٥ ـ دیسیپلین

**پرسیار: تەواوی مەزهەبەکان لەسەر جۆرێ دیسیپلین خۆیان بۆ هاوسەنگ کردنی هێزە جانەوەریەکانی مرۆڤ پێداگریان کردووە. پاکان و خواناسان بانگەشەی ئەوەیان کردووە کە لە ڕێگای دیسیپلینی خۆیانەوە، وەك خودایان لێهاتوەو بەو جۆرەی کە لە قسەکانی ئێوەڕا دێت، ئەم جۆرە دیسیپلینە کۆسپی ڕێگای فامی خودایە. من ئاڵۆزکاو بوومە. لەم پرسەدا هەق بە کێیە؟**

**کریشنا مورتی:** قسە لەسەر ئەوە نییە کە هەق بە کێیە. ئەوەی کە بایەخی هەیە ئەمەیە کە وەڵامی پرسیارەکە خۆمان بیدۆزینەوە، نە لە ڕێگای پیاوچاکێك یان کەسێك خەڵکی هیند یان شوێنێکی دیکەیە، هەرچی غەریبتر بێت، چاکترە.

ئێوە لەسەر ئەم دوو ڕێگایە گیرتان کردووە، تاکێ دەڵێت دیسیپلین، ئەویتر دەڵێت بە بێ دیسیپلین. بە زۆری ئێوە ئەو شتەی هەڵدەبژێرن کە ئاسانترو دڵخۆشکەرترە. کەسێك



لەبەر بەژن و باڵای، ئەو وشانەی کە دووپاتیان دەکاتەوە، لایەنگری تایبەتی لە کاروبارو شتێ لەم جۆرە، خۆش دەوێت. هەنووکە بێن و هەمووی ئەمانە بەلاوە بنێین و ئەم پرسیارە ڕاستەوخۆ بشکێنین و ڕاستیی مەسەلەکە بۆ خودی خۆمان دەسنیشان بکەین. لەم پرسەدا، مانای زۆر شاردراوەتەوەو ئێمە دەبێت بە لەسەرەخۆیی و بە شێوازێکی تێستی لە گەڵی بەرەوڕوو ببینەوە.

زۆربەی ئێمە، پێویستمان بە خاوەن دەسەڵاتێك هەیە کە ئەرکەکانمان بیر بخاتەوە. لەوێڕا کە بە شێوەی سروشتی دەمانەوێت لە ئاسایشدا بژین و ڕەنجی زیاتر نەکێشین، بۆ ڕەفتارو ئاکاری خۆمان چاوەڕوانی ڕێنماییین. دەڵێین کە فلاّن کەس بە مانای بەختیاری و شادی تەواو گەیشتووەو هیواداریین کە ڕێگای گەیشتن بەوەش بە ئێمە بڵێت. لەڕاستیدا ئەوەی کە دەمانەوێت، هەمان جۆر بەختەوەری، هەمان هێمنایی دەروونی و هەمان خۆشییە لەم دونیا شێتەی شێواوەدا، بەدوای کەسێکدا دەڕۆین کە بە ئێمە بڵێت چ بکەین؟ لەڕاستیدا ئەمە سروشتی ڕاستەقینەی زۆرێك لە ئێمەیەو ئێمە کردەوەکانمان بە پێی ئەم خۆڕسك و خواڕسکە دادەڕێژین. ئایا گەیشتن بە خوا، بەم بەرزترین بوونە، بەوەی کە نە لە چوارچێوەی وشەدا دەگونجێت و نە دەکرێ ناوێکی لێ بنێیت، لە ڕێگای دیسیپلین و پەیڕەوکردن لە سەرمەشقێکی تایبەت، مەیسەرە؟ ئێمە دەمانەوێت بە ئامانجێکی تایبەت و بە شوێنێکی تایبەت بگەین و خەیاڵ دەکەین کە لە ڕێگای مەشق، دیسیپلین و لە ڕێگای داپلۆسین یان خۆ بەدەستەوەدان، بەرزڕاگرتن یان جێنشینسازی بەوەی کە بەدوایدا دەگەڕێن، دەگەین. ڕاستی، مانای سەرەکیی دیسیپلین چییە؟ هۆی ئەوەی کە دیسیپلین بەڕێوە دەبەین، چییە؟ ئایا دیسیپلین و زیرەکی هاوتای یەکن؟ زۆربەی خەڵك هەستدەکەن کە دەبێت لە ڕێگای جۆرێك دیسیپلین، توانایی گیانەوەرانە ـ ئەم دزێویەی دەروونی خۆ ـ ڕام و کۆنترۆڵ بکەین. ئایا ئەم توانایی گیانەوەری و ئەم دزێویەی دەروون دەکرێ لە ڕێگای دیسیپلینەوە کۆنترۆڵ بکرێ؟ مەبەست لە دیسیپلین چییە؟ مەبەست زنجیرە کردەوەیەکە بەڵێنیی پاداش بدات، ئەو کردەوانەی کە ئەگەر تاقیب بکرێن، ئەوەی کە خوازیارین پێمان بدەن ـ چ ئەرێنی و چ نەرێنی ـ نموونەیەکی پراکتیکی تایبەت کە ئەگەر کۆششێکی شێلگیرانە هەبێت، پشوودرێژی و هەوڵدانێکی تایبەت هەبێت، سەرئەنجام ئێمە بەوەی کە دەمانەوێت بگەیەنێت. کارێکی وا لەوانەیە بە ئازار بێت، بەڵام ئێمە بۆ گەیشتن بە داخوازیی خۆمان ئامادەین لەگەڵی بجەنگین و بگونجێین، ئێمە دەمانەوێت خود ـ هەر ئەو خودەی کە هێرشبەر، دووڕوو، نیگەران و بەخۆفە و

هتد ـ بەڵێ، دەمانەوێت هەر ئەم خودەی کە هۆکاری قوای حەیوانی دەروونی ئێمەیە، بگۆڕین و رامی بکەین و لە نێوی ببەین. ئەم کارە چۆن دەبێت بکرێت؟ ئایا دەبێت ئەم کارە لە رێگای دیسیپلین، فامی زیرەکانە لە رابردووی "خود"و فامی زاتی "خود" لە چۆنیەتیی دروستبوون و ئیشێ لەم جۆرە، ئەنجامبدرێت؟ ئایا دەبێت لە نێوبردنی قوای حەیوانی دەروونی مرۆڤ لە رێگای زۆرەوە جێبەجێ بکرێت یان لە رێگای زیرەکییەوە؟ ئایا زیرەکی پەیوەندی بە دیسیپلینەوە هەیە؟ وەرن هەنووکە ئەوەی کە پاکان و باقیی خەڵك گوتوویانە لە بیر ببەینەوە، وەرن بچینە ناخی مەسەلەکەوەو توێژینەوەی لێ بکەین، بە جۆرێك وابزانن یەکەمجارە سەرنجی ئەم مەسەلە دەدەین. ئەوکات لەوانەیە بە شتێکی داهێنەر بگەین، نە تەنیا بە شتێ گوتراو کە هەموویان بێسەمەرن.

سەرەتا دبێژین کە لە دەروونی ئێمەدا ناسازگاری هەیە ـ رەش لە هەمبەر سپی، تەماح کاری لە هەمبەر بێتەماحیو شتانی لەم جۆرە ـ من تەماح کارم و ئەمە دوایین ئازارە، بۆ رزگاری لە چنگی ئەم بە تەماحبوونە دەبێت دیسیپلین بەڕێوە ببەم. بە دەربڕینێکیتر، من دەبێ لە هەمبەر هەر جۆرە ناسازگارییەك کە من ئێش و ئازار دەدات ـ لەم باسەدا چاوچنۆکی پێدەڵێم ـ راوەستم. ئەوکات لە ناچڤاکیبوون، بێرەوشیبوون و هتد، قسە دەکەم ـ یانی هەمان بەڵگەی مەزهەبی ـ کۆمەڵگایەك کە بۆ وەستان لە هەمبەر چاوچنۆکیدا کەڵکی لێ وەردەگرین، ئایا بە دوورکردنەوەی چاوچنۆکی بە یارمەتیی زۆر، چاوچنۆکی لەنێو دەچێت؟ سەرەتا وەرن شێوازی ئاسایی لە سەرکوت، زۆر، رەتکردنەوە و خۆڕاگریکردن بخەینە بەرباس و توێژینەوە. کاتێ ئەم ئیشە دەکەن، کاتێ لە هەمبەریدا رادەوەستن، چ روو دەدات؟ ئەوەی کە لە بەرامبەر چاوچنۆکیدا رادەوەستێت چییە؟ ئەمە یەکەم مەسەلەیە، وانیە؟ بۆچی ئێوە لە بەرامبەر چاوچنۆکیدا رادەوەستن و ئەم بوونەی کە دەڵێت: "من دەبێ لە چنگی چاوچنۆکی رزگار بم" کێیە یان ئەم بوونەی کە دەڵێت: "من دەبێت ئازاد بم" هەمان چاوچنۆکییە یان نا؟ تا ئێستا چاوچنۆکی پاداشتی داوەتەوە و ئێستا بەڵاگەیەنەرە، بۆیە دەڵێت: "دەبێت لە چنگی رزگار بم" پاڵنەری رزگاری لە چنگی ئەوەش بۆخۆی ناوی پرۆسەی چاوچنۆکییە. لەبەر ئەوە ئەو دەیهەوێت شتێ بێت کە نیە. بێتەماحی هەنووکە پڕ سەمەرە، بۆیە بە دوایدا دەڕۆم، بەڵام خودی پاڵنەری ئەم کارەو بڕیارەکەی دووبارە دەیهەوێت شتێ بێت، دەیەوێت بێتەماحی بێت کە بێگومان دووبارە، ناوی چاوچنۆکییەو دووبارە شێوەی نەرێنی پێداگری کردن لەسەر "من"ـە.



تێگەیشتنی ئێمە ئەمەیە کە چاوچنۆکی بوون، بەهۆی روونی جۆراوجۆری ئازارەوەیە. تا کاتێ کە پاداشتمان پێدەدات و تا کاتێ کە لەزەتی لێ دەبەین، گرفتێك نیە. کۆمەڵگا بە رێگای جۆراوجۆر ئێمە بۆ چاوچنۆکی هاندەدات. تا کاتێ کە بەکەڵکەو ئازارێکی لە تەکدا نیە، بەدوای دەکەوین. بەڵام هەرکە دەردو خەمی هێنا، دڵمان دەخوازێت لە بەرامبەریدا راوەستین. ئەم خۆڕاگرییە شتێکە کە پێی دەڵێین دیسیپلین لە بەرامبەر چاوچنۆکیدا. بەڵام ئایابە خۆڕاگری، بەرزنرخاندن و سەرکوت، لە دوای چاوچنۆکی رزگار دەبین؟ هەر کردەوەیەك لە لایەن "من"ەوە کە ئامانجی ئازادبوون لە چاوچنۆکی بێت، دووبارە ناوی چاوچنۆکییە. کەوابوو هەر کردەوە و وەڵامێك لە لایەن منەوە سەبارەت بە چاوچنۆکی، بێگومان بە رێگەچارەی گرفتەکە ناژمێردرێت.

بەر لە هەموو شتێ دەبێت زەینێکی ئارام هەبێت تا هەموو شتێ تێبگات، بەتایبەت شتێکە تاك نازانێت، زەینیشی ناتوانێت لەسەری قووڵ بیربیکاتەوە ـ شتێ کە توێژەری ئێمە ناوی خودای لەسەر دادەنێت. بۆ فامی هەر شتێ و هەر شێوەیەکی ئاڵۆسکاو ـ دەربارەی ژیان یان پەیوەندی و بە کورتی هەر مەسەلەیەك ـ دەبێت قووڵ بیرکردنەوەیەکی دیاریکراو و ئارام بۆ زەین هەبێت. ئایا ئەم قووڵ بیرکردنەوە لە رێگای خورتی و زۆرەوە مەیسەرە؟ زەینێك کە رووکەشیانە دەڕوانێت لەوانەیە لە رووی ناچارییەوە خۆی ئارام بکاتەوە، بەڵام بە دڵنیاییەوە هێمنایەکی وا، هێمنایی لەنێوچوون و مردنە. هێمنایەکی وا، توانایی یەکسان بوون، وەرچەرخان و حەساسیەتی نیە. کەوابوو خۆڕاگری رێگەچارە نیە. هەنووکە فامینی ئەم باسە پێویستی بە زیرەکی هەیە. فامینی ئەم باسەی کە خورتی و زۆر زەین خەرەفاو دەکات، بۆخۆی سەرەتای زیرەکییە. زانینی ئەم باسەیە کە دیسیپلین تەنیا جۆرێ سازگاری لە بەرامبەر سەرمەشقێکدا لە رێگای ترسەوەیەو هیچیترو ئەمە هەر ئەو شتەیە کە لە پەیڕەویکردن لە دیسیپلیندا هەیە، واتە ترس لە بەدەس نەهێنانی ئەوەی کە خوازیارین. کاتێ ئێوە زەین یان دەروونی خۆتان پەروەردە دەکەن، چ روو دەدات؟ دەبێت بە شتێکی سەخت، نەچەماوە، نایەکسان. ئایا لەگەڵ ئەو کەسانەی کە دیسیپلین بەڕێوە دەبەن، بەرەوڕوو نەبوونەتەوە، ئەڵبەت ئەگەر خەڵکانێکی وا هەبن؟ ئەنجامەکە بە دڵنیاییەوە شێوازێکی داڕووخانە. ناکۆکیی دەروونی دروستدەبێت کە تەریکیو شاراوەیی دەپارێزرێت، بەڵام هەیەو داگیرساوە. کەوابوو دەزانن کە ئەم جۆرە دیسیپلینە کە ناوی خۆڕاگرییە، تەنیاو تەنیا خوو عادەت پێکدێنێت و گومانێك نییە کە خۆ، داهێنەری زیرەکی نیە، نە خۆ وایەو نە مەشق. لەوانەیە کە ئێوە بە کەڵك وەرگرتن لە پەنجەکانتان بە مەشقی بەردەوام و رۆژانەی پیانۆ یان بە دروسکردنی

شتێکی دەستی، توانایی و کارامەیی پەیدا بکەن، بەڵام بۆ ڕێنوێنی کردنی دەستەکان، پێویستی بە هۆش و زەیرکییە و هەنووکە ئێمە لەم بارەوە تاقیب دەکەین.

کاتێك کەسێك دەبینن کە بە ڕاتان بەختەوەرە یان بە شتێ گەیشتوەو کارانێك دەکا، ئێوەش خوازیاری هەر ئەو شتانە دەبن و لەم بارەوە چاو لەو دەکەن. بەم گێڕاڤە، دەڵێین دیسیپلین. بۆ ئەوە چاو لێدەکەین کە ئەوەی کە ئەوی تر هەیەتی، بەدەستی بێنین. لاسایی ئەو دەکەینەوە بۆ ئەوەی کە بەختەوەر بین. لەبەر ئەوە خەیاڵ دەکەین کە ئەو هەیە، بەڵام ئایا دەکرێ لە ڕێگای دیسیپلینەوە بە بەختەوەری بگەیت؟ ئایا دەبێت بە کەڵك وەرگرتن لە یاسایەکی تایبەت، دیسیپلینێکی تایبەت و شێوازێکی پراکتیك بەڕاستی ئازاد ببێت؟ بە دڵنیاییەوە بۆ پەیداکردن دەبێت ئازادی هەبێت. ئەگەر دەتانەوێت شتێك پەیدا بکەن، دەبێت بەڕوونی، لە دەروونەوە ئازاد بن، بەڵام ئایا بە شێوەدانی زەینی خۆتان بە شێوازێکی تایبەت کە ناوی دیسیپلینی لەسەر دادەنێن، بەم ئازادییە دەگەن؟ گومانێك نییە کە وەڵام نەرێنییە. ئێوە دەبنە ماشینێکی دووبارەکراو و بە پێی دەرئەنجامی تایبەت و شێوازی کردەوەی تایبەت خەریکی خۆڕاگری دەبن. لە حاڵێکدا کە ئازادی لە ڕێگای پەروەردەکردنەوە بەدەست نایەت. ئازادی تەنیا لە ڕێگای زیرەکییەوە بەدەستدێت و هەر لەو چرکەیەدا کە ئێوە شایەتی دوورکردنەوەی ئازادی لە ڕێگای خورت و زۆرەوە ـ چ دەروونیو چ دەرەوەیی ـ بن، ئەم زیرەکییە و لە ئێوەدا رادەپەڕێت و ئێوە دەبنە خاوەنی. بێگومان یەکەم مەرجی پێویست، ئازادییە، ئازادی نە بە شێوەی دیسیپلین و شتێ کە بەخشەندەی ئەم ئازادییەیە، ناوی پارێزکارییە.

چاوچنۆکی، شێواوییە، تووڕەیی، شێواوییە، بێڕەحمی شێواویە. کاتێ تاك بەوانە بزانێت، بێگومان خۆی لە چنگیان رزگار دەکات و لە بەرامبەریاندا خۆڕاگری ناکات، بەڵکو تێدەگات کە مێدی تیشن تەنیا لە ئازادی دایەو هیچ چەشنە خورتیو زۆرێك ئازادی ناژمێردرێت، کەوابوو، مێدی تیشنێك روو نادات. کاری خۆپارێزی ئەوەیە کە بە ئێوە ئازادی دەدات. تاکی خۆنەپارێز تاکێکی شێواوە. چۆن دەکرێ لە کاتی شێواویدا بە کەشفێك بگەیت؟ بەڕاستی چ جۆر؟ بۆیە، خۆپارێزی بەرهەمی کۆتایی دیسیپلین نیە. بەڵام خۆپارێزی ئازادییەو ئازادی ناتوانێت لە ڕێگای کردەوەیەکەوە، کە خۆپارێزانە نەبوو، خۆی لە خۆیدا راستی نیە، بەدەست بێت. گرفتی ئێمە ئەمەیە کە زۆربەی ئێمە زۆر موتالامان کردووەو بە شێوەیەکی رواڵەتی بە شوێن دیسیپلینی بێژماردا- هەر بەیانی لە



کاتژمێرێکی دیاریکراودا لە خەو هەستان، بە شێوەیەکی گونجاو دانیشتن، کۆشش کردن بۆ کۆنترۆڵ کردنی زەینی خۆ بە شێوەیەکی تایبەت ـ رۆیشتووین و خەریکی مەشق و بارهێنانی بەردەوامی خۆمان بووین. لەبەر ئەوە بە ئێمەیان گوتووە کە ئەگەر شتانێکی وا ساڵانێکی زۆر درێژە پێبدەین، سەرئەنجام بە زاتی خواوەند دەگەین، لەوانەیە من ئەم مەسەلەیە بە شێوەیەکی بێئەزموون باسبکەم، بەڵام بنەمای بیرکردنەوەی ئێمە هەر ئەمەیە. گومانێك نییە کە گەیشتن بە زاتی خواوەند ئەوەندەش ئاسان نیە. خواوەند شتێك نییە کە بکرێ بیبەیتە بازاڕو ناتوانی بڵێیت من ئەم ئیشە دەکەم و ئێوە ئەوە بدەن بە من. کاریگەریی دەرەکی، دوکترینە مەزهەبییەکان، باوەڕو داخوازییەکانی دەروونی ئێمە بۆ گەیشتن و بەدەستهێنانی شتێ، زۆربەی ئێمەیان وەها راهێناوە کە بۆ ئێمە لە سەرەوە بیرکردنەوە لەم مەسەلە، بەبێ ئەوەی کە لەسەر بنەمای دیسیپلین بیر بکەینەوە، مەیسەر نیە. سەرەتا دەبێت ئاماژەکانی دیسیپلین و ئەمەی کە چۆن زەین لە ڕێگای ئارەزووکانمانەوە، کاریگەری و شتێ لەم جۆرەی خستووەتە ژێر سەختی و گوشارو زەینی ناچار بە کردەوەیەکی تایبەت کردووە کە بە ئاشکرا ببینین، زەین مەرجی کراوە، هەرچەندە ئەم مەرجیکرانە خۆپارێزانە بێت، ناتوانێت ئازاد بێت و سەرئەنجام ناتوانێت راستیش فام بکات. خواوەند، راستی یان هەرچی ناوی دەنێن ـ ناو جیاوازییەك نییە ـ تەنیا کاتێ کە ئازادی هەبێت، دەتوانێت بێتە ئاراوە و لە هەر کوێش کە ڕێگای ترس، زۆر، زۆرەکی زاڵبێت، چ ئەرێنیو چ نەرێنی، ئازادی نیە. هەروەها هەرکات بەدوای ئامانجێکەوە بین، لە ئازادی هەواڵێك نابێت، لەبەر ئەوە خۆمان لە چوارچێوەی ئەو ئامانجەدا دیل دەکەین، دوور نییە کە لە چنگی رابردوو رزگار بین، بەڵام داهاتوو ئێمە گەمارۆ دەدات و شتی واینە پێی ناڵێین ئازادی. پەیداکردنی هەرشت ـ ئایدیا، هەست یان فامی تازە ـ تەنیا لە سێبەری ئازادیدا مەیسەرە. هەرچەشنە دیسیپلینێك کە لەسەر بناغەی خورتیو زۆر بێت، ئەم جۆرە ئازادییە ـ چ سیاسیو چ مەزهەبی ـ حاشا لێدەکات و لەوێڕا کە دیسیپلین یانی سازگاری لەگەڵ کردەوەیەکدا کە ئامانجێکی هەیە، ئێمە دەخاتە تەنگانەوە، کەوابوو ئیمکانی ئازادیی زەین مەیسەر نابێت. کردەوەی زەینێکی وا، وەك پلاتی گرامافۆن، تەنیا لە ناو درزەکان دایە. بۆیە، زەین لە ڕێگای عادەت و پەروەردەکردنی سەرمەشقێکەوە تەنیا دەتوانێت ئەوەی کە بیری لێ کردووەتەوە بەدەست بێنێت. هەربۆیە، ئازاد نیە، هەربۆیە بەوەی کە بەربەست و چوارچێوەیەکی نیە، ناگات. ئاگاداربوون لە تەواوی پرۆسە

ـ ئەمەی بۆچی مرۆڤ هەمیشە خۆی لە بەرامبەر باوەڕی گشتیو پاکانی دیاریکراو، خۆی لەگەڵ دیسیپلین دەگونجێنێت و گشت مەسەلەی یەکسان بوون لەگەڵ بڕوا، چ باوەڕی پیاو چاکێ بێت و چ دراوسێ، پێکەوە جیاوازییان نییە ـ ئاگاداربوون لە تەواوی مەسەلەی سازگاری، لە ڕێگای مەشق و ڕێگای سەیرو سەمەرە ـ تەسلیمی خۆ بوون، حاشا، دەربڕینی بوون، سەرکوت، بەرزنرخاندن و ئەوەی کە ئاماژە بە سازگاری لەگەڵ سەرمەشقێکدا دەکات ـ تازە دەسپێکی ئازادییە کە بەرهەمەکەی ناوی خۆپارێزییە. گومانێك نییە کە خۆپارێزی، پەروەردەکردنی خەیاڵێکی تایبەت نیە، بۆ نموونە ئەگەر کەسێك بێتەماحی وەك ئامانج چاو لێبکات، ئیتر ناوی خۆپارێزی نابێت. بە دەربڕینێکی تر، ئەگەر کەسێ ئاگاداری بێتەماحی خۆی بێت، خۆپارێزو دژکام ناژمێردرێت، چونکە شتی وا لە ڕێگای دیسیپلینەوە بەرهەم دێت.

دیسیپلین، بەرامبەر بوون و مەشق، تەنیا لەسەر هەستی وەك شتێبوون، جەغد دەکات. زەین، بێتەماحی مەشق دەکات،، کەوابوو لە چنگی خودئاگاهی خۆی وەك بێتەماحی، ئازاد نیە، بۆیە لە ڕاستیدا بەبێ تەماح نیە. تەنیا کراسێکی دیکەی کردۆتە بەری و ناوی ناوە نەبوونی چاوچنۆکی. تەواوی ئەم پرۆسە لە پاڵ پێوەنان، خوازیاری ئامانج، یەکسانی لەگەڵ نموونەداو ئارەزووی هەبوونی ئاسایش لە ئاکامی کەوتنە دوای نموونەو سەرمەشق، کورت دەبێتەوە. تەواوی ئەمانە تەنیا جووڵانێکە لە زانراوەکانەوە بۆ زانراوەکان و بەردەوام هەر لە چوارچێوەی ڕێبازی خوددا، بەرتەسك کەرەوەی خودی زەینە. سەرنجدانی هەمووی ئەمانەو ئاگاداربوون لێی، سەرەتای زیرەکییە و زیرەکی نە خۆپارێزی هەیە و نەنا خۆپارێزی، زیرەکی لە نموونەی لەم جۆرەدا ناگونجێت. زیرەکی ئازادی پێکدێنێت کە نە هەوەس بازییەو نە نارێك و پێکی. بەبێ ئەم ئازادییە،خۆپارێزی مەیسەر نیە، پاکی، ئازادی دەدات و لەئازادیدا، ڕاستی سەرهەڵدەدات. ئەگەر ئێوە تەواوی ڕەوتەکە بە شێوەی یەکپارچە ببینن، تێدەگەن کە ناکۆکییەك نیە. هۆی ڕوونانی ئێمە لە دیسیپلین، حاشاو یەکسان کردنەکان ئەوەیە کە لە ناسازگاریدا دەژین و حەز دەکەین لێی دوور بکەوینەوە. کاتێ زاتی ڕێبازی ناکۆکی تێدەگەین، ئیتر شوێنێك بۆ دیسیپلین نامێنێتەوە، لەبەر ئەوە بە ڕێگەکانی ناتەبایی، چرکە بە چرکە شارەزاین. ئەم کارە پێویستیی بە هۆشیاریی زۆرو سەرنجی بەردەوام لە خودی خۆت هەیەو بەشی سەرسوڕهێنەر، ئەمەیە کە گەرچی لەوانەیە ئێوە لە تەواوی ئەو ماوەدا بێسەرنج



بووبێتن، بەڵام هەر ئەوەندە کە ئامانجێك ببێت، ڕەوتێکی تۆمارکەر لە دەروونی ئێوەداو لە هەموو کاتدا خەریکی سەفت و زەفت دەبێت.

حەساسییەت، حەساسییەتی دەروونی لە تەوای ماوەکەدا وێنە دەگرێت، جۆرێ کە هاوکات لەگەڵ ئارامی بوونی ئێوەدا، بوونی دەروونی وێنەکان نمایش دەدات.

کەوابوو باس لەسەر دیسیپلین نیە، حەساسیەت هەرگیز لە ڕێگای خورتی و زۆرەوە پێك نایەت. ئێوە لەوانەیە منداڵێك ناچار بە جێبەجێکردنی کارێك بکەن، ئەگەر لە گۆشەیەکدا زیندانی بکەن، لەوانەیە ئارام بگرێت، بەڵام لەوانەیە لە دەروونەوە بکوڵێت، لە پەنجەرەوە بۆ دەرەوە بڕوانێت و لە بیری ڕزگاریدا بێت. ئەمە هەر ئەو شتەیە کە ئێمە هێشتا خەریکی ئەنجام دانین. کەوابوو مەسەلەی دیسیپلین و ئەمەی کە کێ ڕێگای ڕاست دەڕوات و کێ ڕێگای ناڕاست، تەنیا بە خودی ئێمە چارەسەر دەبێت.

ئەمەش دەزانین کە ئێمە لە چوون بە ڕێگای هەڵەدا دەترسین، چونکە دڵمان دەخوازێت سەرکەوین. حەز بە پەروەردەکران لەسەر بنەمای ترسە، بەڵام نەزانراوەکان ناتوانن دیلی داوی دیسیپلین بن. بە پێچەوانەوە نەزانراوەکان دەبێت ئازادیان هەبێت، نە نموونەکانی زەینی تاك، هەر بەم هۆیە، هێمنایی زەین پێویستە. کاتێ زەین ئاگاداری هێمنایی خۆی بێت ئیتر هیمنایی نیە، کاتێ زەین لە بێتەماحیی خۆی، لە ڕزگاری لە چاوچنۆکیو تەماح ئاگادار بێت، خۆی لە پۆششی بێ تەماحیدا دووبارە دەناسێتەوە، بەڵام ئەمە ناوی هێمنایی نیە. هەر بەم هۆیەیە کە تاك دەبێت لەمەوبەدوا جگە لە مەسەلەکە ئاگاداری ئەمەش بێت کە کێ کۆنترۆڵ دەکات و چ شتێکیش کۆنترۆڵ دەبێت. ئەم دووانە ڕووداوی جیا لە یەك نین، بەڵکو ڕووداوێکی ئاوێتەن، ئەوەی کۆنترۆڵ دەکات و ئەوەی کۆنترۆڵ دەبێت، یەکێکن.

## ٦ـ دەربارەی تەنیایی

**پرسیار: تێگەیشتنی من ئەوەیە کە زۆر تەنیام، دەبێت چ بکەم؟**

**کریشنا مورتی:** پرسیاری ئێوە ئەوەیە کە دەتانەوێت بزانن بۆچی هەست بە تەنیایی دەکەن؟ ئایا دەزانن مانای تەنیایی چییە؟ ئایا لێی ئاگادارن؟ لەم بارەوە زۆر بەگومانم، لەبەر ئەوە ئێمە خۆمان لە چالاکییەکان، لە کتێبەکان، لە پەیوەندی و لە خەیاڵەکاندا کە بەڕاستی کۆسپی ئاگاداربوونی ئێمەن لە تەنیایی، خنکاندووە.

راستی، مەبەستی ئێمە لە تەنیایی چییە؟ تەنیایی جۆرێ هەستی خاڵیبوون، جۆرێ هەست بە نەبوونی هیچ شتێکی پەیوەندیدارو تایبەتی، لەڕادەبەدەر نادڵنیابوون و بێپشت و پەناو بێ شوێن و ڕێگەیە. نە دڵ ساردییەو نە بێهیوایی، بەڵکو جۆرێ هەستی بەتاڵبوون، جۆرێ هەستی بۆشایی و جۆرێ هەستی بێئاکامییە. دڵنیام کە هەمووومان ئەوەمان هەستکردووە، چ ئەوانەی خۆشحاڵن و چ ئەوانەی خراپ حاڵن، چ خەڵکانی زۆر زۆر چالاك و چ کەسانێ کە موعتادی زانستن. هەموو ئەمە دەناسن. تەنیایی، هەستی دەردێکی بەڕاستی بێکۆتاییە، ئازارێك کە هەرچەند هەوڵدەدەین دایپۆشین، ناکرێ بیشارینەوە.

وەرن دووبارە لە بەرامبەریدا بوەستین و بزانین کە چ شتێ ڕوو دەدات؟ بزانین کاتێ مرۆڤ هەست بە تەنیایی دەکات، دەیهەوێت چ ئیشێك ئەنجامبدات؟ مرۆڤ هەوڵی ئەوەیە کە لە ڕێگای کتێب، پەیڕەوی لە ڕێبەرێك، ڕۆیشتن بۆ سینەما، یان لە کاروباری کۆمەڵایەتیدا زۆر چالاك بوون، یان دەست بە دوعاو پاڕانەوەکردن، وێنەکێشان یان نووسینی شیعر دەربارەی تەنیایی، لە تەنیایی دوور بکەوێتەوە. ئەمە ئەو شتەیە کە بەڕاستی ڕوو دەدات. کاتێ مرۆڤ لە تەنیایی، ئازارەکەیولە ترسی بێکۆتایی و بێوێنەی ئاگادار دەبێت، بەدوای ڕێگەی دەربازبووندا دەگەڕێت، ئەم دەربازبوونە زۆر بایەخ پەیدا دەکات و لەم ڕووەوە چالاکییەکانی تاك، زانستی ئەو، ئەوەی کە خۆشەویستی ئەوەو ئەوەی کە هەیەتیو نیەتی، بایەخ پەیدا دەکات.

بایەخدان بە بایەخە ناسەرەکییەکان، مرۆڤ تووشی بەڵاو پەرێشانی دەکات، بایەخە ناسەرەکییەکان بە ناچار دەبنە بایەخە دونیایەکان و شارستانیەتێکی نوێ کە لەسەر ئەمانە دامەزراوە. ئەم ڕێگە دەربازبوونە لەبەر پێی ئێوەدا دادەنێت، چ لە ڕێگای پیشە، چ لە ڕێگای خێزان یان ناو، توێژینەوە، وێنەکێشان و هتد، تەواوی فەرهەنگی ئێمە لەسەر بناغەی ئەم دەربازبوونە پایەدارە. فەرهەنگمان لەسەر ئەو پایەدارەو ئەمە ڕاستییێکە.

ئایا هیچ کات تێکۆشاون تەنیا بن؟ کاتێ ئەم کارە دەستپێدەکەن، تازە تێدەگەن کە چەندە دژوارەو بۆ تەنیابوون چەندە مرۆڤ دەبێت زیرەك بێت، چونکە زەین ئیزنی تەنیابوون بە ئێمە نادات. زەین نائارام دەبێت، خۆی سەرقاڵی ڕێگەکانی دەربازبوون دەکات، کەوابوو ڕاستی ئێمە بە چ ئیشێکەوە سەرقاڵ دەبین؟ ئەرێ، تێدەکۆشین ئەم بۆشاییە لەڕادەبەدەرە، بە زانراوەکان پڕ بکەینەوە. تێدەگەین کە چ جۆر دەبێت چالاك و جڤاکی بین، تێدەگەین کە چۆن موتالا بکەین یان چۆن گوێ بۆ ڕادیۆ بگرین. بەم کارە خەریکی پڕکردنەوەی شتێ



دەبین کە لە ڕووی زانراوەکانمانەوە نایناسین. تێدەکۆشین ئەم بۆشاییە بە زانستی جۆراوجۆر، پەیوەندی یان شتانێك پڕ بکەینەوە. ئایا وا نیە؟ ڕێبازو ژیانی ئێمە هەر ئەمەیە. هەنووکە بزانین کاتێ کە دەزانن سەرقاڵی چ ئیشێکن، دووبارە خەیاڵ دەکەن کە بکرێت ئەو بۆشاییەی تەنیایی پڕ بکەنەوە؟ ئایا لەم ئیشەدا سەرکەوتنێکتان بەدەس هێناوە؟ دەڕۆن بۆ سینەماو سەرکەوتنێك بەدەست نایەت، ئەوکات پەنا دەبەنە بەر ڕێبەریی خۆتان یان کتێبەکانتان یان ڕوو دەنێن لە چالاکی زۆرو زۆر، ئایا بەڕاستی لە پڕکردنەوەی بۆشاییدا سەردەکەون یان تەنیا ڕوومەتی دادەپۆشن؟ ئەگەر تەنیا پەردەی بەسەردا دەکێشن، دووبارە بۆشایی هەیە و سەرئەنجام دێتەوە. ئەگەر بتوانن بە تەواوی دەرباز بن، ئەوکات دەرگای پەناگەیەك بەڕووی خۆتاندا بە بەستراوی دەبینن یان زۆر مەلوول دەبن. ئەمە هەر ئەو شتەیە کە خەریکە لە دونیا ڕوو دەدات.

ئایا دەکرێ ئەم کەلێنە، ئەم خاڵیبوونە پڕ بکرێتەوە؟ ئەگەر وەڵام نەرێنییە، ئایا دەکرێ لە چنگی دەرباز ببیت و هەڵێییت؟ ئەگەر یەکێ لە ڕێگاکانی دەربازبوونمان تاقیکردبێتەوەو بێسەمەر بووبێت، ئایا باقیی ڕێگەکانی دەربازبوون هەروا بێسەمەر نین؟ پڕکردنەوەی بۆشیایی بە هەر شتێ جیاوازێك نیە، کەوابوو، ئەوەش کە بە ناو تێفکرین دەڵێین، یەکێ لە ڕێگاکانی دەربازبوونە، گۆڕینی ڕێگای دەربازبوون جیاوازییەکی ئەوتۆ پێك نایەنێت.

کەواتە چ جۆر دەبێت بزانیت کە دەربارەی ئەم تەنیاییە دەبێت چ بکەیت؟ بەڵێ، تەنیا کاتێ دەزانن دەبێت چ بکەن کە بە تەواوی دەستتان لە دەربازبوون کێشابێت. کاتێ ئەم ئارەزووە لە ئێوەدا هەبێت کە لەگەڵ "ئەوەی هەیە" ڕوو بەڕوو ببنەوە ـ کە ماناکەی ئەمەیە کە ڕادیۆکە هەڵنەکەن و بە دەربڕینێك لە شارستانییەت ڕوو هەڵگێڕن ـ ئەوکاتە تەنیایی ئێوە کۆتایی پێدێت. چونکە لەو حاڵەدا تەنیایی بە تەواوی تووشی ئاڵوگۆڕ دەبێت، ئیتر ناوی تەنیایی نیە. ئەگەر ئێوە ئەوەی هەیە تێبگەن، ئەوەی هەیە ڕاستی پەیدا دەکات. لەوێڕا کە زەین بە شێوەی بەردەوام لە دیتنی ئەوەی هەیە ڕوو هەڵدەگێڕێت، هەڵدێت و سەرپێچی دەکات. کەوابوو بۆخۆی کۆسپ دروستدەکاو بە سەرنجدان بەوەی کە ئەو کۆسپانە ئێمە لە دیتن زۆر بێبەش دەکەن، لە فامی ئەوەی هەیە بێدەسەڵاتین و لەم ڕووەوە بەرەبەرە لە ڕاستی دوور دەکەوینەوە. هەمووی ئەم کۆسپانە زەین بۆ ئەوەی کە "ئەوەی هەیە" نەبینێت دروستیکردووە. دیتنی "ئەوەی هەیە" نە تەنیا بە توانایی زۆرو زانایی لە کردەوەدا پێویستی هەیە، بەڵکو پشت کردن لە هەموو دروستکراوەکانی دەستی مرۆڤ کە حەسابی

بانکی، ناوبانگی و ئەوەی کە شارستانیەتی ناوەو لە خۆی دەگرێت، لەو نموونانەیە. کاتێ "ئەوەی هەیە" ببینن، تێدەگەن کە چۆن تەنیایی گۆڕانی بەسەردا دێت.

## ٧ـ دەربارەی رەنج کێشان

**پرسیار: مانای خەم خواردن و رەنج کێشان چییە؟**

**کریشنا مورتی:** رەنج کێشان و خەم خواردن چ مانایەکی هەیە؟ ئازاری جەستەیی مانایەك زیاتری نیە، بەڵام وێدەچێت مەبەستی ئێمە ئێش و ئازاری رۆحییە کە لە ئاستی جیاوازدا مانای جیاوازی هەیە. مەبەست لە رەنج کێشان چییە؟ بۆچی حەز دەکەین مانای رەنج کێشان بزانین؟ کاتێ ئەم پرسیارە لە خۆ دەپرسن و دەڕۆن بەدوای هۆکاری رەنج کیشاندا، ئایا لە بیری دەربازبوون لەو نین؟ کاتێ ئێمە بەدوای مانای رەنج کێشانەوەین، ئایا لەو دووری ناکەین؟ ئایا ئەو لە سەرەوە ناکەینەوە؟ بەکورتی لێی دەرباز نابین؟ راستییەکەی ئەوەیە کە ئێمە خەفەت دەخۆین، بەڵام هەر کە زەین ناچار بە کارکردن لەسەری دەبێت، دەڵێین: "ئاخر بۆچی"؟ هەر بەم کارە لە زۆریی ئازارەکە کەم دەکەینەوە. بە دەربڕینێکیتر ئێمە خوازیاری ئەوەین کە ئازار سووك بێت، کەم بێتەوە، گۆشەگیر بێت و بە باسو وەسفکردن وەلاوە بنرێت. بێگومان ئەمە نابێتە هۆی فام کردنی ئازارو رەنج. لە حاڵێکدا ئەگەر لە حەزکردن بە دەربازبوون لە چنگی ئازار ئازاد بین، ئەوا هێدی هێدی تێدەگەین کە نێوەڕۆکی رەنج و ئازار چییە.

بە چ شتێ رەنج دبێژین؟ رەنج جۆرێ شێواوی لە ئاستی جۆراوجۆر دایە. ئاستی فیزیکی یان ئاستە جۆراوجۆرەکانی نەست. جۆرە شێواوییەکی توندە کە ئێمە حەزی لێ ناکەین. بۆ نموونە کاتێ کوڕەکەم دەمرێت کە هەموو هیواکانی من رووی لە ئەو بووە ـ یان کچ یان هاوسەر یان کەسانی لەم جۆرە ـ من هەموو ئەو شتانەی کە دەمویست ئەو کەسە بێت، کۆ کراوە لەودا دەمدی، ئەو خاوەنی من بوو و لەم جۆرە قسانە، بەڵام لە ناکاو تەواو دەبێت، کەوابوو شێواوی دروستدەبێت. بەم شێواوییە دبێژن رەنج.

ئەگەر من بەم بارودۆخە نەڵێم رەنج، ئەوا دەڵێم: "بۆچی رەنج دەبم"؟ "چەندە خۆشم دەویست"، "ئەو بەم جۆرە بوو"، "من ئەوەم هەبوو" هەوڵدەدەم لە وشەکان، لە مارکەکان و لە باوەڕەکان دەرباز بم، هەروا کە زۆربەی ئێمە ئەنجامیدەدەین. ئەم شتانە هەروەك ماددەی هۆشبەر ئیشدەکەن. ئەگەر ئەم کارە نەکەم، چی روو دەدات؟ لەو حاڵەدا، ساف و سادە لە رەنج



کێشانی خۆم ئاگادار دەبم، نە مەحکوومی دەکەم و نە بە رەوای دەزانم، تەنیا ئازار دەکێشم. ئەوکات دەتوانم بەدوای جوولانیدا بڕۆم. ئەوکات دەتوانم تەواوی نێوەرۆکی ماناکەی تاقیب بکەم، مەبەستم لە تاقیب کردن ئەوەیە کە بگەم بە فامی شتێك.

مانای رەنج کێشان چییە؟ بە چ شتێ دبێژین رەنج کێشان؟ ناڵێم بۆچی رەنج هەیە یان هۆکاری رەنج کێشان چییە؟ بەڵکو لەڕاستیدا چ شتێ خەریکە روو دەدات؟ ئەو کاتەیە کە بێ گرێ و گۆڵ لە رەنج کێشان ئاگادار دەبین، نە بە شێوەی بەشێك لە من، نە وەك شایەتێك کە چاودێری رەنج کێشانە، بەڵکو بە شێوەیەك کە رەنج، دەبێت بە بەشێك لە من، ئەوەی کە ئازار دەکێشێت، تەواوی بوونی منە. لەم رووەوە دەتوانم شوێن جوولانی بگرم و بزانم لە کوێدا کۆتایی دێت. بە دڵنیاییەوە کاتێ من خەریکی ئەم کارە دەبم، مەسەلە دەکرێتەوە، ئەو کاتە دەبینم کە لەسەر "خود" جەغدم کردووە، نە کەسێ کە خۆشم دەوێت و ئەو کەسە تەنیا نەخشی پەردەپۆشی بۆ بەڵاو تەنیایی من گێڕاوە. لەوەی ڕا کە خودی من شتێك نیم، هیوادار بووم کە ئەو ببێت. ئێستاکە ئەو چووە، بێکەس و تەنیا ماومەتەوە. بەبێ ئەو من هیچم، کەوابوو دەڵێم باس لەسەر ئەوە نییە کە ئەو چووە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە من ماومەتەوە. من تەنیام. گەیشتن بەم خاڵە دژوارە، بەڕاستی دژوارە کە مرۆڤ مەسەلەکە فام بکات بۆ ئەوەی کە تەنیا بڵێت: "من تەنیام، بە چ شێوەیەك دەتوانم لە چنگی ئەم تەنیاییە رزگار بم؟" کە خودی ئەمەش شێوەیەکیتر لە دەربازبوونە، بەڵکو بۆ ئاگاداربوون لەوە، لە گەڵیا مانەوە و چاودێرکردنی جوولانەکەیەتی. من ئەمە تەنیا وەك نموونە دەڵێم. کاتێ بەرەبەرە ئیزنی سەرهەڵدانی پێدەدەم، دەزانم کە ئازار دەکێشم، چونکە بێچارە بوومە، بە من دەڵێن کە سەرنجم بۆلای شتێکی تر وەرگێڕم، شتێ کە حەز ناکەم بۆی بڕوانم، شتێ کە بەسەر مندا سەپاوەو من نە حەز بە فامی دەکەم و نە بە دیتنی. خەڵکانێکی بێئەژمار لە دەربازبوونداا یارمەتیم دەدەن ـ هەزاران کەس بە ناو مەزهەبی، بە باوەڕو دوگمو هیواو گومانەکانیانەوە ـ بەڵێ، هەموو بە گوتنی "ئەمە ویستی خوایە، ویستی کارمایە" بۆ من رێگەی دەربازبوون پەیدا دەکەن. بەڵام ئەگەر من لە گەڵیا بمێنمەوە، لێی جیا نەبمەوەو هەوڵنەدەم بە دەوریدا هێڵێك بکێشم یان حاشای لێبکەم، ئەوجا چی روو دەدات؟ کاتێ من جوولانی رەنج تاقیب دەکەم، زەینی من چ بارودۆخێك پەیدا دەکات؟

ئایا رەنج کێشان تەنیا وشەیەکە یان راستییەك؟

ئەگەر راستییە، نە وشە، کەوابوو ئێستا وشەکەی بێمانایەو ئەوەی کە دەمێنێتەوە، هەست بە ئازارێکی قورسە، بەڵام لە چ پەیوەندییێکدا؟ لە پەیوەندی لە تەك وێنەیەك، ئەزموونێك یان پەیوەندی لە تەك شتێکدا کە هەتە یان نیتە. ئەگەر ئەوت هەیە، پێی دەڵێیت لەزەت، ئەگەر نیتە ناوی ئازاری لێ دەنێیت، کەوابوو ئازارو خەم لە پەیوەندی لە تەك شتێکدایە. ئایا ئەم شتە تەنیا قسەکردنێکە یان راستییەکە؟ بە دەربڕینێکیتر، کاتێ خەم هەیە بوونی لە پەیوەندی لەگەڵ شتێکدایە. بە تەنیایی ناتوانێت ببێت ـ تەنانەت بە شێوەی ترسیش ناتوانێت تەنیا بێت، بەڵکو هەمیشە لە پەیوەندی لەگەڵ شتێکدایە. وەك تاکێك، رووداوێك یان هەستێك. کەوابوو، لە بوونی رەنج بە تەواوی ئاگادار دەبن. ئایا ئەم رەنجە لە ئێوە جیایە، کەواتە ئێوە شایەتێکن کە رەنج وێنا دەکات یان ئەم رەنج کێشانە خودی ئێوە؟ کاتێ چاوەدێرێك نەبێت کە رەنج دەکێشێت؟ ئایا ئازار کێشان شتێکە کە لەگەڵ ئێوەدا جیاوازە؟ نا، ئێوەو ئازارکێشان یەکێکن. ئێوە لە ئیش جیا نین، ئێوە خۆتان ئێشن. لێرەدا مارك لێدان مانای نیە، ناونان و قەبووڵنەکردن بێمانایە، ئێوە خوای ئەو ئێشەو خوای ئەو هەستەن، واتا هەستی ئازار. ئێستا کەوایە چ روو دەدات؟ کاتێ ناوێکی لەسەر دانانێن، کاتێ لە پێوەندی لە گەڵیدا ترسێك نیە، لەگەڵ ناوەندیشدا پەیوەندی نیە، ئەگەر ناوەند لە گەڵیدا پەیوەندی هەبێت، کەواتە لێی دەترسێت. کەواتە دەبێت بیر لە کردەوە بکاتەوە، لەو بارەوە کارێك ئەنجامبدات، بەڵام ئەگەر ناوەند خودی ئازار بێت، چ دەکەن؟ هیچ، مەگەر جیا لەمەیە؟ ئەگەر ئێوە خودی رەنج بن و مارکێکیشی لێنەدەن، دووری نەکەنەوەو خودی ئەوە بن، چی روو دەدات؟ ئایا ئەو کاتەش دەڵێن من ئازار دەکێشم؟ نا، لەبەر ئەوە ئەو کاتە گۆڕانێکی بنچینەیی رووی داوە. لە بارودۆخێکی وادا، شتێ بە ناوی "من رەنج دەکێشم" نیە، چونکە ناوەندێك بۆ رەنج کێشان نییە و ناوەند لەمە رەنج دەبات کە ئێمە هەرگیز لێکۆڵینەوەمان لە چۆنیەتیی ئەوە نەکردووە. ئێمە تەنیا لە وشەیەکەوە بۆ وشەیەکیترو لە دژکردەوەیەکەوە بۆ دژکردەوەیەکی تر ژیان دەکەین. هەرگیز ناڵێین: "لێگەڕێ بزانم ئەوەی رەنج دەکێشێت چییە"؟ ئێمە لە رێگای سەپاندنی زۆرو دیسیپلینەوە نایبینین. دەبێت بە ئۆگری و فامی خێرا بۆی بڕوانین، ئەوکات دەیبینین شتێ کە ناوی رەنج کێشانی لەسەر دادەنێن، شتێ کە خۆمانی لێ لادەدەین و پەروەردەی



دەکەین و هەر هەموو شتێ پەراوێز دەکەون. تا کاتێ کە من لەگەڵ کاروباران و رووداوان وەك شتانی جیا لە خۆ، پەیوەندییەکەم نەبێت گرفتێکیشم نیە، هەر کە لە گەڵ شتەکانی دەوروبەرمدا پەیوەندیم دامەزراند، گرفتێکیش سەر هەڵدەدات. تا کاتێ کە لەگەڵ رەنجدا وەك شتێ لە دەرەوەی خۆم بەرەوڕوو ببمەوە، کاتێ لەبەر لەدەستدانی برا، لەبەر نەبوونی پارە، لەبەر ئەم یان ئەو ئازار دەکێشم. لە گەڵیدا پەیوەندی دەگرم و ئەم پەیوەندییە، پەیوەندییەکی دروستکراوە. بەڵام ئەگەر من خودی ئەوە بم، ئەگەر راستییەکە ببینم، ئەوا گشت مەسەلە دەگۆڕدرێت، بەگشتی مانایەکیتر پەیدا دەکات، ئەوکات تێڕامانی تەواو دروستدەبێت، ئاوڕدانەوەیەکی یەکپارچە پێکدێت و ئەوەی کە ئاوڕدانەوەی تەواوی لە سەر پێکدێت، چارەسەر دەبێت و لە نێو دەچێت و ئەوکات ئیتر ترسێك نابێت و بەو پێیەش وشەی "خەم" لە روخساری رۆژگار ون دەبێت.

## ٨ـ دەربارەی هۆشیاری

**پرسیار: جیاوازیی نێوان هۆشیاری و دەروونزانی چییە و چ کەسێ لە هۆشیاریدا هۆشیارە؟**

**کریشنا مورتی:** ئیزن بدەن سەرەتا دەربارەی دەروون روانی بکۆڵمەوە. مەبەستی ئێمە لە دەروون روانی یانی جوست و جو لە خوداو خۆ تاقیکردنەوە، بەڵام بۆچی تاك خۆی تاقی دەکاتەوە؟ بۆ ئەوەی کە باش ببێتەوە، بۆ ئەوەی کە بگۆڕدرێت، بۆ ئەوەی کە هاوتایی پەیدا بکات. دەروون روانی بۆ ئەوەیە کە تاك ببێت بە شتێ، ئەگەر وا نەبێت، ئیشی وا ناکات. ئەگەر خوازیاری گۆڕان، هاوتاییبوون بە شتێك جگە لەوەی کە هەن، نەبن، خۆتان تاقی ناکەنەوە. هۆکاری روونی دەروون روانی هەر ئەمەیە. من تووڕەم و روو لە دەروون رەوانیو توێژینەوەی خۆ دەنێم تا لە شەڕی هەڵچوون رزگار ببم یان ئەوەی کە بیگۆڕم یان هاوسەنگی بکەم. لە هەر کوێ دەروون روانی، واتە ئینتیما بۆ گۆڕان و هاوسەنگی وەڵامو دژکردەوەکانی تایبەت بە "خود" هەبێت، هەمیشە ئامانجێك لەبەرچاوە. کاتێ بەم ئامانجە نەگەین، تووشی بارودۆخی سۆزداری و خەمۆکی دەبین. لەم رووەوە دەروون روانی لە تەك خەمۆکیدا پەیوەندی هەیە. نازانم ئێوە لە کاتی دەروون روانی بە مەبەستی گۆڕاندنی خود بەوەتان زانیوە یان نا، بەڵام هەمیشە شەپۆلێك لە خەمۆکی لە بەرۆین دایە. ئەم شەپۆلە سۆزدارە بەردەوام بۆلای ئێوە دێت و ئێوە دەبێت لە دژی شەڕ بکەن، دەبێت سەرلەنوێ خۆتان بپشکنن تا بەسەر ئەم دۆخە سۆزدارییەدا زاڵبن. دەروون روانی پرۆسەیەکە کە

رزگاری لەودا ڕێگای نیە، لەبەر ئەوە شێوازی گۆڕانە، گۆڕان لەوەی هەیە بۆ ئەوەی نیە. لەم پرۆسەدا شتێ جیا لەمە روو نادات. لەم کارەدا هەمیشە شێوازێکی کۆکردنەوە هەیە. "من" خەریکی لێکۆڵینەوەی شتێکم بۆ گۆڕینی، کەوابوو بەردەوام لەگەڵ ناکۆکییەکی دووانەو بەو پێیەش لەگەڵ ڕەوتێك بێمرادیدا بەرەڕوویە، رزگاری هەرگیز نییە و فامی ئەم بێئاکامیە دەبێتە هۆی خەمۆکی.

وشیاریی شتێکی بە تەواوی جیاوازە، وشیاری، روانینی بێ مەحکووم کردنە. وشیاری پێکهێنەری تێگەیشتنە، چونکە لەودا نە مەحکوومیەتی هەیەو نە دیاریکردنی شۆناس، ئەوەی هەیە روانینی ئارامەو هیچیتر. ئەگەر کەسێك بیهەوێت شتێ تێبگات، دەبێت خەریکی روانین بێت، دەبێت دەست لە چاوەڕوانی هەڵگرێت، مەحکووم نەکات، نە دەبێت وەك لەزەت بڕوات بە دوایداو نە وەك شتێ کە لەودا لەزەتێك نیە، دووری لێبکات. تەنیا شتێ کە دەبێت ببێت چاوەدێری ئارام و لەسەرخۆی راستییە. ئاسۆی ئامانجێك دەرناکەوێت، ئەوە هەیە، ئاگاداربوون لەو رووداوانەن کە جاروبار سەرهەڵدەدەن، بەڵام کاتێ کە تاوان بارکردن، دیاریکردنی شوناس، یان پاساو هەبێت روانین و فامی ئەو روانینە رادەوەستێت، ئەوکات مەسەلە ئاوەژوو دەبێت و ئەوەی خۆی نیشاندەدات، ئاسۆی ئامانجێکە بۆ "خود"و "من" بە تەواوی تایبەتمەندی تاقیکاری، بیرەوەری، داخوازی و ئوگریەکانیەوە. لە دەروون روانیدا تاوان بارکردن و دیاریکردنی شوناس هەیە، لە وشیاریدا وا نیە، بۆیە لە وشیاریدا پێشکەوتنی خود مانای نیە، نێوان ئەمانە جیاوازی زۆر هەیە.

تاکێ کە دەیهەوێت خۆی پێش بخات، هەرگیز وشیار نابێت، لەبەر ئەوە پێشکەوتن ئاماژە بە تاوانبارکردن و گەیشتن بە ئەنجام دەکات. لە حاڵێکدا وشیاری بریتییە لە روانینی بێتاوانبارکردن، بێ حاشالێکردن یان قەبووڵکردن. ئەم وشیارییە لەگەڵ کاروبار و رووداوی دەرەکیو لەگەڵ ئاگاداربوون، لەگەڵ هەبوونی پەیوەندی لەگەڵ شتەکان و لەگەڵ هەستی بووندا دەستپێدەکات.

سەرەتا ئاگاداربوون لە شتەکانی دەوروبەرو هەستیاربوون بە شتەکان، سروشتە، ئەوجا بە خەڵك، یانێ هەبوونی پەیوەندی، دواتر ئاگاداری لە بیروبۆچوونەکان پەیدا دەبێت. ئەم ئاگادارییە کە بریتییە لە هەستیاربوون بەرامبەر بە رووداوان، سروشت، خەڵك و بۆچوونەکان، لە شێوازی جیاجیا پێك نەهاتووە، بەڵکو شێوازێکی یەکپارچەیە. چاودێری کردنی بەردەوامی هەموو رووداوەکان، هەموو بیرەکان، هەموو سۆزو کردەوەکانە، بە



ڕێکخستنێ کە لە دەروونی مرۆڤدا سەر هەڵدەدەن. لەوێڕا کە وشیاری تاوانبار ناکات، شتێ بەناو کۆکردنەوەی زانست نیە. مرۆڤ کاتێ تاوانبار دەکات کە پێوەرێکی هەبێت، بە دەربڕینێکی تر پاشەکەوتێکی هەبێت و بەم جۆرە بتوانێت خۆی بباتە پێشەوە. وشیاری یانێ فامی چالاکییەکانی "خود" یان "من" لە پەیوەندی لەگەڵ خەڵك، بیروبۆچوونەکان و وشەکاندا. کاتێ شتێ مەشق دەکەین دەبێتە رەوشت، بەڵام وشیاری رەوشت نیە. زەینێ کە خاوەنی عادەتە، حەساسیەتی هەیە، زەینێ کە لە ناو کەلەبەری کردەوەیەکی تایبەتدا دەجووڵێت، کۆلەو نەچەماوە، لە حاڵێکدا کە وشیاری خوازیاری چەماوەیی و هۆشیاری بەردەوامە. شتی وا دژوار نیە. کاتێ ئێوە بەڕاستی ئۆگری شتێکن، کاتێ ئۆگری پارێزگاری کردن لە منداڵتان، لە هاوسەرتان، لە گوڵەکان، لە درەختەکان و باڵندەکانتان بن، جگە لەمە ئیشێك ئەنجام نادەن. بێ ئەوەی کە تاوانبار بکەن و بێ دیاریکردنی شوناس خەریکی چاودێری دەبن. کەوابوو لەم چاوەدێریەدا پەیوەندی تەواوی هزرو سۆز پێکدێت و شتی وا تەنیا کاتێ دێتە ئاراوە کە ئێوە بە شێوەیەکی قووڵ بە شتێ ئۆگری نیشانبدەن.

کەوابوو نێوان وشیاری و دەروون روانی کە جۆرێ باش بوونەوەی خۆیە، جیاوازی زۆر هەیە. دەروون روانی بەبێ مرادی و ناکۆکیی زیاتر کۆتایی دێت، لە حاڵێکدا وشیاری، شێوازی رزگاری لە کردەوەی "خود"ە، بریتییە لە ئاگاداربوون لە جووڵان و بیرو کردەوەی رۆژانەی خۆو ئاگاداربوون لەویتر بۆ چاودێری کردنی. ئەم ئیشە کاتێ دەکرێت کە کەسێکمان خۆش بوێت، کاتێ بە شێوەیەکی قووڵ ئۆگری بە شتێك نیشانبدەین، کاتێ بمانەوێت خود، ـ تەواوی بوون و نێوەرۆکی خود، نە تەنیا یەك دوو چینێك لە خود ـ بناسین، لەو حاڵەدا بە ڕاشکاوی تاوانبارکردن نیە. لەو حاڵەدا دەبێت بۆ هەموو فیکرەکان، سۆز، دۆخی هەستیاری و سەرکوتەکان باوش بکەینەوەو لەوێڕا کە وشیاری چرکە بە چرکە زیاتر بەرین دەبێتەوە، رزگاری زیاتر لە چنگی تەڤگەری شاراوەی فیکرەکان، پاڵنەرەکان و ئۆگرییەکان دێتە دی. وشیاری واتا ئازادی، یانێ ئەوەی کە بەرهەم و مێوەکەی ئازادییە، لە بەرامبەردا دەروونی روانی، ناتەبایی پەروەریە و ڕەوتێکی بازنەییە، بۆیە لەودا، هەمیشە بێمرادی و ترس هەیە. ئێوە (پرسیارکەر) هاوکات دەتانەوێت بزانن کە چ کەسێ وشیارە؟ کاتێ ئێوە ئەزموونێکی هەمەلایەن و قووڵتان هەیە، چ روو دەدات؟ کاتێ ئێوە ئەزموونێکی واینەتان هەیە، لەوەی کە ئەزموونی دەکەن، ئاگادارن. کاتێ کە تووڕەن، هەر لە چرکەی تووڕەییدا، حەسوودی بردن یان لەزەت، دەزانن کە خوشحاڵن، تووڕەن و هتد. تەنیا کاتێ کە ئەزموون تەواو دەبێت، ئەوەی ئەزموون دەکات و

ئەوەی ئەزموون دەکرێت لێك جیا دەبنەوە. ئەوکات ئەو کەسە ئەزموون دەکات، ئەوەی کە ئەزموون دەکرێت دەخاتە ژێر چاودێری. لە چرکەی ئەزموونداندا نە چاودێرێك هەیەو نە ئەوەی کە لە ژێر چاودێری خراوە، تەنیا شتێ کە هەیە، پراکتیکی ئەزموونە. فرێ لە ئێمە تاقیکردنەوە ناکەین. هەمیشە لە دەرەوەی دۆخی تاقیکردنەوە داین، هەر بۆیە، ئەم پرسیارە هەیە کە چاودێر کێیە و ئەو کەسەی کە وشیارە کێیە؟ بێگومان پرسیاری وا هەڵەیە. هەر ئەو چرکەی کە تاقیکردنەوە دەسپێدەکات، نە کەسێکی وشیار هەیەو نە شتێ کە ئەو لێی ئاگادار بێت. نە چاودێرێك هەیەو نە لە ژێر چاودێری خراوێك، بەڵکو تەنیا دۆخی ئەزموون کردن هەیەو هیچیتر. بۆ زۆربەی ئێمە، ژیان کردن لە دۆخی ئەزمووندا لەڕادەبەدەر دژوارە، لەبەر ئەوە کارێکی وا پێویستی بە چەماوەییەکی بێوێنە، جۆرێ خێرایی لە کارداو حەساسیەت لە پلەی سەرەوەدا هەیە و هەرکات بەدوای ئاکام و خوازیاری سەرکەوتن بین، ئامانجێکمان لەبەر چاو بێت و روو لە حیسابگەری بنێین ـ تەواوی ئەوەی دەبێتە هۆی بێمرادی ـ حاشا لەم چەشنە ژیانە دەکات. کەسێکە خوازیاری هیچ شتێ نیە، لە تەقەلای گەیشتن بە ئامانجێکدا نیە. بەدوای دەرئەنجام و ئاماژە دەروونییەکانی ئەوەوە نیە، لە دۆخی ئەزموونی بەردەوام دایە. لەم رووەوە هەر شتێ بۆ ئەو تەڤگەرو مانایەکی هەیە، نە شتێ کۆنەیە، نە نیوە سووتاو و نە دووبارەکراو، لەبەر ئەوە "ئەوەی هەیە" هەرگیز کۆنە نیە. ئەم شەڕە بەردەوام تازەیە. تەنیا شتێ کە کۆنەیە، وەڵام بە شەڕە، ئەوەی کۆنەیە، پاش ماوەیەکی زیاتری بە شێوەی بیرەوەری یان چاودێر کە خۆی لەوەی دەیخاتە ژێر چاودێری، لە ئەزموون و بارودۆخ جیا دەزانێت، هەیە. ئێوە بۆ خۆتان دەتوانن بە شێوەیەکی سادەو سانایی ئەمە تاقیبکەنەوە. جارێکیتر کە تووڕە بوون یان حەسوودیتان برد یان خەریکی چاوچنۆکی و توندوتیژی بوون، ئاگاداری خۆتان بن. لە دۆخێکی وادا، "ئێوە" نین. تەنیا هەر ئەو بارودۆخە دەروونییە هەیە. لە هەمان چرکە یان لە هەمان چرکەی دواییدا کە ناوی لێ دەنێن، وشەیەکی بۆ هەڵدەبژێرن و ناوی دەنێن حەسوودی بردن، تووڕەیی و چاوچنۆکی. دەسبەجێ دەبنە هۆی پێکهاتنی چاودێرو چاودێریکراو، ئەوەی ئەزموون دەکات، ئەوەی ئەزموون دەکرێت. کاتێکە ئەوەی ئەزموون دەکات و ئەوەی ئەزموون دەکرێت هەبن، ئەوکات ئەوەی ئەزموون دەکات هەوڵدەدات ئەزموونەکە هاوسەنگ بکات، بیگۆڕێت، شتانێك دەربارەی بە بیر بێنێتەوە و کاروباری لەم جۆرەو بەم شێوە جیایی نێوان خۆی و ئەوەی ئەزموونی دەکات، بپارێزێت. ئەگەر ئێوە لەم هەستە ناوێك نەبەن ـ کە ماناکەی ئەمەیە تاقیبی دەرئەنجام ناکەن، تاوانبار ناکەن و بە ئارامی و هێمنی لەم هەستە



ئاگادارن ـ ئەوا دەیبینن کە لەو دۆخە سۆزدارەدا، لەو دۆخەی ئەزموون کردندا، نە چاودێرێك هەیەو چاودێریکراوێك، لەبەر ئەوە چاودێریکراو و چاوەدێر خۆلڤاوێکی ئاوێتەن و بەم شێوە ئەوەی هەیە تەنیا ئەزموون کردنەو هیچی تر.

کەوابوو دەروون روانی و وشیاری بە تەواوی لێك جیاوازن. دەروون روانی بەبێ مرادی و ناسازگاری زیاتر دەگات، لەبەر ئەوە ئارەزووی گۆڕان بە شێوەی دەروونی تێدا شاردراوەتەوەو گۆڕان جگە لە بەردەوامییەکی هاوسەنگ کراو نیە. وشیاری بارودۆخێکە کە لەودا تاوانبارکردن، پاساو یان دیاریکردنی شوناس جێگای نابێتەوە، کەواتە لێکدی حاڵی بوون هەیە. لەو دۆخە پاسیڤ و ئاگاداری هۆشیارانەدا نە ئەو کەسەی ئەزموون دەکات هەیەو نە ئەوەی کە ئەزموون دەکرێت.

دەروون روانی کە جۆرێ تەرەقی یان بەرین خوازی خودە، هیچکات بە راستی ناگات. لەبەر ئەوە بەردەوام ئەو شێوازە لە لایەن خودەوە سنووردار دەکرێت، لە بەراورددا، وشیاری دۆخێکە کە راستی لەودا بەرجەستە دەبێت، راستی ئەوەی هەیە، راستی سادەی ژیانی رۆژانە. تەنیا دوای پەیداکردنی راستی ژیانی رۆژانە دەتوانین دوور بڕۆین. بۆ دوور رۆیشتن دەبێت لە نزیکەوە دەستپێبکرێت، بەڵام زۆربەی ئێمە دەمانەوێت لە جێدا باز بدەین و بێ تێگەیشتن لەوەی کە نزیکە، لە دوورڕا دەس پێبکەین. کاتێ شارەزای نزیك بین، دەزانین کە لە نێوان نزیك و دووردا مەودایەك نیە. هیچ مەودایەك نیە. سەرەتاو بنەتا یەکێکە.

## ٩ـ دەربارەی پەیوەندی

**پرسیار: ئێوە بە زۆری دەربارەی پەیوەندی قسەتان کردووە، بەڕای ئێوە ماناکەی چییە؟**

**کریشنا مورتی:** سەرەتا شتێك بە ناو دوورەپەرێزی نیە، بوون واتا لەپێوەندیدا بوون، نەبوونی پەیوەندی واتا نەبوون. بەڵام مەبەستی ئێمە لە پەیوەندی چییە؟ کێشەیەکە پێکەوە بەستراوەو وەڵامێکە لە نێوان دوو کەسدا ـ نێوان ئێوەو من ـ کێشەیەکە کە لە لایەن ئێوەوە رادەگەیەنرێت و من یان قەبوولێدەکەم یان وەڵامی پێ دەدەمەوە، کێشەکە لە لایەن منەوە رادەگەیەنرێت. پەیوەندی تاکەکان کۆمەڵگا پێکدێنێت، کۆمەڵگا جیا لە ئێوەو من نیە، جەماوەری خەڵك بوونێکی جیاواز نین، بەڵکو ئێوەو من لە پەیوەندیماندا لەگەڵ یەکتر پێکهێنەری جەماوەر، گرووپ و کۆمەڵگاین. پەیوەندی ئاگاداربوون لە پەیوەندیی نێوان دوو کەسە، بەڵام ئەم پەیوەندییە بە زۆری لەسەر چ بنەمایەك پایەدارە؟ ئایا لەسەر بناغەی شتێکە بەناو پەیوەندی پێکەوەو یارمەتی دوولایەن

بەرامبەر پێ دەڵێین؟ بەڵێ لانیکەم ئەمەیە کە دبێژین یارمەتی بەرامبەرو قسانی لەم جۆرە. بەڵام بزانین جیا لەم قسەکردنانە و پێکهێنانی کۆسپی سۆزداری لە بەرامبەر یەکتردا. پەیوەندی لە سەر بنەمای چ شتێکە؟ ئایا لەسەر بنەمای قایل بوونی دوولایەن نییە؟ بۆچی، ئەگەرمن ئێوە رازی نەکەم، ئێوە لە شەڕی من خۆتان رزگار دەکەن، ئەگەر ئێوە رازی بکەم، ئێوە من وەك هاوسەر، دراوسێ یان دۆستی خۆتان قەبووڵ ناکەن. ئەمە راستییەکە.

بە چ شتێ دەڵێن خێزان، بێگومان بە جۆری پەیوەندی نزیك و دۆستانە و ئاڵوگۆڕکردنی هەست و بیر. لە بنەماڵەی خۆتاندا، لە پەیوەندی خۆ لەگەڵ هاوسەرتان ئایا پەیوەندییەکی بیری و هەستیاریتان هەیە؟ بێگومان مەبەستی ئێمە لە پەیوەندی یانی ئەمە. پەیوەندی واتا ئاڵوگۆڕی هەست و بیر بەبێ ترس و هاوڕێ لەگەڵ ئازادی لە فام کردنی یەکترو پێکهێنان پەیوەندی راستەوخۆ. بەڵێ، بێگومان مەبەست لە پەیوەندی هەر ئەمەیە، هەبوونی پەیوەندی فیکری و هەستیاری لەگەڵ ئەویتر. ئایا ئێوە لەگەڵ هاوسەرتان هەر بەم جۆرەن؟ لەوانەیە لە رووی فیکرییەوە ئەرێ، بەڵام بەمە ناڵێن پەیوەندی. ئەگەر وابێت ئێوەو هاوسەرتان لە دوو دیوی دیواری دوورە پەرێزدا دەژین. ئێوە خاوەنی ئۆگری و مەزن خوازی خۆتانن و ئەویش خاوەنی ئۆگری و مەزنخوازیی خۆی. ئێوە لە پشت دیواردا دەژین و جار نا جارێك لەسەر دیوارەکەوە سەرێك بۆ یەکتر دەکێشن، بەمە دەڵێن پەیوەندی، ئەمە راستییەکە، وانییە؟ لەوانەیە بەرینی بکەنەوە، هێدی بکەنەوە و بۆ وەسفکردنی ئەو کۆمەڵە، کەڵك لە وشەی نوێ بگرن، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە ئێوەو ئەویتر لە دوورەپەرێزیدا دەژین و ئەم ژیانەی گۆشەنشینی ناوە دەین پەیوەندی.

ئەگەر نێوان دوو کەس پەیوەندییەکی راستەقینە هەبێت، واتا نێوانیان پەیوەندی فیکری و هەستیاری ببێت، پەیوەندییەکی وا چەندە پڕمانا دەبێت. لەو حاڵەدا دوورەپەرێزی تەواو دەبێت و عەشق جێگای بەرپرسایەتی و ئەرك دەگرێت. ئەوانەی کە دەربارەی بەرپرسارییەتی و ئەرك قسە دەکەن، کەسانێکن کە خۆیان لە پشت دیوارەکانی دوورەپەرێزیدا دەشارنەوە. ئەو کەسەی کە حەز دەکات، قسە لە ئەرك ناکات، ئەوە عاشقە. لەم رووەوە خۆشی، خەم و پارەکەی لەگەڵ ئەوانیتردا باسدەکات. ئایا ئێوە لەم خێزانانەن؟ ئایا نێوان ئێوەو هاوسەرتان یان نێوان ئێوەو منداڵەکانتان ئەم پەیوەندییە بیری و سۆزدارییە، هەیە؟ بەڕاشکاوی، نا. لەبەر ئەم هۆیە کە بنەماڵە بیانوویەکە بۆ بەردەوامی ناو یان نەریتی ئێوە، شتێکە کە ئەوەی دەتانەوێت ـ جنسی یا رۆحی ـ لەبەر دەستیان دابنێت. بۆیە خێزان ئامرازێکە بۆ بەردەوامی "خود"، بۆ



درێژەپێدانی ناوی ئێوە. ئەمە خۆی جۆرێ لە نێونەچوویی و جۆرێ هەمیشەییە. بوونی خێزان بۆ رازی بوونیش هەیە. لە دونیای کارو کاسپیدا، لە دونیای سیاسی یان کۆمەڵایەتی لە دەرەوەی ماڵ، ئەوانی تر بە شێوەیەکی دڵڕەقانە دەچەوسێنینەوەو هەوڵدەدەین لە ماڵەوە بەخشەندەو میهرەبان بین، چ گاڵتەیە! یان ئەوەیە کە دونیامان بۆ تەحەمول ناکرێت، ئێمە خوازیاری هێمنایین، کەوابوو بۆ گەیشتن بە ئاسوودەیی، رێگای ماڵەوە دەگرینە بەر. لە دونیا ئازار دەکێشین و بۆ گەیشتن بە ئارامی، پەنا دەبەینە ماڵەوە، بۆیە لە پەیوەندی بۆ قایل بوون کەڵك وەردەگرین. بە دەربڕینێکیتر، ناخوازین پەیوەندیی ئێمە ئاسوودەیی تێکبدات.

بەم جۆرە، جێگایەك دەڕۆین بە دوای پەیوەندیدا کە رازیبوون و خۆشحاڵی دوو لایەن و بەرامبەرمان هەبێت، هەرکات بەم ئامانجە نەگەیشتین، پەیوەندیی خۆمان دەگۆڕین، یان یەکتر تەرك دەکەین یان لە پاڵ یەکدا دەمێنینەوە، بەڵام بۆ رازیبوونی خۆمان دەڕۆین بۆ شوێنێکیتر یان لە پەیوەندییەکەوە پەنا دەبەینە بەر پەیوەندییەکیتر تا سەرئەنجام ئەوەی کە تاقیبی دەکەین، پەیدای بکەین، واتا رازیبوون، واتا شادمانی و جۆرێ هەستی پشتیوانی و ئاسوودەیی. لە هەر حاڵدا، ئەمە هەر ئەو شتەیە کە لە دونیا پێی دەڵێین پەیوەندی و لەم رووەوە، رەگی لە راستی دایە. جێگایەك بەدوای پەیوەندیدا دەڕۆین کە ئاسایشی هەبێت و مرۆڤ وەك تاك بتوانێت لە دۆخێکی ئارام، لە دۆخێکی رازی، لە دۆخێکی تێکەڵ بە نەزانین ـ تەواوی ئەو دۆخانەی کە دەبنە هۆی ناسازگاری ـ ژیان بکات. ئەگەر ئێوە من رازی نەکەن و من بە دوای رازی بوونەوە بم، بێگومان ناکۆکی دروستدەبێت، چونکە هەردووی ئێمە بەدوای ئاسایش لە یەکتردا دەگەڕێین و کاتێ کە لەم ئاسایشە دڵنیا نەبین، حەسوودی و توندی دەنوێنین، دەبێتە لایەنگری مالکییەت و شتانی لەم جۆرە. کەواتە پەیوەندیی بەردەوام بە خاوەنداریەتی، تاونبارکردن، داخوازیی خۆ ویستانە بۆ ئاسایش، سازگاری و رازیبوون دەگات، بێگومان لەودا، نیشانەیەك لە عەشق نابینرێت.

ئێمە دەربارەی عەشق، بەرپرسایەتی و ئەرك قسە دەکەین، بەڵام لە راستیدا عەشقێکمان بەوان نیە، پەیوەندیی ئێمە لەسەر بنەمای رازیبوونەو شایەتی کاریگەرییەکانین لە شارستانییەتی نوێدا. شێوەی رەفتارێکە لەگەڵ هاوسەر، منداڵان، دراوسێکان و هاوڕێیان هەمانە، نیشانەی ئەوەیە کە لە پەیوەندیی ئێمەدا عەشق بە هیچ جۆر نیە، بەڵکو لە تاقیبی بەرامبەر دایە بۆ رازیبوون. ئێستاکە وایە، ئامانجی پەیوەندی و مانای کۆتایی ئەو چییە؟ ئەگەر ئێوە خۆتان لە پەیوەندی لەگەڵ ئەویتردا بخەنە ژێر چاودێری، تێدەگەن کە پەیوەندی

شێوازێکی پەیداکردنی خودە. ئەگەر من ئاگادار بم، ئەگەر من بە ئەندازەی پێویست هۆشیاریم هەبێت کە لە دژکردەوەی خۆم لە پەیوەندیدا ئاگادار ببم، پەیوەندی من لەگەڵ ئێوەدا، دۆخی دەروونیی من نیشاندەدات.

پەیوەندی بەڕاستی شێوازێکی پەیداکردنی خودە، شتێ کە ناوی رەوتی خۆ ناسییە، لەم رەوتەدا، مەسەلەی خراپ و کردەوەو بیرێك کە دەبنە هۆی نارەحەتی و شێواوی فراوانە، لەوێڕا کە بەوەی پەیدای دەکەین ئۆگرییەکمان نیەو لە پەیوەندیی خراپ دوور دەکەوینەوەو روو لە پەیوەندیی باش دەنێین، کەواتە، کاتێ کە ئێمە تەنیا بە دوای رازیکردنی بەرامبەرەوەین، پەیوەندی مانایەکی ئەوتۆی نیە، بەڵام کاتێ کە ئامرازێك بۆ پەیداکردنی خودو خۆناسی بێت، مانایەکی بێوێنە پەیدادەکات. بەڵام سەرەڕای ئەمە، لە عەشقدا، پەیوەندی مانای نیە، تەنیا کاتێ کە شتێکتان خۆش بوێت و چاوەڕێی پاداشت بن، پەیوەندی پێکدێت، بەڵام کاتێ عاشق بن واتا خۆتان بە تەواوی بسپێرن بە شتێ، ئیتر پەیوەندی بێمانایە.

ئەگەر بەڕاستی عاشق بن و ئەگەر عەشقێکی وا هەبێت، لەو شێوەدا، شتێ بێ وێنەیە. لە عەشقێکی وا، ناکۆکی نیە، شتێ بەناوی ئەم و ئەو نیە، یەکیەتیی تەواو و یەکپارچەییو بوونی تەواو بەڕاستی دەگات. ئەڵبەت، چرکە دەگمەنەکانی هاوڕێ لەگەڵ شاییو لەزەت کە لەو چرکانەدا ئەشق تەواوە و پەیوەندی هەستیاری و بیری بێ کەموکوریە، نابێ لەبەرچاوی نەگریت. ئەوەی بە زۆری روو دەدات ئەوەیە کە خودی عەشق شتێ نییە کە بایەخی هەبێت، بەڵکو مەسەلەی عەشق بایەخ پەیدا دەکات، یانێ شتێکە عەشق پێشکەشی دەکرێت. ئەوجا مەسەلەی عەشق، بەهۆی جۆراوجۆریی بیۆلۆژیەك، زارەکی یان بەهۆی حەز بە ئیجادی رەزامەندی، لەبەر ئاسایش و شتانی لەم جۆرە بایەخ پەیدا دەکات و عەشق دوور دەکەوێتەوە.

مالکییەت، بەخیلی و داخوازییەکان، ناتەبایی دروستدەکەن و دووبارە عەشق زیاتر دوور دەکەوێتەوەو هەرچەندەش عەشق زیاتر دوور بکەوێتەوە، مەسەلەی پەیوەندی زیاتر چەمك و ماناو بایەخی خۆی لەدەستدەدات. کەوابوو، تێگەیشتنی عەشق یەکێك لە دژوارترین کارەکانە. شتێك نییە کە لە رێگای بیرکردنەوەی پێویستەوە بەدەستبێت یان بە شێوەو ئامرازو یاسای جۆراوجۆر بەرهەم بێت. بەڵکو دۆخێکە لە دۆخەکانی دەروون کە لەودا چالاکییەکانی خود رادەوەستن، لە حاڵێکدا ئەگەر ئەوانە سەرکوت بکەین، لەوانە دووری بکەین، بیانخەینە ژێر دیسیپلین، راناوەستن. ئێمە دەبێت چالاکییەکانی زەین لە تەواو چینە جۆراوجۆرەکانی هەستی وشیاردا، تێبگەین. ئێمەش بەو چرکانە دەگەین کە



بەڕاستی عەشق دەنوێنن، ئەو چرکانەی کە فیکرو پاڵنەریان تێدا نیە. بەڵام چرکەی وا زۆر کەمن و لەبەر ئەو، ئەم چرکانە کەمن، لە زەمیردا ئاوێزانیان دەبین و بەم جۆرە نێوان واقعیەتی زیندوو چالاکی ژیانی رۆژانەی خۆمان کۆسپ دروستدەکەین.

بۆ تێگەیشتنی پەیوەندی دەبێت لە پلەی یەکەمدا بە "ئەوەی کە هەیە"، بەوەی بەڕاستی لە ژیانی ئێمەدا روو دەدات، بە تەواو و شێوەی سەیرو سەمەرە و جۆراوجۆریەوە شارەزا بین، هەروەها بزانین کە مانای راستەقینەی پەیوەندی چییە؟ پەیوەندی، پەیداکردنی خودە، لەوێڕا کە نامانەوێت خود بۆ خۆمان ئاشکرا بکەین، لە ئاسایشدا پەنا دەگرینو بەم جۆرە پەیوەندی قوولایی، چەمك و جوانیی بێوێنەی خۆی لەدەستدەدات. *

پەیوەندیی راستەقینە تەنیا کاتێ مەیسەرە کە عەشق هەبێت، بەڵام عەشق گەڕان بۆ رەزامەندی نیە، عەشق تەنیا لەو کاتەدا کە خود لە بیر دەچێتەوە ئامادە دەبێت، لە شوێنێکدا کە پەیوەندی تەواوی سۆزداری و فیکری ببێت، لە نێوان یەك یان دوو، بەڵکو پێکهێنانی پەیوەندی فیکری و سۆزداری لەگەڵ ئەوەی کە بەرزترینە و گەیشتن بەم پلە، تەنیا کاتێ دێتە دی کە خود لە بیر چووبێتەوە.

## ١٠ـ دەربارەی شەڕ

**پرسیار: چ جۆر دەکرێت ئاڵۆزیی سیاسی ئێستاو قەیرانی جیهانی چارەسەر بکرێت؟ ئایا شتێك هەیە کە بە ئەنجامدانی تاك بتوانێت هەڕەشەی شەڕێك کە زۆر نزیکە راوەستێنێت؟**

**کریشنا مورتی:** شەڕ، وێنەیەکی خوێناوی و جێی سەرنج لە ژیانی رۆژانەی ئێمەیە، شەڕ، شێوەی دەرەکی وەزع و حاڵی دەروونی ئێمەو شێوەی گەورەکراوی چالاکی رۆژانەی ئێمەیە. شەڕ سەرنجڕاکێشتر، خوێناویتر، روخێنەرتر لە کردەوەی تاك تاکی ئێمەیە، بەڵام ئەنجامی کۆی هەر ئەو کارانەیە. کەوابوو ئێوە و من بەرپرسیاری شەڕین. ئێستا بزانین بۆ راگرتنی چ ئیشێك لە دەستمان دێت. روونە کە ئێوە و من ناتوانین شەڕێ کە لەوانەیە روو بدات راگرین، لەبەر ئەوە شەڕێکی وا هەر ئێستا دەستی پێکردووە، بەڵێ، هەر ئێستا. گەرچی لە ئاستی دەروونیدا خەریکە روو دەدات و ئێستاکە دەستیپێکردووە، ناکرێت رایگریت، مەسەلەکانی جێی باس زۆر زۆر و زۆر گەورەن و هەر ئێستا لە ژێر لێکۆڵینەوەدان. بەڵام ئێوە و من کە دەیبینین ماڵ ئاگری گرتووە، هۆی ئاگرەکە دەزانین، دەتوانین لێی دوور بکەوینەوە و لە شوێنێکیتردا، بە کەرەستەی دی کە ئاگر نەگرێت و شەڕی دیکە ساز نەکات، ماڵێکی نوێ ساز بکەین. ئەمە تەنیا کارێکە کە دەتوانین ئەنجامی بدەین.

ئێوە و من دەزانین کە چ شتانێك خولقێنەری شەڕن، ئەگەر حەز بە راگرتنی شەڕ بکەین، لەو حاڵەدا، دەتوانین گۆڕانی خۆمان دەستپێبکەین کە هۆکارەکانی شەڕین.

لە میانەی شەڕدا، واتا یەك دوو ساڵ پێش، خاتوونێکی ئەمریکی هات بۆ دیتنم و گوتی کە کوڕەکەی لە ئیتالیا لە دەستداوە و کوڕێکی شازدە ساڵەی دیکەی هەیە کە دەیەوێت گیانی رزگار بکات. سەرئەنجام مەسەلەکەمان خستە بەرباس و وتوێژ. من گوتم بەو کە بۆ رزگاریی گیانی کوڕەکەی دەبێت دەست لە ئەمریکایی بوونی بکێشێت، نەکەوێتە داوی تەماح و چاوچنۆکی، بەدوای پاشەکەوت کردنی سەروەت و دەسەڵات و باڵادەستیدا نەبێت و لە رووی ئەخلاقییەوە سادە بێت، نە تەنیا لە جلوبەرگ و کاروباری دەرەوەیی، بەڵکو لە بیرو هەستیداو لە پەیوەندیشیدا سادەیی لە بیر نەکات. ئەو گوتی: "ئەمە ئەرکێکی گرانە، ئێوە چاوەڕوانی زیاد لە پێویست دەکەن. من ناتوانم ئەمانە ئەنجام بدەم، لەبەر ئەوە بارودۆخ ئەوەندە قورسە کە من ناتوانم بگۆڕدرێم." کەوابوو ئەو بەرپرسیاری لە دەسچوونی کوڕەکەی بوو.

ئێمە دەتوانین بارودۆخ کۆنترۆڵ بکەین، لەبەر ئەوە ئێمە خۆمان ئەوانەمان پێکهێناوە. کۆمەڵگا بەرهەمی پەیوەندی ئێوە و من پێکەوەیە. ئەگەر ئێمە پەیوەندییەکانمان بگۆڕین، کۆمەڵگا دەگۆڕدرێت. پشت بەستنی رووت بە یاسادانان و بە خورتی و زۆر، بە مەبەستی گۆڕانی کۆمەڵگای دەرەکی، لە حاڵێکدا لە دەروونەوە گەندەڵین، لە حاڵێکدا لە دەروونەوە خوازیاری دەسەڵات، پایە و باڵادەستین، خۆ بەخۆ موحیتی دەرەکی ـ هەرچەندەش بە دیقەت و لە رووی بنەمای زانستییەوە دروستکرابێت ـ وێراندەکات بەڵام چ شتێ ئەبێتە هۆی شەڕ؟ ئایا شەڕ هۆکاری مەزهەبیی هەیە یان سیاسی یان ئابووری؟ بێگومان باوەڕ هۆکاری شەڕە، چ ئەم باوەڕە بە ناسیۆنالیزم بێت، چ بە ئایدیۆلۆژیك یان بە دۆگمێکی تایبەت. ئەگەر باوەڕێك نەدەبوو و لە جیاتی، نیەتی خێر، عەشق و روو تێکردن لە نێوان خەڵکدا داوەر دەبوو، لەو حاڵەدا شەڕێك رووی نەدەدا، بەڵام باوەڕو بۆچوون و دوگم شتانێکن کە بە گەرووی ئێمەدا دەکەن، سەرئەنجام بەرهەمەکانیان ناڕەزاییە. قەیرانی هەنووکە، ماهییەتێکی دەگمەنی هەیەو ئێمە وەك بوونەوەرانی مرۆیی یان دەبێت لە کوێرە رێگای ناکۆکی بەردەوام و شەڕە یەك لەدوای یەکەکاندا هەنگاو بنێین کە ئاکامی کردەوەی رۆژانەی ئێمەیە، یان بە پێچەوانە دەبێت هۆکارەکانی شەڕ ببینین و پشتیان لێ بکەین.

بێگومان ئەوەی کە دەبێتە هۆی شەڕ، حەز لە دەسەڵات، پۆست، بایەخ و پارەیە، هەروەها ئەوەی کە ناوی نەخۆشیی ناسیۆنالیزم و پەرستنی ئاڵاو دۆگمەکانە. تەواوی ئەمانە



هۆکارەکانی شەڕن، ئەگەر ئێوە وەك تاکێك پەیوەندیتان بە وڵاتێکەوە هەیە، ئەگەر تینووی دەسەڵاتن، ئەگەر تووشی نەخۆشیی بەخیلی هاتوون، بێ هیچ گومان و دوو دڵییەك کۆمەڵگایەك پێکدێنن کە مەحکووم بە وێران بوونە. کەوابوو، دووبارە پەیوەندیی بە ئێوەوە هەیە، نە بە رێبەران، نە بەو کەسانەی کە بەناو ناویان سیاسەتمەدارە. پەیوەندی بە ئێوەو منەوە هەیە، بەڵام چمان ئێمە بە مەسەلەکە نازانین. ئەگەر رۆژێ رۆژگارێك ئێمە لە بەرپرسیاریەتیی کردەوەکانی خۆمان تێبگەین، بە چ خێراییەك ئەم شەڕانە و ئەم بەڵا پڕ لە سەرگەردانیانە کۆتاییان پێ دێت! بەڵام دەزانن کە ئێمە بێلایەنین. خۆراکی سێ جارمان هەیە، پیشەمان هەیە، ژمارەی بانکیمان کەم و زۆر تێدایە و دبێژین: "ئێوە بن و خوا وەزعمان تێکمەدەن، کارتان بە کارمانەوە نەبێت." هەرچی پۆستمان سەرتر بێت، خوازیاری ئاسایش، نەمری و ئارامی زیاترین و ئارەزووی زیاترمان لە تەنیاییە تاکارەکان بەو جۆرەی کە دڵمان دەخوازێت ئامادە بکەین، بەڵام ناکرێت ئامادەو رێكوپێك بکرێن، چونکە شتێ بۆ ئامادەکردن و رێكوپێك کردن نیە. هەموو شتێ لە حاڵی لە ناو چوون دایە. دڵمان ناخوازێت لەگەڵ ئەم کاروبارانە و لەگەڵ ئەو راستییەی کە ئێوەو من بەرپرسی شەڕەکانین، رووبەڕوو ببینەوە.

ئێوەو من لەوانەیە دەربارەی ئاشتی قسە بکەین، کۆنفرانس ساز بکەین، لە دەوری مێز دابنیشین و دەست بە باس بکەین. بەڵام لە دەروونەوەو لە رووی رۆحییەوە، خوازیاری پۆست و دەسەڵاتین و ئەوەی ئێمە هاندەدات، چاوچنۆکیو تەماحە. پیلان و فێڵ دەکەین، قسە لە ناسیۆنالیزم دەکەین، لە بەندو داوی دۆگم و باوەڕەکان داین، بۆ ئەوانە ئامادەین گیان بدەین و یەکتر لە ناو ببەین. ئایا بەڕای ئێوە کەسانێکی وا وەك ئێوەو من دەتوانین لەم دونیا بە ئاشتی و ئارامی بگەین؟ بۆ هەبوونی ئاشتی و ئارامی دەبێت ئارام بێت، لە ئاشتیدا ژیان کردن، واتا دوژمنایەتی دروس نەکردن. ئاشتی شتێکی ئیدەئال نییە بەڕای من ئیدەئال جۆرێ دەربازبوونە، جۆرێ دوورکردنە لەوەی هەیەو لەوەی دژیەتی. ئیدەئال ناهێڵێت ئێمە کاریگەریمان لەسەر "ئەوەی هەیە" ببێت. بۆ هەبوونی ئاشتی دەبێت عەشقت هەبێت، دەبێت بەرەبەرە دەست لە ژیانی تێکەڵ بە ئیدەئال بشۆیت و رووداوان بەو جۆرەی کە هەن ببینن، کاریگەرییان لەسەر دابنێن و بیان گۆڕن. تا کاتێ کە یەك یەکی ئێمە بەدوای ئاسایشی فیزیکی پێویستەوەین ـ خۆراك، پۆشاك و سەرپەنا ـ ئاسایشێکی دەروونیمان نابێت. ئێمە بەدوای جۆری ئاسایشەوەین کە بوونی دەرەکی نیەو ئەگەر بتوانین لە رێگای دەسەڵات و پۆست و ناوو ناوبانگەوە، واتا هەر ئەو شتانەی کە ئاسایشی فیزیکی لە نێو دەبەن، تاقیبی دەکەین. ئەگەر بۆی بڕوانن دەیبینن کە ئەمە راستییەکە.

بۆ ئەفراندنی ئاشتی لە دونیاو بۆ راگرتنی هەموو شەڕەکان، دەبێت شۆڕشێك لە هەموو تاکەکاندا ـ لە ئێوەداو من ـ پێکبێت. شۆڕشی ئابووری بەبێ بوونی ئەم شۆڕشە دەروونییەی ئێوەو من بێمانایە، لەبەر ئەوە برسیەتی ئاکامی بەرانبەرکردنی هەڵەی هەلومەرجی ئابوورییە کە وەزعی دەروونی ئێمە ئەنجامی داوە، واتا چاوچنۆکی، تەماح، خراپەخوازی و لایەنگری لە توانایی. بۆ کۆتاییهێنان بە خەم، برسیەتی، شەڕ دەبێت شۆڕشێکی رۆحی دروستبێت، کەمن ئەو کەسانەی کە بۆ ئەم کارە ئامادە بن. ئێمە دەربارەی ئاشتی قسە دەکەین، خەریکی دارشتن و را لە سەردانی یاسا دەبین، کۆڕو کۆبوونەوەی وەك رێکخراوی میللەتان و چیو چی پێك دێنین، بەڵام هەواڵێك لە ئاشتی نیە، لەبەر ئەوە ئامادە نین پۆست، پارە، دەسەڵات، بوونە خودان مڵك و ژیانی گەمژەیی خۆمان لە دەستبدەین. پشت بەستن بەوانیتر بە تەواوی بێسەمەرە، خەڵکانیتر ناتوانن ئێمە بە ئاشتی بگەیەنن، هیچ دۆست، رێبەر، سوپاو ولاتێك بەدوای دروستکردنی هەلومەرجی ئاشتییەوە نیە. ئەوەی داهێنەری ئاشتییە، گۆڕانی دەروونییە کە لە دەرەوە دەبێت بە کردەوە، گۆڕانی دەروونی، دوورەپەرێزی نیە، ئاڵوگۆڕی دەروونی، پاشەکشێ لە کردەوەی دەرەوەیە. بە پێچەوانە، تەنیا کاتێ پراکتیکی راست هەیە کە فیکری راست هەبێت و تا کاتێ کە خۆناسی نەبێت، فیکری راست بوونی نابێت. بە بێ خۆ تێگەیشتن ئاشتی مانای نیە.

بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕی دەرەوە دەبێت کاری کۆتایی هێنان بە شەڕ لە دەروونی خۆدا تەواو بکەن. هەندێك لە ئێوە بە نیشانەی باوەڕکردن سەرتان دەجوولێنن و دەڵێن: "رازیم"و لێرە دەچنە دەرەوە راست هەر ئەو کارەی دەکەن کە لە دە بیست ساڵی رابردوودا دەتان کرد. رازیبوونی ئێوە تەنیا زارەکییەو مانایەکی نیە، لەبەر ئەوە رێکەوتنی رواڵەتیی ئێوە بەڵاو شەڕەکانی دونیا راناگرێت. راوەستانی ئەوانە کاتێ روو دەدات کە ئێوە بە مەترسییەکی بزانن، بەرپرسیاریەتیی خۆتان فام بکەن و ئەو کاتەیە کە بیسپێرن بەویتر. ئەگەر ئێوە بەم بەڵایە بزانن، ئەگەر ئێوە لە پێویستی بەکردەوەیەکی خێرا ئاگادار بن و درەنگی تێدا نەکەن، ئەوا خۆتان دەگۆڕن. ئاشتی تەنیا کاتێ دێتە دی کە خودی ئێوە ئاشتیخواز بن، کاتێ کە خودی ئێوەو دراوسێکانتان لە ئاشتیو هێمناییدا بژین.



## ١١ـ دەربارەی ترس

**پرسیار: بە چ شێوەیەك من دەتوانم لە چنگی ترسێ کە لەسەر تەواو چالاکییەکانم کاریگەری دادەنێت، رزگار بم؟**

**کریشنا مورتی:** مەبەستی ئێوە لە ترس چییە؟ ترس لە چ شتێ؟ ترسی جۆراوجۆر هەیە، پێویست ناکات کە ئێمە هەمووی ئەو جۆرانە راڤە بکەین، بەڵام دەتوانین ببینین کە ترس کاتێ بوونی خۆی رادەگەیەنێت کە تێگەیشتنی ئێمە لە پەیوەندی تەواو نەبێت. پەیوەندی، تەنیا لە نێوان تاکەکاندا نیە، بەڵکو لە نێوان ئێمەو سروشت، نێوان ئێمەو شتەکان، نێوان ئێمەو ئایدیاکانمانیش پەیوەندی هەیە و تا کاتێ کە ئەم پەیوەندییە بە شێوەی تەواو فام نەکرێن، ترس هەر دەبێت. ترس شتێ نییە زەین دروستیبکات، بەڵکو لە پەیوەندی لەگەڵ شتێکدا دروستدەبێت. مەسەلەکە ئەمەیە کە چ جۆر لە چنگی ترس ئازاد بین؟ سەرەتا ئەوەی بەسەر ئێمەدا سەرکەوتوو دەبێت زۆر جارو زۆر جار بە سەریدا سەرکەوین. بەسەر هیچ گرفتێکدا ناکرێت بە شێوەی تەواو زاڵبیت. دەکرێت لێی شارەزا بیت، بەڵام ناکرێت بە سەریدا سەرکەویت. ئەم دووانە، دوو شێوازی بە تەواوی جیاوازن و شێوازی سەرکەوتن بە شێواوی و ترسی زیاتر دەگات. خۆڕاگریکردن، زاڵبوون، شەڕکردن لەگەڵ گرفتێکدا یان لە بەرامبەریدا کۆسپی بەرگری دروستکردن تەنیا ناسازگاری زیاتر دروستدەکات. لە حاڵێکد ئەگەر توانایی تێگەیشتنی ترسمان هەبێت و هەنگاو بە هەنگاو خەریکی گەڕان و توێژینەوەی تەواوی نێوەرۆکەکەی بین، ئیتر ترس بە هیچ شێوەیەك ناگەڕێتەوە. * هەروا کە وتم، ترس زەین دورستی ناکات، بەڵکو تەنیا لەپەیوەندیدا دروستدەبێت. راستی مەبەستی ئێمە لە ترس چییە؟ لە هەر حاڵدا ئێمە لە نەبوون و لە نەکران دەترسین، مەگەر جیا لەمەیە؟ ئێستاکە لە نەبوون، لە پێش نەکەوتن، یان لە نەناسراوەکان و لە مردن دەترسین، ئایا دەکرێت لە رێگای بڕیاردان، ئەنجامگیری و بە شێوەیەك هەڵبژاردن، بەسەر ترسدا سەرکەوێت؟ روونە کە نا. سەرکەوتن، مەزنخوازی یان لە جیاتی دانانی رووت خۆڕاگری زیاتر دروستدەکات. کەواتە، لە رێگای هیچ دیسیپلینێك و لە رێگای هیچ جۆرە خۆڕاگرییەك، ناکرێ بەسەر ترسدا سەرکەویت. ئەم راستییەی کە، هیچ جۆرە خۆڕاگری یان بەرگری بە کەڵکی سەرکەوتن بەسەر ترسدا نایەت و رزگاری لە ترس لە رێگای توێژینەوە یان پەیداکردنی وەڵام بۆی یان لە رێگای پاساودانی زارەکی یان خاوەن رایانەی رووت مەیسەر نیە، دەبێت بە روونی بیبینیت و هەستی بکەیت و تاقیبکەیتەوە.

هەنووکە بزانین لە چی دەترسین؟ ئایا ئێمە لەوەی هەیە دەترسین یان لەوەی فیکر دەکەین هەیە؟ مردن وەك نموونە بگرین. ئایا ئێمە لە راستیی مردن دەترسین یان لە خەیاڵی مردن؟ راستی شتێکە و خەیاڵ دەربارەی راستی شتێکیتر. ئایا من لە وشەی "مردن" دەترسم، یان لە خودی راستییەکە؟ لەبەر ئەوە من لە وشەو خەیاڵی مردن دەترسم، هەرگیز راستی فام ناکەم. هەرگیز بۆ راستی ناڕوانم و لەگەڵ راستیدا لە پەیوەندی راستەوخۆدا نیم. ترس کاتێ لە نێو دەچێت کە من لە تەك راستیدا لە پەیوەندی فیکری‌و هەستکردنی تەواودا بم. ئەگەر وا نەبێت، ترس هەیە و تا کاتێ کە من خاوەنی خەیاڵ، باوەڕو بیرۆکەیەك دەربارەی راستی بم، پەیوەندی بیری و هەستیاری نیە، کەواتە، دەبێت من مەسەلەکە بە شێوەی تەواو روون بکەمەوە کە ئایا من لە وشەو خەیاڵ دەترسم یان لە راستی؟ ئەگەر من لەگەڵ راستیدا بەرەوڕوو ببمەوە، بۆ تێگەیشتنی شتێ نامێنێتەوە، راستی حازرو زیندووەو من دەتوانم لە هەمبەریدا راوەستم. ئەگەر ترسی من لە وشە بێت، ئەوا دەبێت وشەکە تێبگەم‌و خەریکی توێژینەوەی رەوتی تەواوی مانای سەرەکیی وشەی ترس بم.

بۆ نموونە کەسێك لە تەنیایی، ئێش و ئازاری تەنیایی دەترسێت. بە دڵنیاییەوە، بوونی ترس لەبەر ئەوەیە کە ئەم کەسە هەرگیز بە شێوەی واقیعی بۆ تەنیایی نەیڕوانیوە، ئەو هەرگیز لە پەیوەندی تەواوی هەستیاری و بیریدا، تەنیا نەبووە. هەر لەو چرکەیدا کە تاك لە بەرامبەری راستی تەنیاییدا باوەش بکاتەوە، زات و ماهیەتەکەی تێدەگات، بەڵام وانیە. مرۆڤ سەبارەت بە تەنیایی خاوەنی بیروبۆچوون و باوەڕە، بیرۆکەو باوەڕێك کە لەسەر بنەمای زانستی رابردووی ئەوە، هەر ئەم ئایدەو باوەڕە، هەر ئەم زانستی رابردوو دەربارەی راستیەیە کە ترس دروستدەکات. ترس بە شێوەی ئاشکرا ئاکامی ناونان، دیاریکردنی ماناو وێنەی هێمایەك بۆ نیشاندانی راستییێکە، بە دەربڕینێکیتر ترس جیا لە وشە یان ماناکەی نیە.

من، بۆ نموونە سەبارەت بە تەنیایی کاردانەوەیەکم هەیە، بە دەربڕینێکی تر دەڵێم من لەوەی کە شتێ نەبم، دەترسم. ئایا من لە خودی راستی دەترسم یان ئەوەی کە ئەمە ترسە کە ئاگادار بووەو هۆکارەکەشی ئەمەیە کە من دەربارەی راستی خاوەنی زانستێکم لە رابردوودا، زانستێ کە وشەیە، زانستێ کە هێمایەو وێنە؟ چ جۆر دەبێت لە راستی بترسن؟

کاتێ من لەگەڵ راستیدا رووبەڕوو دەبم، کاتێ لە گەڵیدا لە پەیوەندیی راستەوخۆی فیکری هەستیاریدا دەبم، دەتوانم بۆی بڕوانم و بیخەمە ژێر چاودێری، کەواتوو شتێ بە ناوی ترس لەڕاستی نیە. ئەو شتەی دەبێتە هۆی ترس، خەیاڵی من دەربارەی راستییەو ئەمەی کە راستی وێدەچێت چ شتێك بێت یان چ ئیشێك ئەنجامبدات؟



ئەو شتەی ترس دەخوڵقێنێت، باوەڕ، خەیاڵ، ئەزموون و زانستی منە دەربارەی راستی. تا کاتێ کە سەبارەت بە راستی خەریکی قسەکردنین، ناوێکی بۆ دادەنێین و بەم جۆرە شوناسی دەناسین و تاوانباری دەکەین، تا کاتێ کە فیکر بریتییە لە داوەری دەربارەی راستی، وەك چاودێرێك، دەبێت ترس هەبێت. بیر بەرهەمی رابردووە، بوونی تەنیا لە رێگای قسەکردن، هێماو وێنەی زەینییەوە مەیسەرە، تا کاتێ کە بیرکردنەوە بریتییە لە خستنە ژێر سەرنج و ژێرو بان کردنی راستی، دەبێت ترس هەبێت. کەوابوو ئەمە زەینە دەبێتە هۆی ترس، زەینێ کە پرۆسەی بیرکردنەوەیە.

بیرکردنەوە یانێ دەربڕینی زارەکی. هیچ کەس بەبێ وشەکان، بەبێ هێماو بەبێ وینەی زەینی ناتوانێت بیر بکاتەوە. ئەم وێنە زەینییە کە بریتییە لە مشتێ دەمارگرژی، زانستی رابردوو و تێگەیشتنی زەین، دان دەبنەوە سەر راستی‌و ئاکامەکەی ترسە. رزگاری لە ترس تەنیا کاتێ مەیسەرە کە زەین بتوانێ بەبێ ژێرو بان کردن، بەبێ مارك لێدان و بەبێ ناو لێنان بۆ راستی بڕوانێت. ئەمە کارێکی دژوارە، چونکە سۆز، کاردانەوەو بێئاراماییەکانمان زۆر خێرا لە رێگای زەینەوە، شوناس یان دیاری دەکرێت بۆ ناو یان زاراوە دادەنرێت. هەستی بەخیلی لە رێگای هەر ئەم وشەوە شوناسی دیاریدەکرێت، بەڵام ئایا دەکرێت بەبێ دیاریکردنی شوناس هەستێك و بە بێ ناو لێنانی بۆی بڕوانێت؟ ئەوەی کە هێزو بەردەوامی دەدات بە هەست، ناو لێنانیەتی. هەرکە بە هەستێك کە ناوی ترسی دەنێن، ناوێکی لێ بنێن، وزەی پێدەدەن. بەڵام ئەگەر بتوانن بە بێ ناونانی ئەم هەستە بۆی بڕوانن، دەبیینن کە دەژاکێت و لە نێو دەچێت، کەواتە بۆ رزگاری تەواو لە چنگی ترس، تێگەیشتنی شێوازی گشتی ئەم رونانی زاراوە و ئەم "فرافکنی" هێمایانە، وێنەی زەینی و ناونانی راستی پێویستە. رزگاری لە چنگی ترس تەنیا لە رێگای خۆناسیەوە مەیسەرە. خۆناسی سەرەتای راستی و دروستییەو کۆتایی ترس.

## ١٢ـ دەربارەی دڵ ژێچوون و هۆگری

**پرسیار: من هۆگریم بە شتێك نیە، بەڵام زۆرێك لە خەڵك دڵخۆشن بە هۆگرییەکانیانەوە. من ناچار نیم ئیشبکەم، کەوابوو، نایکەم. ئایا دەبێت بەرپرسیاریەتی ئیشێکی بە کەڵك لە ئەستۆ بگرم؟**

**کریشنا مورتی:** مەبەستتان ئەوەیە کە ببنە خزمەتکارێکی کۆمەڵایەتی یان سیاسی یان مەزهەبی؟ لەبەر ئەوە هیچ کارێکتان نییە، کەوابوو، دەبنە ریفۆرمیست! ئەگەر کارێکتان نییە و دڵ ژێچوون، بۆچی کە نەبن؟ دەبێت بن! ئەگەر خەم و خەفەتتان هەیە دەبێت خەمین بن، بۆچی بەدوای رێگەی دەربازبووندا دەگەڕێن؟ دڵ ژێچوونی ئێوە مانایەکی گەورەی هەیە، ئەگەر

دەتوانن فامی بکەن لە گەڵێدا ژیان بکەن. ئەگەر بڵێین: "من دڵ ژێچووم کەواتە کارێکیتر دەکەم" تەنیا مەبەستتان ئەمەیە کە لە دڵ ژێچووی دوور بکەونەوەو لەوێڕا کە زۆربەی چالاکییەکانی ئێمە دەربازبوونە، ئێوە لە رووی کۆمەڵایەتیو لە لایەنەکانی دیکەوە زۆر زیانکارترن. کاتێ دەرباز دەبن، لەو کاتەوە کە ئەوەی هەن، هەن و بە دڵ ژێچووی بەسەر دەبەن و خراپەکارترن. دژوارىی کار ئەوەیە کە چ جۆر لەگەڵ دڵ ژێچوویدا بژین و لێی دوور نەبنەوە، لەوەیڕا کە زۆربەی چالاکییەکانی ئێمە جۆرێ شێوازی هەڵاتنە، بۆ مرۆڤ وەستان لە هەڵاتنداو رووبەڕوو بوونەوە لە گەڵێدا دژوارە. کەوابوو، من لەوەی کە ئێوە بەڕاستی دڵ ژێچوو بن، خۆشحاڵم و دەڵێم: "ستۆپ STOP!" وەرە لێرەدا بمێنینەوە، وەرە دانیشینە پای روانینی دڵ ژێچوویی، بۆچی ئێمە دەبێت کارێك ئەنجامبدەین؟"

ئەگەر دڵ ژێچوون، بۆچی؟ شتێ کە پێی دەڵێن دڵ ژێچوون چییە؟ بۆچی حەز لە هیچ کارێك ناکەن؟ بە دڵنیاییەوە هۆکارگەلێك هەن کە ئێوەیان مەلوول کردووە: رەنج، هەڵاتن، باوەڕ، چالاکیی بەردەوام، زەینی مەلوولو دڵی رەق کردووە. ئەگەر بتوانن هۆکاری بێمەیلیو ناڕەحەتیی پەیدا بکەن، ئەوا بە بێگومان گرفتەکە چارەسەر دەکەن، ئەوجا ئەم ئۆگریە بەخەبەر هاتووە کردەوە ئەنجامدەدات. ئەگەر بەهۆی دڵ ژێچووی خۆتان ئۆگریتان نەبێت، ناتوانن خۆتان بە زۆر ئۆگری چالاکییەك بکەن و خەریکی ئەنجامدانی کارێك بن، هەر بەو شێوەی کە سمۆرە لە قەفەزەکەیدا دەسووڕێتەوە. دەزانم کە زۆرێك لە ئیمە هەر ئەو کردەوەی سمۆرە ئەنجامدەدەین، بەڵام هەم بە شێوەی زاتی و خودی و هەم بە شێوەی رۆحی دەتوانین هۆکاری ئەم دڵ ژێچوونە تەواوە تێبگەین. دەتوانین تێبگەین کە بۆچی زۆرێك لە ئێمە لەم حاڵ و وەزعە داین، ئێمە خۆمان لە رووی سۆزداری و فیکرییەوە ماندوو و شەکەت کردووە، دەستمان داوەتە زۆر کار، ئەوەندە بەدوای تاقیکردنەوەی سەرگەرمییەکان، تاقیکردنەوەکان و شتی دونیایی بێژماردا رۆیشتووین کە ناڕەحەتیو ماندوویی بە سەرماندا زاڵبووە. بە گرووپێکەوە پەیوەست دەبین، هەرچی لە ئێمە دەخوازن ئەنجامی دەدەین، دواتر بەریان دەدەین. سەرئەنجام روو دەکەینە شتێکی تر و دەستدەکەین بە تاقیکردنەوەی. ئەگەر کارمان لەگەڵ دەروون ناسێکدا سەرکەوتنی تێدا نەبێت، روو دەنێین لەویتر یان دەچینە لای کەشیشێك، ئەگەر لەوێشدا سەرکەوتنێك نسیب نەبێت، سەر لە مامۆستایەکی دیکە دەدەین و هەتا کۆتایی، بەم جۆرە بێ ڕاوەستان دەڕۆین. ئەم شێوازی کێشان و بەردانە تاقەت پڕووکێنە، وانییە؟ وەك تەواوی شتە دونیاییەکان، زەین تووشی ئازارو ناڕەحەتی دەکات. ❊ ئێمە ئەم کارەمان کردووە، لە باسێکی



دونیایی بۆ باسێکی تر و لە حاڵو وەزعێکی بێئارامی بۆ حاڵو وەزعێکی بێئارامی دیکە رۆیشتووین تا بە خاڵێك بگەین کە بەڕاستی لە پێ بکەوین، ئێستا کە ئەمە تێدەگەن، پێشتر مەڕۆن. تۆزێ ئیسراحەت بکەن، ئارام بن، لێگەڕێن زەین بۆخۆی توانایی بگرێت، گوشار مەخەنە سەری، هەر بەو جۆرەی کە خاك لە زستاندا خۆی زیندوو دەکاتەوە، بەڵام دانی ئیزنێکی وا بە زەین و دوای هەموو ئەم قسانە ئارام هێشتنەوەی، کارێکی زۆر دژوارە. لەبەر ئەوە زەین هەمیشە دەخوازێت کارێك ئەنجامبدات. ئەگەر کار بگاتە ئەمەی کە ئیزن بە خۆتان بدەن هەر ئەو شتەی بن کە هەن، دڵ ژێچوو، دزێو، بەخۆف یان هەر شتێکی تر، ئەوا ئیمکانی بەرەوڕووبوونەوە لە گەڵ دڵ ژێچوونیدا هەیە.

کاتێ شتێك قەبووڵدەکەن، کاتێ ئەوەی هەن قەبووڵدەکەن، چ روو دەدات؟ کاتێ قایل دەبن کە هەر ئەوەن کە هەن، چ گرفتێك دەمێنێتەوە؟ گرفت زەمانێك هەیە کە شتێك بەو جۆرەی کە هەیە قەبووڵ نەکەین و بخوازین بیگۆڕین، ئەڵبەت مانای ئەم قسە ئەمە نییە کە من قەناعەتان فێردکەم، بە پێچەوانەوە. ئەگەر ئەوەی کە هەین قەبووڵبکەین، ئەوا دەبیینین کە ئەو شتانەی کە لێیان دەترسێین، ئەو شتانەی کە پێیان دەڵێین دڵ ژێچوون، ئەوەی کە ناوی دەنێین بێهیوایی و ئەوەی کە پێی دەڵێین ترس، هەر هەمووی تووشی گۆڕانی تەواو هاتووە. ئەو شتانەی کە دەبوونە هۆی ترسی ئێمە، بە تەواوی گۆڕاون. کەواتە، هەر بەو شێوەیە کە گوتوومە، تێگەیشتنی ئەم شێوازە، تێگەیشتنی شێوەکانی بیرکردنەوەی خودی ئێمە بایەخی زۆری هەیە. خۆناسی نە دەکرێت لەوانیترەوە بیگریت، نە لە کتێبەکان، نە لە رێگای دەربڕینی ئاشکراو راستەوخۆی مەبەست، نە لە رێگای دەروون ناسیو نە لە راڤەکارانی دەروونی. شتێکە کە خۆتان دەبێت پەیدای بکەن، چونکە ئەمە ژیانی ئێوەیە، بێ ئەوەی کە بە زانستی تایبەت بە "خود" بەرینایی و قووڵی ببەخشن، هەرچی دەخوازن ئەنجامی بدەن، هەموو بارودۆخ و کاریگەریەکانی دەروونی و دەرەوەیی بگۆڕن، ئەم زەویە هەرگیز میوەی بێهیواییو رەنج و خەم بەرهەم نایەنێت. بۆ ئەوەی کە لە چالاکییەکانی خود سنووردارکردنی زەین پێ ئەولاتر بنێن، دەبێت فامیان بکەیت و رێگای فام و تێگەیشتنی ئەوانە ئاگاداری لە کردەوە لە پەیوەندییەکان، پەیوەندی لەگەڵ شتەکان، خەڵك و ئایدییاکان دایە. لەم پەیوەندییانەدا کە وەك ئاوێنەیە، ئێمە کەم کەم خۆمان بەبێ هیچ پاساوو بەبێ هیچ تاوانبارکردنێك دەبینین و لە زانستی بەرینترو قووڵتری رێگەکانی زەینی خۆ دەرفەتی

پێشڕەوی زیاتر پێکدێت و بۆ زەین دەرفەتی ئارام بوون و وەرگرتنی ئەوەی کە ڕاستییە، ئامادە دەبێت.

## ١٣ـ دەربارەی ڕق

**پرسیار: بەوپەڕی ڕاست بێژییەوە دەبێت بڵێم کە من لە خەڵك بێزارم و هەندێ جار ڕقم لێیانە. ئەمە ژیانمی زۆر ناخۆش و بە ئازار کردووە. زیرەکی من بە من دەڵێت کە ڕق و بێزاریی تەواو دەروونمی گرتووە، گەرچی ناتوانم لەگەڵی بسازێم، دەکرێت ڕێنوێنیم بکەن؟**

**کریشنا مورتی:** مەبەستی ئێمە لە زیرەکی چییە؟ کاتێ دبێژین شتێ بە یارمەتی هۆشی خۆمان فام دەکەین مەبەستمان چییە؟ ئایا شتێك بەناو تێگەیشتنی زیرەکانە هەیە؟ یان ئەوەی کە زەین تەنیا وشەکان تێدەگات، لەبەر ئەوە ئەمە تەنیا ڕێگەی دامەزراندنی پەیوەندی لەگەڵ کەسانی ترە. ئایا ئێمە لە هەر حاڵێکدا دەتوانین شتێك بە شێوەی زارەکیو زەینی تێبگەین؟ ئەمە یەکەم شتە کە دەبێت لە بارەیەوە ڕوون بین، مەبەستم ئەوەیە کە بزانین ئایا تێگەیشتنی بەناو زیرەکانە کۆسپی ڕێگای تێگەیشتن نیە. گومانێك نییە کە فامینی شتێ یەکپارچە، دابەشنەکراو و بە شێوەی تەواوە. یان من شتێك تێدەگەم یان نا. ئەمەی کە بە خۆمان بڵێین: "من شتێك بە شێوەی زیرەکانە تێدەگەم"، بە دڵنیاییەوە ڕێگری ڕێگای تێگەیشتنە. شێوازێکی هەندەکی و کەوابوو بە هیچ شێوەیەك بە تێگەیشتن ناژمێردرێت.

هەنووکە مەسەلە ئەمەیە: "بە چ شێوەیەك من ـ منێ کە بێزارو ڕقاویم ـ دەتوانم لە چنگی ئەم گرفتە ڕزگار بم یان لە گەڵیدا سازگاری پەیدا بکەم"؟ بە چ شێوەیەك دەبێت لەگەڵ گرفتێکدا ڕێك بکەویت؟ گرفت یانی چی؟ بێگومان گرفت شتێکە کە مرۆڤ دەشێوێنێت. ڕقو بێزاری لە خەڵك دەبێتە هۆی ڕەنج و من لەمە ئاگادارم، چ بکەم؟ ئەمە هۆکارێکی زۆر بشێوێنەیە لە ژیانی مندا. دەبێت چ بکرێت؟ بەڕاستی بە چ شێوەیەك دەتوانم لە شەڕی ڕزگار بم؟ ئەڵبەت نە بە شێوەی کاتی وەلاوەی بنێم، بەڵکو بە شێوەیەکی بنەڕەتی لە چنگی ئازاد بم؟ دەبێت ئەم کارە بە چ شێوەیەك ئەنجامبدەم؟

بە سەرنجدان بەوەی کە وەزعێکی وا من ئازار دەدات، بۆ من بشێونەیە. ئەگەر بشێونە نەدەبوو، بۆ من گرفتێك نەبوو. بەڵام لەوەیڕا کە دەبێتە هۆی خەم و پەرێشانیو شڵەژان، لەوەیڕا کە من خەیاڵ دەکەم دزێوە، دەخوازم لە چنگی ئازاد بم. کەوابوو ئەوەی کە من لێی نارازیم پەرێشانییە. بەڵام لە کاتە جیاوازەکاندا، لە وەزع و حاڵی سۆزداری جۆراوجۆردا، ناوی



جۆراوجۆری لەسەر دادەنێم، ڕۆژێك ناوی شتێك دەنێم و ڕۆژێکی دی شتێکی دی، بەڵام حەزی دەروونی ئەوەیە کە پەرێشانییەك نەبێت. وانیە؟ کاتێ دەزانم لەزەت پەرێشانی دروستناکات، قەبوولێدەکەم. هیچ کاتێ نامەوێت لە دەستی لەزەت ڕزگار بم، چونکە لەودا پەرێشانی، لانیکەم ئێستا، نیە، بەڵام ڕق و بێزاری ئەو هۆکارانەن کە پەرێشانی زۆر لە ژیانی مندا دروستدەکەن و من دەمەوێت لە چنگیان ڕزگار بم. ❊ من حەز بە پەرێشان بوون ناکەم و هەوڵدەدەم ڕێگایەك بدۆزمەوە کە هەرگیز پەرێشان نەبم، بەڵام بۆچی نابێت پەرێشان بم؟

لەڕاستیدا بۆ ئەوەی کە تێبگەم دەبێت پەرێشان بم، وا نیە؟ بۆ تێگەیشتن دەبێت لە گۆڕان، شۆڕش و بێ ئارامییە گەورەکان تێپەڕێت. ئەگەر پەرێشان نەبین، لە خەودا دەمێنینەوە، ڕەنگە ئەمە ئەو شتەیە کە زۆرێك لە ئێمە خوازیارین، ئارام بوون، خەو لێکەوتن، هەڵاتن لە چنگی هەر جۆرە پەرێشانییەك بۆ گیرهێنانی گۆشەگیری و ئاسایش. لە حاڵێکدا ئەگەر بە پەرێشان بوون لەبەر ئەوەی کە خوازیاری زانینم بایەخێك نەدەم، ئەوا ڕەفتاری من بەرامبەر بە ڕق و بێزاری تووشی گۆڕان دەبێت، جیا لەمەیە؟ ئەگەر بایەخ بە پەرێشان بوون نەدەم، ئەوا ناو بۆ من بایەخێکی نابێت و وشەی "بێزاری" بایەخی خۆی لەدەس دەدات و بێزاری لە خەڵك بێمانا دەبێت، چونکە لەو شێوەدا من بە شێوەی ڕاستەوخۆ هەر ئەو وەزعەی کە ناوی بێزارییە، بەبێ ئەوەی کە ئەزموون بە شێوەی وشەکان دەربێنم، تاقیدەکەمەوە. ❊

تووڕەیی، هەروەك ڕق و بێزاری تایبەتمەندییەکە پەرێشانی زۆر دروستدەکات و چ زۆر کەمن ئەو کەسانەی کە بتوانن تووڕەیی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، بەبێ ئەوەی کە بیانکەن بە وشە، تاقیدەکەنەوە. لە حاڵێکدا ئەگەر نەیانکەین بە وشە، ئەگەر پێی نەڵێین تووڕەیی، ئەوا بە دڵنیاییەوە ئەزموونێکی جیاوازمان دەبێت، بەڵام لەبەر ئەوە وشەیان بۆ دیاری دەکەین، لە ئەزموونی نوێ کەمدەکەینەوە یان لە ئەزموونی کۆندا جێگایان دەکەینەوە، لە حاڵێکدا کە ئەگەر ناونانێك لە کارا نەبێت، ئەوا دەبێتە ئەزموونێك کە ڕاستەوخۆ فام بکرێت و هەر ئەم تێگەیشتنە دەبێتە هۆی گۆڕان لەو ئەزموونەدا. ❊

بەخیلی بە نموونە بگرین، زۆرێك لە ئێمە بەخیلین و لێی ئاگادار نین، بەخیلی دەربارەی پارە، دەربارەی بەخشینی خەڵك، لە مەبەستم تێدەگەن، هەمووی ئێمە ئەم تایبەتمەندییە دەناسین. کەوابوو، بە چ شێوەیەك لە چنگی دەرباز بین؟ ئەڵبەت مەبەست ئەوە نییە کە چ جۆر ببینە بەخشندە، نا، مەبەست ئەمە نیە. ڕاستە کە ڕزگاری لە بەخیلی، واتا دڵاوایی، بەڵام

پێویست نییە کە تاك دڵاوا بێت. بێگومان، هەرکەس دەبێت لێی ئاگادار بێت. لەوانەیە کە ئێوە لە بەخشینی یارمەتیی ماڵی زۆر بە کۆمەڵگاو دۆستانی خۆ دەست و دڵ ئاوالا بن، بەڵام سەبارەت بە بەخشینی زیاتر لەوە دەست قووچاو بن.

هەر ئەمەشیان بوو دەیانژماردو مرۆڤ لێی ئاگادار نیە. ئێستا ئەگەر کەسێك ئاگادار بوو، چی روو دەدات؟ ئیرادەی خۆی وەگەڕ دەخات تا دڵاوا بێت، هەوڵدەدات بەسەر بەخیلی خۆیدا زاڵبێت و خۆی پەروەردە بکات و زۆر کاری دیکە. بەڵام، کەڵك وەرگرتنی خورتیو زۆرەکی لە ئیرادە بۆ شتێ بوون دووبارە بەشێکە لە بازنەیەکی گەورەی بەخیلی. کەواتە، ئەگەر هیچ کام لەم کارانە ئەنجامنەدەین، بەڵام تەنیا لە ئاماژەی دەروونی بەخیلی ئاگادار بین بەبێ ئەوەی کە ناوێکی بۆ دیاریبکەین، ئەوجا دەبیبنین کە گۆڕانێکی بنچینەیی پێکدێت. تکایە ئەمە تاقی بکەنەوە. تاك سەرەتا دەبێت بشێویەت و روونە کە هیچ کام لە ئێمە حەز لە ئاڵۆزەکان ناکەین. هەستدەکەین کە نموونەیەکمان ـ مورشیدی، باوەڕی یان هەرچی کە ناوی هەیە ـ بۆ ژیانی خۆ هەیەو لەو سەرمەشقەدا جێ خۆش دەکەین ـ ئەم کارە وەك هەبوونی پیشەیەکی ئیداری باشە ـو باقیی تەمەنمان لەودا خەریکی کردەوە دەبین. هەر بەو شێوە بیرکردنەوە، دەکەوینە داوی تایبەتمەندییەکیتر کە دەمانەوێت لە چنگیان رزگار بین. ئێمە لە بایەخی پەرێشانی، نەبوونی ئاسایشی دەروونیو بەستراوەنەبوون ئاگادار نین. بێگومان مێدیتەیشن و تێگەیشتن و چاودێری کردن لە نەبوونی ئاسایشدا بەرهەم دێت. ئێمە دەمانەوێت وەك کەسێك بین کە پارەی زۆری هەیە و لە خۆشی و رەحەتی دایە. کەسێکی وا پەرێشانی خۆش ناوێت و هەرگیز حەزیش لە پەرێشانی ناکات. *

پەرێشانی بۆ تێگەیشتن پێویستەو هەر کۆششێك بۆ بەدەستهێنانی ئاسایش، رێگری رێگای تێگەیشتنە. کاتێ دەمانەوێت لە چنگی شتێ کە پەرێشانمان دەکات ئازاد بین، بە بێگومان کۆسپی رێگای ئێمەیە. ئەگەر بتوانین بە شێوەی راستەوخۆ هەستێك تاقیبکەینەوە بەبێ ئەوەی کە ناوێکی لەسەر دانێین، هەستدەکەم زۆر شت بە نسیومان دەبێت، ئەوا ئیتر لە گەڵیدا شەڕ ناکەین، چونکە ئەوەی ئەزموون دەکات و ئەوەی ئەزموون دەبێت، یەکێکەو ئەمە بنەماو بنچینەی کارە. تا کاتێ ئەو کەسەی کە ئەزموون دەکات، هەستی، واتە ئەزموونەکە بکات بە وشە، خۆی لە ئەزموون جیا کردووەتەوە و کاریگەری لەسەر دادەنێت، ئەم شێوە پراکتیکە، کردەوەیەکی دەستکردو گوماناوییە، بەڵام کاتێ قسەی زۆر کردن لە ئارادا نەبێت،



ئەوا تاقیکراو و تاقی دەبنە یەك. ئەم یەکپارچەییە پێویستە و دەبێت بە شێوەیەکی بنچینەیی لەگەڵی بجوولێینەوە.

## ١٤ـ دەربارەی بەدگۆیی

**پرسیار: بەدگۆیی بایەخی ئەوەی هەیە بکەوێتە روو، بەتایبەت سەبارەت بە ناساندنی ئەوانیتر بە ئێمە. راستی، بۆچی لە بەدگۆیی وەك ئامرازێك بۆ خستنەڕووی ئەوەی کە هەیەو کەڵك وەرنەگرین؟ لەوێڕا کە بەدگویی سالانێکە مەحکووم دەکرێت، من لە بیستنی وشەی بەدگۆیی ترسێکم نیە.**

**کریشنا مورتی:** من نازانم بۆچی بەدگویی دەکەین؟ بەدگویی لەبەر ناساندنی ئەوانیتر بە ئێمە نیە. راستی بۆچی ئێمە دەبێت کەسانیتر بناسین؟ بۆچی ئێمە ئەو هەمووە لە داوو بەندی وەزعی ئەوانیتر داین؟ سەرەتا بۆچی بەدگویی دەکەین؟ ئایا ئەمە جۆرێ بێئارامی نیە؟ بۆچی، بەدگوییش وەك نیگەرانی نیشانەی زەینێکی بێئارامە. بۆچی ئێمە حەز دەکەین دەست لە کاری ئەوان وەربدەین و بزانین کە ئەوانیتر چ دەکەن و چ دبێژن؟ بەڕای من ئەو کەسەی کە بەدگویی دەکات، زەینێکی رواڵەتی هەیە، زەینێکی لێکۆڵەر کە کەوتووەتە سەر رێگای هەڵە. پرسکەری عەزیزی ئێمە هەستدەکات کە ناساندنی خەڵکان بەو لەبەر ئەوەیە کە ئەو بۆ ئەو کەسانە ــ بۆ بیروباوەڕو کردەوەیان ـ بایەخ دادەنێت، بەڵام ئایا تا کاتێ کە ئێمە خۆمان نەناسین دەتوانین ئەوانیتر بناسین. ئەگەر ئێمە شێوازی بیرکردنەوە، کارکردن و رەفتاری خۆمان نەزانین، ئایا دەتوانین سەبارەت بەوانی تر داوەری بکەین؟ ئایا زانین دەربارەی شێوازی بیرکردنەوە، هەستکردن و بەدگویی لەوانیتر بەڕاستی ئینتیمایەك بۆ هەڵاتن نیە؟ ئایا ئەم کارە، رێگا دەربازبوونێك لە خۆ نیە؟ ئایا ئەم کارە لەگەڵ هەوەسی دەستێوەردان لە کاروباری ئەوانی تردا هاوڕێ نیە؟ ئایا ئەو دەرفەتە هەیە کە دەربارەی ئەوانی تر بەم شێوە بەدگویانە، زاڵمانە و دزێو بیر بکەینەوە، بۆچی ئەم کارە دەکەین؟ دەزانن، هەمووان ئەم کارە دەکەن. لە کردەوەدا، هەرکەس دەربارەی کەسێکیتر بەدگۆیی دەکات، بۆچی؟ سەرەتا هەستدەکەم کە هۆکاری بەدگویی ئێمە لەوانیتر ئەمە بێت کە ئێمە ئۆگرییەکی ئەوتۆمان بە شێوازی بیرکردنەوەو کردەوەی خۆمان نیە. دەخوازین بزانین ئەوانی تر چ دەکەن تا بەشکو بە دەربڕینێکی دڵسۆزانە لاساییان بکەینەوە. بە زۆری کاتێ بەدگویی دەکەین، بۆ تاوانبارکردنی ئەوانیتر. بەڵام ئەگەر لێکۆڵینەوەی تەواو لەگەڵ خێرخوازی دابێت، لەوانەیە بکرێت بڵێیت کە ئەم کارە لەبەر لاسایی لەوانیتر ئەنجامدەبێت. بەڵام هۆکاری ئینتیما بە گێڕاڤ لەوانیتر چییە؟ ئایا ئەمە

نیشانەی ڕواڵەتیبوونی لەڕادەبەدەری خودی ئێمە نیە؟ زەینێکە بە دوای بێ ئارامییەوەیە، ئەو زەینەیە کە تووشی نارەحەتییەکی توندەو بۆ گەیشتن بەم بێئارامییە لە خۆی دەچێتە دەرەوە. بە دەربڕینێکیتر بەدگویی جۆرێ کاردانەوەی سۆزدارییە کە ئێمە خۆمان دەدەین بە دەستیەوە. لەوانەیە جۆرەکەی جیاواز بێت، بەڵام لە هەر حاڵدا مەیل بە پەیداکردنی بێئارامیو وازهێنان، لە بەشە پایەدارەکانی پێکهێنەریەتی. ئەگەر کەسێك لەم مەسەلەدا بەڕاستی ورد ببیتەوە، تێدەگات و نیشاندەدات کە بەڕاستی کەسێکە زۆر نەپۆختەو بە قسەکردن دەربارەی ئەوانیتر بە دوای پەیداکردنی بێئارامی لە دەرەوەیە. ئەمجار کە سەبارەت بە کەسێك بەدگویی دەکەن، ئاگاتان لە خود بێت، ئەگەر لێی ئاگادارن، زۆر شتی سەبارەت بە خۆتان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

بە گوتنی ئەمەی کە سەبارەت بەوانیتر تەنیا لێکۆڵەرن، مەسەلەکە ماسماڵی مەکەن. ئەم کارە نیشانەی بێئارامی، جۆرێ هەستی ورووژان، ڕواڵەتی بوون و کەمبوونی ئۆگری ڕاست و قووڵ بەرامبەر بە خەڵکێکە کە ئەم بەدگۆییە لە بارەیانەوە ڕاست نیە.

گرفتی دواتر ئەوەیە کە چۆن لە بەدگویی بەرگری بکەین؟ ئەمە گرفتی دواترە. کاتێ خۆتان دەزانن کە خەریکی بەدگویین، بە چ شێوەیەك ڕایدەگرن. ئەگەر بووبێت بە خۆ، کارێکی دزێو کە هەر ڕۆژو هەر سەعات دووبارە دەبێتەوە، چ جۆر دەکرێت ڕایگرێت؟ ئایا بەڕاستی پرسیارێکی وا دەگات بە زەینتان؟ ئایا کاتێ دەزانن کە خەریکی بەدگویین، کاتێ لە بەدگوییکردنی خۆتان ئاگادارن و لە تەواوی مانا گرنگەکانی ئاگاداریتان هەیە، ئایا بە خۆتان دەڵێن: "بە چ شێوەیەك من دەبێت ڕایگرم" ئایا هەر لەو چرکەیەدا کە لەم کردەوە ئاگادار بن، بە حەزی خۆی ڕادەوەستێت؟ ئەڵبەت چۆنیەتیی ڕاگرتنی بە هیچ جۆر باس ناکرێت. چۆنیەتیی ڕاگرتنی تەنیا کاتێ دێتە بەرباس کە لێی ئاگادار نەبن و بەدگویی نیشانەی بێئاگایی بێت. بەڵێ، ئەمە جاری داهاتوو تاقیبکەنەوە و بزانن کە کاتێ لە ماهییەت و زاتی وتنی خۆ ئاگادار دەبن، چۆن خێراو بە پەلە بەدگویی ڕادەگرن. کاری وا پێویستی بە ئیرادە نیە. تەنیا شتێ کە پێویستیەتی وشیارییە، ئاگاداری لەوەی کە دەڵێن و ئاماژەکانی. پێویست ناکات ئێوە بەدگویی مەحکووم بکەن یان ئەوەی کە ڕەوایی پێبدەن. لێی ئاگادار بن و بزانن بە چ خێراییەك دەتوانن کۆتایی پێ بێنن، چونکە شێوازەکانی کردەوە، ڕەفتارو نموونەی فیکری خۆتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، لەم ئاشکراکردنەدا، مرۆڤ بە کەشفی خود کە شتێکی زۆر گرنگتر لە بەدگویی دەربارەی ئەوانیتر، دەربارەی ئەوەی کە ئەنجامی دەدەن و بیری لێدەکەنەوە و چۆنیەتیی ڕەفتارەکانیانەوەیە، دەگات. زۆربەی ئێمە کە ڕۆژنامەکانی ڕۆژانە دەخوێنینەوە، لە بەدگوییەکان ـــ بەدگوییە



جیهانییەکان ـ کەیلین، تەواوی ئەمانە ڕێگەی هەڵاتنێکە لە خودی ئێمە، لە بچووك بوون و دزێویی خودی ئێمە، ئێمە خەیاڵ دەکەین کە لە ڕێگای ئۆگرییەکی ڕواڵەتی بە ڕووداوەکانی دونیا، ئاقڵترو ئاقڵتر دەبین و لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ژیانی خۆماندا، توانایی زیاتر بەدەستدێنین. بێگومان تەواوی ئەمانە ڕێگاکانی هەڵاتن لە خودی خۆمانە. دەروونی ئێمە ڕواڵەتی و خاڵییە، ئێمە لە خۆ دەترسین. دەروونی ئێمە ئەوەندە هەژارە کە بەدگویی ڕۆڵی سەرگەرمییەکی دەوڵەمەندو ڕێگە دەربازبوونێك لە خۆ دەگێرێت. هەوڵی ئێمە ئەوەیە کە ئەم بۆشاییەی دەروون بە نیشانەکان، بەدگۆیی لە کۆبوونەوەی گرووپیدا و شێوازە بێئەژمارەکانی هەڵاتن پڕ بکەینەوە، بەجۆرێ کە تێگەیشتنی ئەوەی کە هەیە، بایەخی خۆی لە دەستدەدات و هەڵاتن دەبێتە گرنگترین شت. فامی ئەوەی کە هەیە پێویستی بە سەرنجە، تێگەیشتن لە خاڵیبوونی مرۆڤ، تێگەیشتن لەمەی کە ئەو لە ئازاردایە، پێویستی بە سەرنج و ئاوڕدانەوە هەیە، نە بە هەڵاتنی جۆراوجۆر، بەڵام زۆرێك لە ئێمە حەز بەم هەڵاتنانە دەکەن، لەبەر ئەوە ئەوانە لەزەت گەیەنەترو بەتامترن. هەروەها کاتێ ئێمە خۆمان بەو شێوەی کە هەین دەناسین، بەربەرەکانی لەگەڵ خۆ دژوار دەبێت. ئەمە یەکێ لە گرفتەکانە کە ئێمە لەگەڵی بەرەوڕووین و نازانین چ دەبێت بکرێت؟ کاتێ من لە خاڵی بوون، ئازارکێشان و ڕەنجێك کە لەودا خەریکە دەخنکێم ئاگادارم، نازانم دەبێت چ بکرێت و چۆن هەڵسمەوە بۆ بەرەبەرکانێ؟ کەوابوو ڕوو دەنێم لە هەموو جۆرە هەڵاتنێك.

گرفت ئەمەیە کە چ دەبێ بکرێت؟ ڕوونە کە تاك دەتوانێت دەرباز ببێت، چونکە ئەم کارە بێسەمەرترین و منالانەترین کارەکانە، بەڵام کاتێ بەو جۆرەی کە هەن لەگەڵ خۆدا ڕووبەڕوو دەبنەوە، دەبێت چ بکەن؟ سەرەتا، ئایا ئەم دەرفەتە هەیە کە نە پاساوی بدەن و نە حاشای لێ بکەن، بەڵکو هەر بەو جۆرەی کە هەن لە تەنیشتیدا بن؟ کارێ کە زۆر زەحمەت و دژوارە. لەبەر ئەوە زەین بە دوای پاساو، تاوانبارکردن و دیاریکردنی شوناسەوەیە. ئەگەر هیچ کام لەم کارانە نەکات و تەنیا لە تەنیشتیدا بمێنێتەوە، ئەوا وەك ئەوە وایە کە هەموو شتێکی قەبوولکردووە. ئەگەر من قەبوولبکەم کە پێستم قاوەییە، گرفت تەواوە، بەڵام ئەگەر من حەز بکەم بگۆڕدرێم بۆ ڕەنگێکی ڕۆشنتر، ئەوا گرفت دەسپێدەکات. قەبوولکردنی "ئەوەی هەیە" دژوارترین کارەکانە، کاتێ تاك دەتوانێت ئەم کارە بکات کە هیچ چەشنە هەڵاتن، تاوانبارکردن یان پاساودان کە شێوەیەکن لە هەڵاتن، نەبێت. کەواتە، کاتێ تاك شێوازی گشتی هۆکاری بەدگۆیەکان تێدەگات و بێسەمەربوونیو بەدبەختییەکانی و تەواوی بەرهەمەکانی فام دەکات، ئەوکات لەگەڵ ئەوەی

هەیە بە تەواوی دەمێنێتەوە و لەو حاڵەدا بەرەوڕوو بوونەوە لەگەڵ بەدگۆییدا یان بۆ لەنێوبردنی دێتە ئاراوە یان بۆ گۆڕینی بەشێکی تر.

ئەگەر هیچ کام لەم کارانە ئەنجامنەدەین و لەگەڵی بە شێوەیەك بەرەڕوو ببینەوە کە ئامانجمان تێگەیشتنی بێت و بە تەواوی لەتەنیشتیدا بین، ئەوکات دەزانین کە شتێ نییە کە لێی بترسین، ئەوکات ئەو دەرفەتە دەبێت کە ئەوەی کە هەیە بگۆڕن.

## ١٥ـ دەربارەی رەخنە

**پرسیار: رەخنە لە پەیوەندیدا چ پێگەیەکی هەیە؟ جیاوازیی نێوان رەخنەی رووخێنەرو بنیاتنەر چییە؟**

**کریشنا مورتی:** سەرەتا بۆچی رەخنە دەگرین؟ ئایا ئەم کارە بۆ تێگەیشتنە یان تەنیا بۆڵەبۆڵ کردنێکەو بەس. کاتێ من لە ئێوە رەخنە دەگرم، ئایا ئێوە فام دەکەم؟ ئایا تێگەیشتن لە رێگای داوەرییەوە دروستدەبێت؟ ئەگەر من حەز بە تێگەیشتن بکەم ـ ئەڵبەت نە تێگەیشتنی رواڵەتی، بەڵکو تێگەیشتنی قووڵی چەمکی گشتی پەیوەندی لەگەڵ ئێوە ـ ئایا رەخنەگرتن لە ئێوە دەسپێدەکەم؟ یان لەم پەیوەندییەی نێوان ئێوەو خۆم ئاگادارم و بە ئارامی دەیخەمە ژێر چاودێری، بەبێ ئەوەی کە باوەڕ، رەخنە، داوەری، دیاریکردنی شوناس و تاوانبارکردنەکانی خۆ بەرجەستە بکەم و لە حاڵێکدا رەخنە نەگرم، چی روو دەدات؟ هەرکەس حەز لە خەوتن دەکات، وانیە؟ مانای ئەم قسە ئەوە نییە کە مرۆڤی بۆڵەبۆڵکەر خەوی لێ ناکەوێت. لەوانەیە ئەمە ببێتە خوو ئێمە بە یارمەتی خوو عادەت، خەو بخەین لە خۆمان. ئایا بەڕای ئێوە لە رێگای رەخنەوە، تێگەیشتنێکی قووڵترو بەرینترمان دەبێت؟ جیاوازییەك نییە کە ئایا رەخنە رووخێنەرە یان بنیاتنەر، بێگومان شتی وا هیچ پەیوەندییەکی نیە. کەوابوو پرسیار ئەمەیە: وەزعی پێویستیی زەین و دڵێك کە پەیوەندی تێدەگات چییە؟ شێوازی تێگەیشتن چییە؟ چۆن شتێ فام دەکەین؟ ئەگەر ئۆگریتان بە منداڵەکەتان هەیە چۆن ئەو فام دەکەن؟ مەگەر نە ئەوەی کە چاودێری دەبن؟ لە کاتی یاریدا چاودێری دەکەن و لە حاڵ و وەزعە جۆراوجۆرەکانیدا خەریکی خوێندنەوەی دەبن، ئێوە رای خۆتان ناسەپێنن بەسەر ئەودا. ناڵێن ئەو دەبێت ئەم کارە یان ئەو کارە ئەنجامبدات. ئێوە بە شێوازێکی هۆشیارانە چاودێری کردەوەکانی ئەو دەبن. سەرئەنجام لەوانەیە ئێوە بەرەبەرە منداڵەکەتان فام بکەن ـ ئەگەر بەردەوام رەخنە بگرن، بتانەوێت بەردەوام کەسیەتیی تایبەتی



خۆتان بگۆزنەوە بۆ ئەو یان وەزعە تایبەتییەکانی خوو بڕیاردان بۆ شێوەیەك کە دەبێت ببێت یان نەبێت و مەسەلەی لەم چەشنەی پێ بقبوولێنن، گومانێك نییە کە رێگرێکتان لەسەر رێگای ئەم پەیوەندییە دروستکردووە. بەداخەوە زۆربەی ئێمە بۆ ئەمە رەخنە دەگرین کە بەوانیتر فۆرم بدەین و دەست وەردەینە کاریان. فۆرمدان بە شتێك، ئێمە تا ئەندازەیەك رازی دەکات و بە ئێمە لەزەت دەدات. چ بە شێوەی پەیوەندی لەگەڵ منداڵ یان هاوسەر بێت و چ هەرکەسێکیتر. لەم کارەدا هەست بە دەسەڵات دەکەین، خاوەن کار دەژمێردرێین و بەڕاستی رازیدەبین. ئاشکرایە کە لە تەواوی ئەم کارو کردەوەو ئاکارەدا، لە تێگەیشتنی پەیوەندی هەواڵێك نیە. ئەوەی هەیە، سەپانی رووت و ئارەزووی قاڵبی بارهێنانی تاکەکان بە شێوە جۆراوجۆرەکانی وەزع و حەزو ئارەزووی خودی ئێوەیە. تەواوی ئەمانە ئێوە لە تێگەیشتنی پەیوەندی بێبەش دەکەن. ئەوکات دەگەین بە رەخنە لە خۆمان. ئایا رەخنە، تاوانبارکردن یان پاساودانی خودی ئێمە دەکات بە بەڵگە لە بەرامبەر خود دا؟ کاتێ من رەخنە لە خۆ دەگرم، ئایا ئەم رەخنە رەوتی رەخنەو ئاشکراکردن لە مندا سنووردارو بەرتەسك ناکاتەوە؟ ئایا دەروون ڕوانی کە جۆرێك رەخنە لە خودە، خود بۆ ئێمە ئاشکرا دەکات؟ چ شتێ ئاشکراکردنی خود مەیسەر دەکا؟ ئاشکرا سازبوون، بەخۆف بوون و رەخنەگربوونی بەردەوام، هیچ کات یارمەتییەك بە ناسین ناکەن. ئەوەی کە دەبێتە هۆی ناسینی خودو بەم جۆرە مرۆڤ بەرەبەرە، بەبێ هیچ مەحکووم کردن و دیاریکردنی شوناسێك، ئەرێ، بەرەبەرە بە تێگەیشتنی دەگات، ئاگاداری بەردەوامە. لەم کارەدا دەبێت جۆرێك سروشت پاکی هەبێت، تاك ناتوانێت بە شێوەی بەردەوام بە پەروەردەکردن، کردنەوەو فۆرمدان بەوەوە مژول بێت. ئەم سروشت پاکییە بۆ تێگەیشتن پێویستە. ئەگەر من تەنیا بەرتەسك بکەمەوە، کۆنترۆڵ بکەم و خەریکی تاوانبارکردن بم، ئەوا تەڤگەری هەست و بیرکردنەوەم راگرتووە، وانیە؟ خستنەڕووو ئاشکراکردن لە کاتی تەڤگەری فیکرو بیرکردنەوەدا پێکدێت نە لە کۆنترۆڵی رووتدا. کاتێ کەسێك شتێکی بۆ روون دەبێتەوە، ئەوکات گرفت ئەمەیە کە بە چ شێوەیەك لەگەڵی بجووڵێینەوە؟ ئەگەر من بە پێی بۆچوونێك، پێوەرێك و ئیدەئالێك رەفتار بکەم، ئەوا بەزۆر فۆرم بە "خود" دەدەم. لەم کارەدا نە تێگەیشتن هەیەو نە بەرزبوونەوە. ئەگەر من بەبێ مەحکووم کردن و بە بێ دیاریکردنی شوناس خەریکی چاودێری خود بم، لەو حاڵەدا جووڵان بۆ ئەو دیویشی مەیسەر دەبێت. هەر بەم بۆنەوەیە کە تەواوی ئەم رەفتارەی نزیکی لە ئیدەئالێك، شتێکی بە تەواوی ناڕاستە. ئیدەئالەکان ئەو خواوەندانەن کە بەدەستی خۆمان

دروستیاندەکەین، بێگومان، یەکسان بوون لەگەڵ خەیاڵێکی زەینی کە خۆی دروستیکردووە، رزگاری نیە.

کەوابوو، تێگەیشتن تەنیا کاتێ مەیسەر دەبێت کە زەین بە شێوەیەکی دروستکارانە وشیار بێت و خەریکی چاودێری بێت، شتێ کە زۆر دژوارە، لەبەر ئەوە لە چالاك بوون، بێئارامی، رەخنەگربوون، مەحکووم کردن و پاساودان، لەزەت دەبەین. ئەمە پێکهاتەی گشتی دەروونی ئێمەیەو ئێمە تێدەکۆشین لە دەروونی پەردەیەك لە خەیاڵ، دەمارگرژی، بۆچوون، ئەزموون و بیرەوەری بە تێگەیشتن بگەین. ئایا دەکرێت پەردەکان هەڵدرێنەوەو بە تێگەیشتنی راستەوخۆ بگەیت، ئەوکات لە هیچ کام لەم شێوازانە کەڵك وەرناگرین‌و بەربەرەکانی ئێمە لە گەڵیدا بە شێوەی راستەوخۆ دەبێت. فامی پەیوەندی کاتێ دێتە دی کە ئەم شێوازی رەخنەگرتنە فام کرابێت و زەین ئارامی گرتبێت. ئەگەر ئێوە گوێ بۆ من دەگرن و هەوڵتان ئەوەیە، بەبێ ئەوەی کە کۆششێکی زیاتر بکەن، قسەکانی من تاقیب بکەن، لەم شێوەدا، ئیمکانی ئەوە هەیە کە یەکتر فام بکەین، بەڵام ئەگەر بەردەوام بە رەخنەگرتن لە بۆچوونەکانی خۆ، ئەوەی کە ئەوانیتر بە ئێوەیان گوتووەو بەم جۆرە باسانەوە خەریك بن، ئەوا من‌و ئێوە پێکەوە پەیوەندییەکمان نیە، لەبەر ئەوە لە نێوان من و ئێوەدا دیوار هەیە. ئەگەر هەردووی ئێمە هەوڵمان ئەوە بێت مەسەلەکانی گرفتی جێی باس بدۆزینەوە کە لە خودی گرفتەکەدا شاراوەیە، ئەگەر هەردووی ئێمە بە لێکۆڵینەوەی قووڵی ئارەزوو نیشانبدەین، راستی مەسەلەکە تێبگەین و ئەوەی هەیە پەیدای بکەین‌و بیخەینە ڕوو، ئەوا پەیوەندی پێکەوەمان دەبەستێت، ئەوکات زەینی ئێوە هەم وشیارەو هەم پاسیڤ و چاودێری ئەوەیە کە بزانێت راستی ئەم مەسەلە لە کوێدایە؟ کەوابوو زەینی ئێوە دەبێت بە شێوەیەکی بێوێنە خێرا بێت و بە هیچ ئایدیا یان ئیدەئال و داوەری یان باوەڕێکە تاك لە ئاکامی ئەزموونی تایبەتیی خۆیدا وێنای کردووە، پەنا نەبات. بێگومان، تێگەیشتن کاتێ دێتە دی کە چەماوەبوونی خێرای زەین کە خاوەنی وشیارییەکی پاسیڤە، بوونی هەبێت. لەو شێوەدا، دەتوانێت وەربگرێت و حەساسییەتی دەبێت. زەینێ کە لە گەمارۆی قەرەباڵغی خەیاڵ، دەمارگرژی و باوەڕ ـ چ یارو چ نەیار ـ کەوتووە، حەساسیەتی نیە.

بۆ فامی پەیوەندی دەبێت جۆرێ وشیاریی پاسیڤ ـ کە نەبێتە هۆی لە نێوچوونی پەیوەندی ـ هەبێت. ئەم چەشنە وشیارییە، پەیوەندی زیندووتر دەکاتەوەو مانایەکی زیاتری پێ دەدات. کەوابوو لەو پەیوەندییەدا ئیمکانی بوونی سۆزی راستەقینە، گەرمی‌و هەستی نزیکی کە



بێئارامی رووت و هەستی پەتی نیە، هەیە. ئەگەر بتوانین لەگەڵ هەموو شتێکدا شێوازێکی بەرەوڕوو بوونەوەی وا یان پەیوەندییەکی لەم چەشنەمان هەبێت، ئەوا گرفتەکانمان ــ گرفتی دارایی‌و شتە تایبەتییەکانمان چارەسەر دەبێت، چونکە ئێمە هەر ئەو شتەین کە هەمانە. مرۆڤێ کە پارەی هەیە، پارەیە، مرۆڤێ کە خۆی لەگەڵ داراییدا هاوشێوەو یەکسان دەکات، داراییە، یان ماڵ و کەلووپەل. هەر بەم جۆرەش هاوشێوەیی لەگەڵ ئایدیا و خەڵکدا. هەرکات هەستی توانایی هەبێت، پەیوەندی بێمانایە. زۆربەی ئێمە لەبەر ئەوە شتێکمان هەیە کە ئەگەر نەمان بێت، هیچ شتێکی دیکەمان نیە. ئەگەر نەمان بێت، ئەگەر ژیانی خۆمان لە مۆبلمان، موسیقا، زانست یان ئەمەو ئەوە پڕ نەکەین، تەپڵێ ناو خاڵی زیاتر نین و ئەم تەپڵە ناوخاڵییە پڕ هات و هاوارە و ئەم هات و هاوارەش ناو دەنێین ژیان و لێی رازین، کاتێ تێکچوونێك روو بدات و هەڵچوونێکی تێدا دروستبێت، ئەوا تووشی کەسەر دەبین، چونکە ئەو کاتەیە کە دەسبەجێ دەزانین هەر ئەوەین کە هەین، تەپڵێکی ناوخاڵی، بێئەوەی کە مانایەکی ئەوتۆمان هەبێت. بۆ ئاگاداربوون لە نێوەرۆکی گشتی پەیوەندی، پراکتیك پێویستەو لەم کردەوەیەدا لەوانەیە کە پەیوەندی راستەقینە دروستبێت و قووڵایی بەرفراوانی پەیوەندی، مانا بەرینییەکەی و زانستی پێویست بۆ ئاگاداربوون لە زاتی ئەشق، ئاشکرا بێت.

## ١٦ـ دەربارەی باوەڕ بە پەروەردگار

**پرسیار: باوەڕ بە پەروەردگار پاڵنەرێکی بەهێزە بۆ باشتر ژیان کردن، بۆچی ئێوە نکۆڵی لە خودا دەکەن؟ بۆچی ئێوە لە زیندووکردنەوەی ئیمانی مرۆو لە ئایدیای ئەودا بەرامبەر بە پەروەردگار کۆششێك ناکەن؟**

**کریشنا مورتی:** وەرن بە شێوەیەکی بەرینترو رۆشنبیرانەتر سەیری مەسەلەکە بکەین. من نکۆلی لە خودا ناکەم، کاری وا گەمژەییە. تەنیا کەسێك کە راستی ناناسێت، خۆی دەدات بە دەستی وشە بێماناکانەوە. مرۆڤێ کە دەڵێت دەزانم، نازانێت. مرۆڤێ کە راستی چرکە بەچرکە تێدەگات، ئامرازێکی بۆ هاویشتنی ئەو راستییە نیە.

باوەڕ، نکۆڵیکردن لە راستییە، باوەڕ بە خودا بوون، خواناسی نیە. نە ئیمانداران و نە بێئیمانان خوا پەیدا ناکەن، چونکە راستی نەناسراوەو باوەڕی مرۆڤ یان بێ باوەڕی ئەو شتێکی ناسراوەو گشتاندنێکی رووتە، کەوابوو راستی ناژمێردرێت. دەزانم کە ئێوە ئیماندارن و ئەوەش دەزانم کە ئەم باوەڕە لە ژیانی ئێوەدا مانایەکی زۆر کەمی هەیە. کەسانی ئیماندار زۆرن، بە

ملیۆن کەس بە خوا باوەڕیان هەیەو داوای سوکنایی لێدەکەن. سەرەتا بۆچی دەبێت باوەڕت هەبێت؟ ئێوە ئیماندارن، چونکە ئەم کارە بە ئێوە ڕەزامەندی، سوکنایی‌و هیوا دەدات و دەڵێن کە مانا بە ژیانی ئێوە دەدات. لەڕاستیدا ژیانی ئێوە مانایەکی ئەوتۆی نیە، چونکە ئێوە لە حاڵێکدا باوەڕیشتان هەیە، دەچەوسێننەوە، لە کاتێکدا باوەڕتان هەیە، کوشتن ئەنجامدەدەن، بە خوایەکی تاك و تەنیا باوەڕتان هەیە و یەکتر دەکوژن. دەوڵەمەندانیش باوەڕیان بە خودا هەیە، ئەوانیش بێڕەحمانە چەپاو دەکەن، پارە دەخەنە سەر پارەو دواتر، پەرستگایەك دروستدەکەن و دەبنە کەسانێکی بەشەردۆست. !

ئەو کەسانەی کە بۆمبە ئەتۆمییەکانیان باران بەسەر هیرۆشیمادا، دەیانگوت کە خوا لەگەڵ ئەوانە، ئەوانەی کە لە بریتانیاوە فڕین تا ئاڵمانییەکان لە نێو ببەن دەیانگوت کە خوا کۆمەك فرۆکەوانی ئەوانە. دیکتاتۆرەکان، سەرۆك وەزیران، ژەنڕاڵەکان، سەرۆك کۆمارەکان، هەر هەموو قسە لە خوا دەکەن، ئەوانە ئیمانێکی قایمیان بەخوا هەیە، بەڵام ئایا خزمەتێك ئەنجامدەدەن؟ ئایا ژیانێکی باشتر بۆ مرۆڤەکان دابیندەکەن؟ ئەوانەی کە دەڵێن ئیمانیان بە خوا هەیە، نیوەی دونیایان وێران کردووە و دونیا لە بەڵایەکی گشتیدا بەسەر دەبات. لە ڕێگای نەبوونی لێبوردەیی مەزهەبی لە نێوان خەڵکدا، جیایی و شەق بوونی ئیماندارو بێئیمان پێکهاتووە و ئاکامەکەی شەڕە مەزهەبییەکان بووەو ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە زەینی ئێمە بەڕاستی بەرەولای سیاسەت دەڕوات. ئایا باوەڕ بە خوا "پاڵنەرێکی بەهێز بۆ باشتر ژیان کردن"ە؟ ئێوە بۆچی بەدوای پاڵنەرەوەن بۆ ژیانی باشتر؟ گومانێك نییە کە پاڵنەری ئێوە دەبێت حەزی خودی ئێوە بێت بە ژینی پاك‌و خاوێن، جیا لەمەیە؟ ئەگەر بەدوای پاڵنەرەوە بن، ئۆگرییێکتان بەمە نییە کە ژیان بۆ هەموو کەس دابینبکەن، ئێوە تەنیا بە پاڵنەری خۆتان ئۆگرن، ـ شتێکە لەگەڵ پاڵنەری مندا جیاوازە ـ و ئەوکات ئێمە لەسەر پاڵنەرەکان پێکەوە هەڵدەستین بۆ شەڕکردن. ئەگەر ئێمە پێکەوە بە خۆشی ژیان بکەین، نە لەبەر ئینتیما بە ئامانجێك، بەڵکو لەبەر ئەوە مرۆڤین، ئەوکات تەواوی ئامرازی بەرهەمهێنان ـ بۆ بەرهەمهێنان بۆ هەمووان ـ پێکەوە دابەشدەکەین. بەهۆی نەبوونی ئەقڵ‌و ئاوەز، ئیدەی ئەقڵی باڵاتر کە ناوێکیتری لێدەنێن، قەبووڵدەکەین، بەڵام ئەم ناوە، ئەم ئەقڵی باڵاترە ژیانی ئێمە چاکتر ناکات. ئەوەی کە ژیان باشتر دەکات، ئەقڵە، بەڵام ئەگە باوەڕ هەبێت، دابەشکاری چینایەتی بێت، ئامرازی بەرهەمهێنان لە دەستی تاقمێکی کەم دابێت، نەتەوەی گۆشەگیرو دەوڵەتانی زلهێز هەبێت، ئەقڵ بوونی نابێت. بە ئاشکرا تەواوی ئەمانە نیشانەی نەبوونی ئەقڵەو نەبوونی ئەقڵیش، ڕێگری ژیانی باشترە، نەبێ باوەڕی بە خوا. ❊



هەموو ئێوە بە شێوازی جۆراوجۆر خاوەنی باوەڕن، بەڵام باوەڕی ئێوە بە هیچ جۆر ڕاستییێکی نیە. ڕاستی ئەوەیە کە هەن، ئەوەیە کە ئەنجامیدەدەن، ئەوەیە کە بیری لێدەکەنەوەو باوەڕی ئێوە بە شتێك، تەنیا دەربازبوونێکە، هەڵاتن لە ژیانی نەگۆڕ، گەمژانەو زاڵمانە. جیا لەمەیە، باوەڕ هەمیشە هۆکاری شەق بوونی نێوان خەڵکە، بۆیە هیندو بوودایی، مەسیحی، کۆمۆنیست، سۆسیالیست، خودان سەرمایەو چی‌وچیمان هەیە. ئیدەو باوەڕ، هۆکاری جوداییێن و پەیوەندییەك پێکناهێنن. لەوانەیە بڕێك بە شێوەی گرووپێك کۆ بکەنەوە، بەڵام ئەم گرووپە لەگەڵ گرووپی دیکەدا دژە. ئایدیاو باوەڕە، هەرگیز یەکیەتی دروستناکەن. بە پێچەوانەوە ئەوانە جیاکەرەوە، لێك کەرەوەو ڕووخێنەرن. کەواتە، لەوانەیە باوەڕی ئێوە بە خوا ببێتە هۆی بڵاوبوونەوەی بەڵا لە دونیا، ئەگەرچی لەوانەیە بۆ خودی ئێوە سوکناییێکی کاتی پێك هێنابێت، بەڵام لەڕاستیدا بۆ خودی ئێوەش دەبێتە هۆی بەڵا و وێرانیی زیاتر بە شێوەی شەڕ، قات‌و قڕی، دابەشکاری چینایەتی‌و کردەوەی بێڕەحمانەی خەڵك. کەوابوو باوەڕی ئێوە بە هیچ جۆر قەدرو بایەخی نیە. ئەگەر ئێوە بەڕاستی باوەڕتان بە خوا ببێت و ئەگەر شتی وایش ئەزموونی ڕاستەقینە بێت بۆ ئێوە، ئەوکات ڕەنگی زەردەخەنە دەنیشێتە سەر ڕوخسارتان و لە داڕووخاندنی بوونەوەرانی مرۆیی دەست هەڵدەگرن. ❊

هەنووکە بڵێن ڕاستی چییە؟ خواوەند چییە؟ خواوەند وشە نیە، وشە، خودی شت نیە. بۆ ناسینی ئەوەی کە ناپێورێت و ئەوەی کە پەیوەندی بە زەمانەوە نیە، زەین دەبێت لە زەمان ئازاد بێت، مانای ئەم قسە ئەوەیە کە زەین دەبێت لە هەموو بیرو لە هەموو خەیاڵەکان دەربارەی خواوەند ئازاد بێت. ڕاستی دەربارەی خوا یان ڕاستی چی دەزانن؟ ئێوە لەڕاستیدا هیچ شتێك دەربارەی ڕاستی دەزانن. ئەوەی دەزانن، وشەیە، ئەزموونی ئەوانیترە یان چرکەیەك لە ئەزموونە ناڕوونەکانی خۆتان، گومانێك نییە کە ئەمە خوا نیە، ئەمە ڕاستی نیە، ئەمە شتێك نییە کە لەوپەڕی زەمانەوە بێت. بۆ ناسینی ئەوەی کە لەوپەڕی زەمان دایە، دەبێت پرۆسەی زەمان فام بکرێت، زەمانێکە ناوی فیکرە، زەمانێکە شێوازی کران و کۆکردنەوەی زانستە. ئەمە نەخشەی گشتیی زەینە، زەین خۆی نەخشەیە، نەخشەی هەست و نەست، نەخشەی تاکی‌و گرووپی. کەواتە زەین دەبێت لە ناسراوەکان ڕزگار بێت. ماناکەی ئەوەیە کە دەبێت بە تەواوی ئارام بێت، نە ئارام بکرێت. زەینێ کە وەك ئەنجام، بدەی کاری دیاریکراو و مەشق‌و دیسیپلین بە ئارامی بگات، زەینێکی ئارام نیە. زەینێ کە ناچار دەکرێت، کۆنترۆڵ دەکرێت، فۆرم

دەدرێت، بە قاڵبێك دەدرێت و ئارام رایدەگرن، زەینێكی ئارام نایەتە ژماردن. لەوانەیە كە ئێوە بتوانن بۆ ماوەیەك زەین بە شێوەیەكی رواڵەتی ئارام بكەن، بەڵام زەینێكی وا نیە، زەینێی ئارام نیە. ئارامیو هێمنایی كاتێ دێتە بەر كە ئێوە تەواوی رەوتی فیكر تێبگەن، لەبەر ئەوە بۆ تێگەیشتنی ئەم رەوتە، دەبێت كۆتایی پێ بێنیت و كۆتایی رەوتی فیكر، دەسپێكی هێمنایيو ئارامییە. *

تەنیا كاتێ كە زەین بە تەواوی ئارام بێت، نە تەنیا لە چینی سەرەوە، بەڵكو بە شێوەیەكی سەرەكیو بنچینەیی ـ هەم لە ئاستی سەرەوەترو هەم لە ئاستەكانی خوارەوەتری نەست ـ تەنیا لەو حاڵەدا، نەناسراوەكان بوونی خۆیان رادەگەیەنن. نەناسراوەكان شتانێك نین كە بكرێت لە رێگای زەینەوە تاقییان بكەیتەوە، تەنیا شتێك كە دەكرێت تاقیبكەیتەوە، ئارامییە، ئارامیو هیچی تر. ئەگەر زەین جگە لە ئارامی خەریكی تاقیكردنەوەی شتێكی دیكە ببێت، تەنیا وەدانی حەزو ئارەزووەكانی خۆی ئەنجامداوە و هیچ زەینێك بەم جۆرە ئارام نیە، تا كاتێ كە فیكر ـ بە هەر شێوەیەك، خۆویست یان خۆنەویستانە ـــ لە جووڵە دایە، ئارامییەك نیە. ئارام بوون واتا رزگاری لە رابردوو، زانست، بیرەوەریی خۆ ویستانەو خۆ نەویستانە. كاتێ زەین لە ئارامیی تەواو دایە، نە كەڵكی لێ وەرگرن، كاتێ ئارام بوونێك هەیە كە بەرهەمی هیچ كۆششێك نیە، تەنیا لەو دۆخەدا، بێزەمانی، هەمیشەیی پێ دەنێتە گۆڕەپانی ژیان. ئەم وەزعە وەزعی بەبیرهێنانەوە نیەو بوونێك نییە كە بە بیر بێنێتەوە یان تاقیبكاتەوە.

كەواتە خواوەند یان راستی یان هەرچی كە ئێوە ناوی دەنێن، شتێكە كە چركەبەچركە بوونی خۆی رادەگەیەنێت و تەنیا لە حاڵ و وەزعی ئازادی و سروشت پاكیدا روو دەدات، نە كاتێ كە زەین لەسەر مەشق و نموونەیەكی تایبەت دیسیپلین وەردەگرێت. خوا پەیوەندی بە زەینەوە نیە، گەیشتن بەو لە رێگای گشتاندنەوە مەیسەر نیە. تەنیا رێگەی گەیشتن بەو، پارێزگارییە، هەر ئەو شتەی كە ناوی ئازادیە. پارێزگاری واتا بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ راستی "ئەوەی كە هەیە"و رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ راستیدا، وەزعێكی خۆش و نێوان خەوو بێدارییە. تەنیا كاتێ كە زەین لە بارودۆخی خۆشی و گونجاو و نێوان خەو و بێداری و ئارام بوون دایەو بە تەواوی بێجووڵەیە، بە بێ "فرافكنی" فیكر ـ چ خۆ ویستو چ خۆ نەویست ـ تەنیا لەو وەزعەدا، هەمیشەییو نەمری بوونی خۆی ئاشكرا دەكات.



## ١٧ـ دەربارەی بیرەوەری

**پرسیار: ئێوە دەڵێن بیرەوەری ئەزموونی تەواوە. من لە قسەكانی رابردووی ئێوە بیرەوەریو لێكدانەوەی روونم هەیە. لە چ روویەكەوە شتی وا ئەزموونی ناتەواوە؟ تكایە لەم بارەوە بە درێژی باسبكەن.**

**كریشنا مورتی:** مەبەستی ئێمە لە بیرەوەری چییە؟ ئێوە دەڕۆن بۆ قوتابخانەو لە راستییەكان و زانستی تەكنیكی پڕ دەبن. ئەگەر ببنە ئەندازیار لە بیرەوەری زانستی تەكنیكی بۆ دروستكردنی پردێك كەڵك وەردەگرن. ئەمە بیرەوەرییەكی راستەقینەیە. بیرەوەری دەروونناسانەش هەیە. ئێوە شتێك ـ باش یان خراپ ـ بە من دەڵێن و منیش ئەوە هەڵدەگرم، كاتێ دووبارە ئێوە دەبینمەوە، دیتنی ئێوە لەگەڵ ئەو بیرەوەریەدا هاوڕێیە، بیرەوەریی قسەیەك كە بۆ منت كردووە. لە بیرەوەریدا دوو لایەن هەیە: لایەنی راستی و لایەنی دەروونناسانە. ئەم دووانە پێكەوە بەستراون، كەوابوو هێڵێكی دیاریكراو لە نێوانیاندا نیە. دەزانین كە بیرەوەری راستەقینە وەك ئامرازێك بۆ ژیان پێویستە، بەڵام ئایا بیرەوەریی دەروونناسانەش هەروایە؟ هۆكارێك كە دەبێتە هۆی پاراستنی بیرەوەریی دەروونناسانە چییە؟ چ شتێ دەبێتە هۆی ئەوەی كە تاك سووك كردن یان هاندانێك لە رووی رووحییەوە بسپێرێتە زەین؟ بۆچی مرۆڤ بڕێ لە بیرەوەرییەكان رادەگرێت و بڕێكی دیكە رەتدەكاتەوە. روونە كە تاك بیرەوەرییەك رادەگرێت كە خۆش بێت و لەو بیرەوەرییانەش كە تاڵن خۆ دوور دەگرێت. ئەگەر ورد بووبێتەوە دەزانێ كە بیرەوەریە ئازاراوییەكان زووتر لە بیرەوەرییە شیرینەكان وەلا دەنرێن. زەین یانێ بیرەوەری، بیرەوەری لە هەر ئاست و بە هەر ناوێك. زەین بەرهەمی رابردووە، لەسەر بنەمای رابردوو دامەزراوە، رابردووێكە مشتێ بیرەوەریە و حاڵەتێكە مەرجی كراو. ئێستا بە وەها بیرەوەرییەكەوە ئێمە لە بەرامبەری ژیاندا دەمێنینەوەو لەگەڵ كێشەیەكی نوێ بەرەوڕوو دەبین، ئەم كێشە هەمیشە تازەیەو وەڵامی ئێمە هەمیشە كۆنە، چونكە بەدەی رابردووە. كەواتە ئەزموونی بەبێ بیرەوەری دۆخێكەو ئەزموونی بە بیرەوەری دۆخێكیتر. بە دەربڕینێكیتر، كێشەیەك هەیە كە هەمیشە تازەیە. من بە وەڵامی ئامادەكراوو مەرجیكرانێكی كۆنەوە لە بەرامبەریدا دەوەستم. لەم حاڵەدا چی روو دەدات؟ منی تازە هەرسدەكەم، فامی ناكەم و ئەزموونی نوێ بە یارمەتی رابردوو مەرجیكراوە. كەوابوو لە ئەوەی كە تازەیە، تۆزێك تێگەیشتووم، ئەم تێگەیشتنە هەرگیز تەواو نیە، كاتێ شوێنەواری بیرەوەری نامێنێتەوە كە تێگەیشتنی تەواو روو بدات. كاتێ كێشە هەیە ـ كێشەیەك كە هەردەم تازەیە ـــ ئێوە بە

وەلاّمێکی کۆنەوە لە بەرامبەریدا ئامادە دەبن. ئەم وەلاّمە کۆنە، تازەکەش مەرجی دەکات و بەم جۆرە دەپیێچێنێت و بای دەدات و بە لایەکدا دەیچەمێنێتەوە. کەواتە، تێگەیشتنی تەواو لە تازە نیەو تازە لە کۆنەدا هەرسدەبێت و بەم شێوە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی. دوور نییە ئەم باسە تەجریدی خۆی نیشانبدات. بەلاّم ئەگەر تۆزێ وردتر و وردبینانەتر سەرنجی بدەن دەزانن کە دژوار نیە. هەلومەرجی دونیا لە ئێستادا رووبەڕووبوونەوەیەکی نوێ و شێوازێکی نوێ بۆ بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ گرفتی دونیادا کە هەمیشە تازەیە، دەخوازێت. لەوەیڕا کە بەرەوڕووبوونەوەی ئێمە لە گەڵێداو لەگەڵ زەین لە رێگای دەمارگرژی لۆکاڵی، بنەمالەیی و مەزهەبی مەرجی کراوە، ئیتر ناتوانین لەگەڵ ئەم گرفتەدا بەرەوڕووبوونەوەیەکی تازەمان هەبێت. ئەزموونەکانی رابردووی ئێمە رێگری تێگەیشتن لە کێشەی تازە دەبن، بۆیە روو دەنێین لە پەروەردەکردن و بەهێزکردنی بیرەوەری، بەم شێوە هیچکات بە تێگەیشتنی تازەکان ناگەین و لەگەڵ کێشەی جێی ئاماژە هەرگیز بە شێوەیەکی تەواو بەرەوڕوو نابینەوەو تەنیا کاتێ کە مرۆڤ بتوانێت لەگەڵ ئەم کێشەیە بە شێوازێکی نوێ و جیا لە رابردوو بەرەوڕوو ببێتەوە، سەمەری پێویست دێتە بەر.

پرسا دەڵێت: "من لە قسەکانی رابردووی ئێوە بیرەوەری و لێکدانەوەی روونم هەیە. لە چ رووبەکەوە شتی وا نییە ئەزموونێکی ناتەواوە؟" ئەگەر شتێکی وا تەنیا لێکدانەوەیەك و بیرەوەرییەك بێت، ئەزموونێکی ناتەواوە. ئەگەر ئەوەی کە گوتراوە فام بکەن و راستییەکەی پەیدا بکەن، ئەم راستییە، بیرەوەری نیە. راستی بیرەوەری نیە، چونکە هەمیشە تازەیەو هەمیشە خۆی دەگۆڕێت، ئەوەی ئێوە هەتانە، بیرەوەری قسەکانی رابردووە، بۆچی؟ چونکە ئێوە لە قسەکانی رابردوو وەك رێنما کەڵك وەردەگرن و بە چەشنێکی تەواو لێی تێنەگەیشتوون، ئێوە دەتانەوێت بە سەریدا بچنەوەو خۆ ویستانە یان خۆ نەویستانە لەبەری بکەن، بەلاّم ئەگەر شتێك بە تەواوی تێبگەن، یانێ راستییەکەی بە شێوەیەکی تەواو تیبگەن، دەزانن کە شتێ بە ناوی بیرەوەری هەرگیز نیە. فێرکردن و بارهێنانی ئێمە، پەروەردەکردنی بیرەوەری و بەهێزکردنیەتی. کارو کردەوە و رێورەسمی دینی، خوێندنەوە و زانستی ئێوە، هەموویان وزەبەخشی بیرەوەری ئێوەن. مەبەستی ئێمە لەم قسەیە چییە؟ بۆچی بە بیرەوەرییەوە دەنووسین؟ نازانم زانیوتانە یان نا کاتێ مرۆڤ پیر دەبێت، سەیری رابردوو دەکات، بە خۆشی و ئازارو لەزەتەکانی رابردووەوە کاتێ کە گەنج بووە، بۆ داهاتوو دەڕوانێت. بۆچی وا دەکەین؟ بۆچی بیرەوەری ئەمەندە گرنگ بووە؟



لەبەر ئەم هۆیە سادە و روونە کە ئێمە ناتوانین بە شێوەیەکی یەکپارچەو تەواو لە ئێستادا ژیان بکەین. ئێمە لە رانەبردوو وەك ئامرازێك بۆ داهاتوو کەڵك وەردەگرین. کەوابوو ئێستا بۆ ئێمە مانای نیە. ناتوانین لە ئێستادا بژین، چونکە لە ئێستا وەك رێگایەك بۆ داهاتوو کەڵك وەردەگرین. لەوەیڕا کە دەخوازم ببمە شتێك، هیچکات تێگەیشتنی تەواوم لە خۆ نیەو بۆ فامی خۆمو ئەوەی هەم، پێویستییەك بە پەروەردەکردنی بیرەوەری نیە. بە پێچەوانەوە، بیرەوەری رێگرێکە بۆ تێگەیشتنی "ئەوەی کە هەیە" نازانم زانیوتانە یان نا کە هەست و فیکری تازە کاتێ دێتە بەر کە زەین نەکەوتبێتە داوی بیرەوەری. کاتێ نێوان دوو فیکر و دوو بیرەوەری مەودایەك هەبێت و کاتێ بکرێت ئەم مەودا رابگریت، ئەوا لەو مەودایە وەزعێکی بوون پێکدێت کە ئیتر ناوی بیرەوەری نیە. ئێمە بیرەوەری گەڵێکمان هەیەو بیرەوەری وەك ئامرازی بەردەوام بوون، پەروەردە دەکەین. تا کاتێ کە بیرەوەری پەروەردە دەکەین، "من"و "هی من" زۆر بایەخی هەیەو لەبەر ئەوە زۆربەی ئێمە لە "من"و "هی من" دروستکراوین، بیرەوەری رۆڵێکی گەورە لە ژیانی ئێمەدا دەنوێنێت. ئەگەر مرۆڤ بیرەوەرییەکی نەدەبوو، دارایی ئەو، خێزانی ئەو ئایدیاکانیشی بایەخێکی ئەوتۆیان پەیدا نەدەکرت، کەوابوو ئێوە بە پەروەردەکردنی بیرەوەری "من"و "هی من" بەهێز دەکەن. ئەگەر ورد ببنەوە تێدەگەن کە نێوان دوو فیکری دوو هەست، مەودایەك هەیە. لەم مەودایە کە بەرهەمی بیرەوەری نیە، جۆرێ رزگاری بێوێنە لە من و هی من هەیەو شتێکە کە پێی زەمانی پێ نەگەیشتووە.

ئێستا گرفتەکە کە لە روانگەیەکی دیکەوە سەیر بکەین. بێگومان بیرەوەری، زەمانە، بیرەوەری خولقێنەری دوێنێ و ئەمرۆو سبەی نیە. بیرەوەری دوێنێ، مەرجی کەرەوەی ئەمرۆیە، هەروەها فۆرمیش بە سبەی دەدات. بە دەربڕینێکی تر رابردوو لە رێگای رانەبردووەوە، داهاتوو دەخولقێنێت. شێوازێکی پەیوەندیدار بە زەمان لە رۆین دایە کە ناوی ئیرادەی کرانە. بیرەوەری، زەمانەو ئێمە هیوادارین کە لە رێگای زەمانەوە بە ئاکام بگەین. ئەمرۆ من فەرمانبەرێکی ئاساییم و ئەگەر کات و دەرفەت پەیدا بکەم، دەبمە بەڕێوەبەر یان مالك. کەوابوو دەبێت کاتم هەبێت و هەر بەم شێوە بۆچوونەوە دەڵێم: "دەبێت راستی پەیدا بکەم، دەبێت بە پەروەردگار بگەم". کەواتە بۆ بەراستی گەیاندنی ئەم داخوازییە، پێویستیم بە زەمانە کە ماناکەی ئەمەیە کە پێویستیم بە بیرەوەری و بەهێزکردنی بیرەوەری لە رێگای مەشق و پەروەردەوە هەیە تا ببمە شتێك، سەرکەوتنێك بە دەست بێنم و بگەم بە شتێك کە ماناکەی بەردەوام بوون لە زەمان دایە. لە رێگای زەمانەوە هیوادارین بەبێ زەمانی بگەین، لە رێگای زەمانەوە هیوادارین

نەمریمان دەستکەوێت. ئایا ئەم کارە دەکرێت؟ ئایا دەکرێت هەمیشەیی لە تەڵەی زەماندا و لە ڕێگای بیرەوەرییەوە کە پەیوەندی بە زەمانەوە هەیە، بخەینە داو؟ بێ زەمانی تەنیا زەمانێك ڕوو دەدات کە بیرەوەری کە "من" و "هی من"ە ڕاوەستێت. ئەگەر ڕاستی ئەم باسە تێگەیشتن ـ کە بێ زەمانی ناکرێت لە ڕێگای زەمانەوە فام کرێت یان قەبووڵبکرێت ــ ئەوا دەتوانین خەریکی لێکۆڵینەوەی لە فۆرمی بیرەوەری بین، بیرەوەری کاروباری تەکنیکی پێویستە، بەڵام بیرەوەری دەروونی کە پاسەوانی "خود" واتا "من" و "هی من"ە، یانێ شتێکە کە شوناس دیاریدەکات و بەردەوام بوونی خودە، بۆ وەزعی ژیان و ڕاست زەرەری هەیە. کاتێ مرۆڤ ڕاستی ئەم مەسەلە بزانێت، ئەوەی کە ناڕاستە دەچێتە لاوە، کەواتە بیرهێنانەوەی دەروونناسانەی ئەزموونی دوێنێ نیە.

داچوونی جوانی خۆرو دیمەنی درەختێکی جوان لە مەزرایەکدا دەبینن و کاتێ کە سەرەتا بۆی دەڕوانن لەزەتێکی تەواوی لێدەبەن، دواتر دووبارە دەڕواتەوە بۆ ئەوێ کە دووبارەترە لەزەتی لێ ببەن. کاتێ دووبارە بە هەوسی لەزەت بردنی دووبارە دەچنەوە بۆلای، چی ڕوو دەدات؟ ئیتر لەزەتێك نیە، لەبەر ئەوە ئەمە هەر ئەو بیرەوەری داچوونی خۆری دوێنێیە کە ئێوە ناچار بە گەڕانەوە دەکات و بە زۆرو گوشار پێتان دەڵێت کە لەزەت ببەن. دوێنێ بیرەوەرییەك نەبوو، تەنیا شتێك کە دەبینرا، ستایشی کاتی و دژکردەوەی ڕاستەوخۆ بووە. بەڵام ئەمڕۆ ئێوە ئارەزووی لە دواخستنی ئەزموونی دوێنێ دەکەن. بە دەربڕینێکیتر، بیرەوەری لە نێوان ئێوەو ئاوابوونی هەتاودا مەداخەلە دەکات، بۆیە لەم جوانییەدا نە لەزەتێك هەیەو نە سەمەرو بێ عەیبی و پۆختەییێك. نموونەیەکی دی: هەڤاڵێکتان هەیە کە دوێنێ شتێکی بە ئێوە گوتووە، بەو بیرەوەریەوە ئەمڕۆ دۆستەکەتان دەبینن. بیرەوەریی ئێوە لەو دۆستە سووك کردنێك یان ستایشێکە کە لە زەمیردا رایدەگرن. هەنووکە ئەو کەسەی کە دەیبینن هەر ئەو دۆستە نیە، ئێوە بیرەوەریی دوێنێتان پێیە کە مداخلە دەکات. کەوابوو، ئیشی ئێمە هەر ئەمەیە، خۆمان خستووەتە گەمارۆی کارو کردەوەو بیرەوەریەکان و ئیتر لە تازەیی‌و نوێبوونەوە هەواڵێك نیە. هەربەم هۆیەوە کە بیرەوەری، ژیان ماندوو، نارەحەت و پووچ دەکات. ئێمە لەبەر ئەوە پێکەوە دوژمنایەتی دەکەین کە "من" و "هی من" لە ڕێگای بیرەوەریەوە بەهێز دەبێت. بیرەوەری بە یارمەتی کردەوە لە ئێستادا، زیندوو دەبێتەوە، ئێمە لە ڕێگای ئێستاوە گیان بە بەر بیرەوەریدا دەکەین، بەڵام ئەگەر بیرەوەری زیندوو نەکەینەوە، بێڕەنگ دەبێت و لە نێو دەچێت. بیرەوەری ڕاستییەکان و کاروباری تەکنیکی، پێویستییەکی



ڕوونە، بەڵام بیرەوەری وەك ڕاگرتنی دەروونناسانە بۆ فامی ژیان و پێکهێنانی پەیوەندیی فکری و هەستیاری، زیان گەیەنەرە.

## ١٨ـ تەسلیم لە بەرامبەر "ئەوەی هەیە"

**پرسیار: چ جیاوازییەك هەیە لە نێوان تەسلیم لە بەرامبەر ئیرادەی خوادا و ئەوەی کە ئێوە دەربارەی قەبووڵکردنی ئەوەی هەیە دەڵێن؟**

**کریشنا مورتی:** گومانێك نییە کە لە نێوان ئەم دووانەدا جیاوازیی گەورە هەیە. تەسلیم بە ئیرادەی خواوەند ئاماژە بەوەی دەکات کە ئێوە لە پێشڕا لە ئیرادەی خوا ئاگادارن. ئێوە تەسلیمی شتێکی نەزانراو نابن، ئەگەر ڕاستی بناسن، ناتوانن تەسلیمی بن، لە ژیان کردن دوا دەکەون، شتێ بە ناو تەسلیم لە بەرامبەر ئیرادەیەکی سەرەوەتر بوونی نیە. ئەوەی کە ئێوە بە ئیرادەی سەرەوەتر ناوی دەبەن و تەسلیمی دەبن،ڕەنگدانەوەی خودی ئێوەیە، لەبەر ئەوە ڕاستی لە ڕێگای زانراوەکانەوە ناناسرێت. ڕاستی تەنیا کاتێ بوون پەیدا دەکات کە ئەوەی زانراوە، نەبێت. زانراوەکان زەینی ئێمە دەیان خولقێنێت، چونکە فیکر، ئەنجامی زانراوەکانی ڕابردووەو فیکر دەتوانێت ئەوە کە دەیناسێت بیخولقێنێت، هەر بۆیە ئەوەی کە دەیناسێت نەمر نیە، هۆیەکەی ئەمەیە کە ئیرادەی خواوەندە کە لە ڕاستیدا تەسلیم بوون بە گشتاندنەکانی خۆیە، لەوانەیە ڕازیبکات و ئارامی بدات، بەڵام ڕاست نیە. فامی ئەوەی هەیە، شێوازێکی دی دەخوازێت، لەوانەیە وشەی "شێواز" وشەیەکی ڕاست نەبێت، بەڵام مەبەستەکەی من ئەوەیە کە فامی "ئەوەی هەیە" لە قەبووڵکردن یان تەسلیم بوون لە بەرامبەر ئیدەیەکەوە، هەم دژوارترەو هەم بە زیرەکی و وشیاری زیاتر پێویستی هەیە. تێگەیشتنی "ئەوەی هەیە" پێویستی بە تێکۆشان نیە، کۆشش جۆرێك وازهێنانە. بۆ فامی شتێك و بۆ فامی "ئەوەی هەیە" ئێوە ناتوانن واز بێنن. ئەگەر بێت و ئەوەی کە ئێوە بڵێن من تێبگەم، ئیتر ناتوانم گوێ لە موسیقاو دەنگە دەنگی خەڵکی دەرەوە بگرم، دەبێت بە تەواوی هۆش‌و هەستم تەرخانبکەم بۆ قسەکانی ئێوە. بۆیە ئاگادار بوون لەوەی هەیە لە ڕادەبەدەر دژوارو گرانە، لەبەر ئەوە، هەر ئەم بیرکردنەوەی ئێمە بۆ خۆی وازهێنانێکە. ئێمە نامانەوێت ئەوەی کە هەیە تێبگەین. ئێمە لە پشت چاوێلکەی دەمارگیری، تاوانبارکردن یان دیاریکردنی شوناسەوە دەڕوانین بۆ ئەوەی هەیەو لابردنی ئەم چاویلکەو ڕاستەوخۆ ڕوانین بۆ "ئەوەی هەیە" کارێکی زۆر دژوارە. بێگومان ئەوەی هەیە، ڕاست و دروستییە و هەرچی تر کە هەیە، دەربازبوونەو ناڕاستە. بۆ

فامی ئەوەی هەیە، ناکۆکی دووانە و دووفاق دەبێت تەواو بێت، لەبەر ئەوە وەڵامی نەرێنی شتێك جگە لە "ئەوەی هەیە" کران و جۆرێ نکۆڵی لە فامی "ئەوەی کە هەیە" یە. ئەگەر بڕیار بێت من لووت بەرزی بناسم نابێت خەریکی لێکۆڵینەوە لە دژەکەی بم، هەوڵدان بۆ کران یان تەنانەت هەوڵی تێکۆشان بۆ فامی ئەوەی هەیە نابێت وازهێنان لای من دروستبکات. ئەگەر من لووت بەرز بم چی روو دەدات؟ ئەگەر من ناو لە لووت بەرزی نەنێم، تەواو دەبێت ماناکەی ئەوەیە کە وەڵامەکە لە خودی مەسەلەکە دایە نە دوور لەو. ❊

گرفت لەسەر قەبوولکردنی "ئەوەی هەیە" نیە، هیچ کەس "ئەوەی هەیە" قەبووڵناکات، ئێوە قاوەیی بوون یان سپی بوونی پێستی خۆتان قەبووڵناکەن. چونکە ئەمە راستییە، تەنیا کاتێ شتی وا قەبووڵدەکەن کە هەوڵتان ئەوە بێت ببن بە شتێك. هەرکە بتوانن راستییەك بناسنەوە، ئیتر مانایەکی نابێت، بەڵام زەین کە فێر بووە تا دەربارەی رابردوو یان داهاتوو بیر بکاتەوە، زەینێ کە فێر بووە تا بەملاو ئەولا دەرباز بێت، زەینێکی وا توانایی نییە "ئەوەی هەیە" تێبگات. بەبێ فامی ئەوەی هەیە، ناتوانن ئەوەی کە راستییە پەیدای بکەن و بەبێ تێگەیشتنێکی لەم چەشنە، ژیان مانایەکی نیە، ژیان خەباتێکە بەردەوام کە لەودا خەم و رەنج و ئازار بەردەوامە. فامی راستی تەنیا لە رێگای فامی "ئەوەی هەیە" مەیسەرە. بەڵام ئەگەر هەر جۆرە تاوانبارکردن یان دیاریکردنی شوناسێك لە گۆڕێدا بێت، فام کردنی مەیسەر نابێت. زەینێکە بەردەوام مەحکووم دەکات یان شوناس دیاریدەکات ناتوانێت فام بکات، وەها زەینێك تەنیا دەتوانێت هەر ئەو شتەی فام بکات کە تێدا گرفتار هاتووە. تێگەیشتنی "ئەوەی کە هەیە"و ئاگاداربوون لە "ئەوەی کە هەیە"، ردۆڵێکی غەریب ئاشکرا دەکات کە لەودا راستی و دروستی، خۆشی و بەختیاری هەیە.

## ١٩ـ دەربارەی دوعا و مراتبە (مێدی تاتسیۆن) MEDITAYION

**پرسیار: ئایا ئارەزووکردنێك کە لە دوعا دەری دەبڕن، رێگایەك بەرەولای خوا نییە؟**

**کریشنا مورتی:** سەرەتا دەبێت ئەو مەسەلانەی کە لەم پرسیارەدا هەیە، لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکەین. پرسیار ئاماژە بە دوعا، لەسەر هەست بوون و تێفکرین دەکات. ئێستا مەبەستی ئێمە لە دوعا چییە؟ بەر لە هەموو شتێ، لە دوعادا جۆرێ پاڕانەوە لە ئەوەی کە خواوەند یان راستی ناو دەنێن، هەیە. ئێوە وەك تاکێك لە ئەوەی کە ناوی خودا دەنێن، داوای پەنادان و یارمەتی و رێنوێنی دەکەن، بەم جۆرە ئێوە بەدوای پاداشت و رازیبوونەوەن. بۆ نموونە کاتێ



گرفتاری دەوڵەتی و تاکیتان هەیە، دەستدەکەن بە دوعاو پاڕانەوە بۆ رێنوێنی کردن یان شێواوو پەرێشانن و داوای هێمنی و ئارامی دەکەن و ئەوەی کە خودای پێ دەڵێن داوای یارمەتی لێدەکەن. ئەم قسە ئاماژە بەوە دەکات کە خواوەند ـ ئێستا خواوەند چییە بەڵای، هەنووکە لەم بارەوە باسناکەین ـ دەبێت ئەو شێواویانەی کە ئێوە و من خولقاندوومانە، چاك بکاتەوە. لە حاڵێکدا ئەمە ئێمەین کە تەواوی ئەم پەرێشانی، بەڵا، ئاڵۆزی، نەبوونی عەشق و زوڵمێك کە مرۆڤ (دەهەژێنێت) مان خولقاندووەو هەنووکە دەمانەوێت تا وا کارەکانمان رێك و پێك بکاتەوە. بە واتایەکیتر دەمانەوێت کەسێکیتر پەرێشانی، بەڵا، خەم و ناکۆکیمان لە نێو ببات، لەویتر دەپاڕینەوە کە شاییو رۆشناییمان بۆ بێنێت. ❊

ئەڵبەت کاتێ بۆ شتێك دوعا دەکەن، تکا دەکەن و دەپاڕینەوە بە زۆر دێتە دی. کاتێ شتێك دەخوازن، وەریدەگرن، بەڵام ئەوەی کە دەیگرن رێکوپێکی دروستناکات، چونکە ئەوەی کە وەریدەگرن، نە پاکەو نە تێگەیشتنێك دروسدەکات. تەنیا کاری رازی کردنەو شەفادان، بەڵام نابێتە هۆی تێگەیشتن، چونکە کاتێ ئێوە داوای شتێك دەکەن هەر ئەو شتەی کە خۆتان بەرجەستەی دەکەن، وەریدەگرن. چۆن دەبێت راستی ـــ خواوەند ـــ داواکاری تایبەتی ئێوە قەبووڵبکات. ئایا ئەوەی کە لەو پەیمانەدا ناگونجێت و وەسفنابێت، دەتوانێت لە چوارچێوەی نیگەرانی، بەڵاو پەرێشانییە هەندەکییەکانی ئێمەدا بێت کە خۆمان دروستمان کردووە؟ دەی ئەوەی دوعا قەبووڵدەکات چییە؟ بێگومان ئەوەی کە لەو پەیمانەدا ناگونجێت، بەوەی کە ناپێورێت و وردو بچووکە، وەڵام ناداتەوە. ئەی چ شتێك وەڵام دەداتەوە؟ لە ساتەوەختێکدا کە دوعا دەکەین بە بەراورد لە ئارامی داین، لە بارودۆخێك داین کە توانایی وەرگرتنمان هەیە، کەوابوو نەستی خودی ئێمە دەبێتە هۆی جۆرێ پاکی کاتی. شتێکمان دەوێت، ئارەزووی دەکەین، لەو چرکەی ئارەزوودا، لەو چرکەیەدا کە دەپاڕێینەوە، بە بەراورد توانایی وەرگرتنمان هەیە. هەستی ئێمە زەینی چاکی ئێمە، بە بەراورد ئارامە، کەوابوو نەست لەودا دەستدەکات بە وەدانی خۆیو ئێمە وەڵامی خۆمان دەگرینەوە. گومانێك نییە وەڵامەکە نە لە لایەن راستییەوەیەو نە لە لایەن ئەوەی کە ناپێورێت، ئەوەی وەڵام دەداتەوە نەستی خودی ئێمەیە. کەوابوو، وەرن رێگا ون نەکەین و هەستنەکەین کە کاتێ بە دوعاکانمان وەڵام دەدرێتەوە، لە پەیوەندی لەگەڵ راستیداین. راستی دەبێت بەرەولای ئێمە بێت، ئێمە ناتوانین بەرەولای ئەو بڕۆین. ❊

لەم مەسەلەی دوعادا هۆکارێکی دیکەش بەشدارە: وەڵامی ئەوەی کە ئێمە پێی دەبێژین داوای دەروون. هەروا کە گوتم، کاتێ زەین دەستدەکات بە پاڕانەوە،بە بەراورد ئارامە، کاتێ

ئێوە گوێ لە داوای دەروونی دەگرن، بە دەنگی خود کە خۆی لە زەینی ئارامدا بەرجەستە کردووە گوێ دەدەن. شتێکی وایش ناتوانێت هاواری راستی بێت. زەینێ کە پەرێشان، نەزان، ئارەزوومەند، خوازیارەو دەپارێتەوە چۆن دەتوانێت راستیو دروستی تێبگات؟ زەین کاتێ دەتوانێت راستی تێبگات کە بە تەواوی ئارام بێت، نە خوازیاری شتێك بێت، نە ئارەزوو بکات و نە تکاو لالانەوەی بێت، چ بۆ خۆی، چ بۆ ولات و چ بۆ ئەوی دی. کاتێ زەین بە تەواوی ئارام بوو و کاتێ ئارەزوو راگیرا، لەو وەزعەدا تەنیا راستی خۆی نیشاندەدات. ئەو کەسەی کە خوازیارەو دەلالێتەوەو تاسەی رێنوێنی کردنی هەیە، ئەوەی بە دوایدا دەگەرێت، بەدەستی دێنێت، بەلام راستی نیە. ئەوەی وەریدەگرێت، وەلامی چینەکانی زەینی ناوشیاری خودی ئەوە کە خۆیان لە زەینی وشیاری ئەودا بەرجەستە دەکەن. ئەو دەنگە لاوازو ئارامەی کە ئەو رێنوینی دەکات، راستی نیە. بەلکو تەنیا وەلامی زەینی ناوشیارە. لەم مەسەلەی دوعاو پارانەوەدا، مەسەلەی **لەسەر هەست بوون** هەیە. بۆ زۆربەی ئێمە **لەسەر هەست بوون** شێوازێی مۆنۆپۆلیستە. **لەسەر هەست بوون** لە رێگای تێکۆشان، زۆر، رێنوێنی و گێراڤەوە پێکدێت و بۆیە بە شێوازێکی مۆنۆپۆلیست دەژمێردرێت. من بەوەی کە بناو مراقبەی پێ دەلێن ئۆگرم، بەلام فیکرم پەرێشانە، کەوابوو زەینم لەسەر وێنەیەك، حالّ و وەزعێکی زەینی یان خەیالێك رادەگرم و بیرەکانی دیکە دەنێمە لاوە. ئەم شێوازەی **لەسەر هەست بوون** کە مۆنۆپۆلیستی لەگەلّ دایە، بە جۆرێ ئامرازی مراقبە دەژمێردێت و ئەمە هەر ئەو کارەیە کە دیکەین. کاتێ دادەنیشین تا خەریکی مراقبە بن، لە خەیالّی خۆتاندا زەینتان لەسەر وشەیەك، یان وینەیەك و هتد راگرتووە، بەلام زەین لە هەموو شوێنێك لەگەران دایە. ئیتر ئیدەو بیرو سۆز بەردەوام خەریکی تێکدان و ئێوە هەولّدەدەن دووریان بکەنەوە، کاتێ ئێوە بە خەباتکردن لە گەلّ فیکرتاندا تێدەپەرێت. بەم رەوشە مراقبە (مێدی تاتسیۆن) دەلێن. بە دەربرینێکی تر ئێوە تێدەکۆشن تا هۆشو هەستیارەکانتان بەرەولای شتێك راکێشن کە حەزتان لێی نییەو بیری ئێوە روو لە زیادبوون دەکەن، بە بەردەوامی زیاد دەبن خەریکی تێکدان دەبن، کەوابوو ئێوە وزەی خۆتان فیدای مۆنۆپۆلیستی لە بەرگری و لە وەلانان دەکەن، ئەگەر ئێوە بتوانن زەینتان لەسەر ئەو بیرەی کە هەلّتان بژاردووە یان لەسەر شتێکی تایبەت بهێلّنەوە، هەستدەکەن کە لانیکەم سەرکەوتنی مراقبەتان بە نسیو بووە. روونە کە ئەمە مراقبە نیە. مراقبە شێوازێکی مۆنۆپۆلیستە ـ مۆنۆپۆلیست لە رووی دووریکردن لە ئایدیا خشۆکەکان و پێکهێنانی خۆراگری لە بەرامبەریاندا ـ نە دوعاو پارانەوە مراقبەیەو نە **لەسەر هەست بوون** کە مۆنۆپۆلیستی رەوشیەتی. ❊



مراقبە چییە؟ **لەسەر هەست بوون** مراقبە نیە، لەبەر ئەوە لە هەر کوێ ئۆگری هەبێت، **لەسەر هەست بوون** لەسەر شتێك بە بەراورد ئاسانە. ژەنرالێك کە پلانی شەر یان کوشتاری خەلّك دادەرێژێت، هۆشو هەستی زۆر لەسەرەو کۆکە. کاسبێ کە داهاتی هەیە هۆشی کۆکەو زۆر لەسەر هەستە. ئەو تەنانەت لەوانەیە بێرەحمیش بێت، هەموو هەست و سۆزێکی بەلاوە بنێت و هەموو هۆش **لەسەر هەست بوون** دابنێت لە پێناو گەیشتن بەو شتەی کە خوازیاریەتی. کەسێ کە ئۆگری بەشتێك هەیە، بە شێوەی سروشتی و خۆبەخۆ **لەسەر هەستە. ئەم لەسەر هەست بوونە**، مراقبە نیە، پاوانخوازی تەواوە. کەوابوو مراقبە چییە؟ مراقبە بێگومان فامینە، مراقبەی دلّ، واتا فام کردن. کاتێ مۆنۆپۆلیستی هەیە، فامین بێمانایە. کاتێ پارانەوەو داخوازی هەیە، چ جۆر دەتوانێت تێگەیشتنیش هەبێت؟ لە تێگەیشتندا ئارامی و ئازادی هەیە، ئازادی لەوەی فامی دەکەن، ئازادی لەوەی ئازاد دەبن. **لەسەر هەست بوونی رووت** یان دوعاکردن فام و تێگەیشتن دروستناکات. تێگەیشتن بنەماو بنچینەی سەرەتایی شێوازی مراقبەیە. پێویست ناکات قسەکانی من قەبوولبکەن، بەلام ئەگەر ئێوە لێکۆلێنەوەی وردو قوولّ لەسەر دوعاو **لەسەر هەست بوون** دەسپێکەن، تێدەگەن کە هیچ کام لەوانە بە تێگەیشتن ناگات، لەوانەیە تەنیا بە کەللەرەق بوون، بە چەسپاندن و بە خەیالّ دەگەن. لە حالێکدا مراقبە ـ مراقبەیەك کە لەودا تێگەیشتن ببێت ـ ئازادی، پاکی و یەکپارچەیی پێکدێنێت.

کەوابوو مەبەستی ئێمە لە تێگەیشتن چییە؟ فام یانێ دانی چەمکی گونجاو بە هەموو شتێ و دانانی بایەخی گونجاو بۆ هەموو شتێ. تێنەگەیشتن یانی دانانی بایەخی هەلّە، نێوەرۆکی سەرەکی گەمژەیی تێنەگەیشتنی بایەخە گونجاوەکانە. کاتێ تێگەیشتن پێکدێت کە بایەخە راستەکان هەبن و بایەخە راستەکان، چەسپاون. چۆن تاك دەتوانێت بایەخە دروستەکان چەسپاو بکات، بایەخە راستەکانی مالکیت، بایەخە راستەکانی پەیوەندین بایەخە راستەکانی خەیالّ؟ بۆ هاتنەدیی بایەخە دروستەکان دەبێت بیرەوەر فام بکرێت. ئەگەر من بیرەوەر کە خۆمم فام نەکەم، ئەوەی کە هەلّی دەبژێرم مانایەکی نابێت، بە واتایەکیتر، ئەگەر من خۆم نەناسم، ئەوا فیکرو پراکتیکی من بە هیچ شێوەیەك بنەماو بنچینەیی نیە. کەوابوو خوناسی دەسپێکی مراقبە یان مێدیتاتسیۆنە. ئەلّبەت نەناسینی کە لە کتێبەکانو رێبەران و پسپۆرانەوە وەردەگیرێت. بەلکو ناسینێ کە لە رێگای لێکۆلێنەوەی تاکی کە نێوی خودئاگاهییە، دێتە بەر. مراقبە سەرەتای خۆناسینەو مراقبە بەبێ خۆناسی واتا هیچ، ئەگەر من لە شێوەکانی هەست و بیری خۆم تێنەگەم، ئەگەر پالّنەرەکان، ئارەزووەکان،

داخوازییەکان و ئۆگری بە سەرمەشقەکانی ئاکار کە هەمان ئایدیاکانن تێنەگەم، ئەگەر خۆم نەناسم، بنەمایەك بۆ بیرکردنەوە نیە، بیرەوەرییەك کە تەنیا لە داواکاری دایە، لە دوعاو پاڕانەوە دایە، یان مۆنۆپۆلیستی گرتۆتەبەرو خۆی فام ناکات، بە ناچار کاری بە پەرێشانی و گومان و خەیاڵ دەگات.

سەرەتای مراقبە، خۆناسییە کە ماناکەی ئاگاداربوون لە یەکەیەکەی تەڤگەڕ، بیرو هەست و ناسینی تەواوی چینەکانی زەینی ناهۆشیارە، نە تەنیا چینەکانی سەرەوە، بەڵکو چالاکییە نهێنییەکانیش کە بە شێوەیەکی قووڵ شاراوەن. بۆ ناسینی چالاکییە زۆر نهێنییەکان، پاڵنەرە شاراوەکان، وەڵامەکان و هەست و بیر، دەبێت زەینی هۆشیاری ئێمە ئارامی هەبێت، بە واتایەکیتر زەینی هۆشیار دەبێت ئارام بێت تا بتوانێت گشتاندنەکانی زەینی ناهۆشیار وەربگرێت. بەشی سەرەوەی زەینی هۆشیار بە چالاکییەکانی رۆژانەی خۆی، گوزەرانی ژیان، فریوی ئەوانیتر، چەوساندنەوەی خەڵك و دەربازبوون لە چنگی گرفتەکان ـــ تەواو چالاکییەکانی بوونی ئێمە ـ سەرقاڵە. ئەم بەشەی سەرەوەی زەین دەبێت مانای راستی چالاکییەکانی خۆی بزانێت و بەم جۆرە بۆخۆی هێمنانی پێکبێنێت.

ئەم کارە تەنیا لە رێگای دابینکردنی رێکوپێکیو یاساو زۆرو دیسیپلینەوە مەیسەر نییە، رێگای گەیشتن بە ئارامیو بێجووڵەی زەین، تەنیاو تەنیا تێگەیشتن لە چالاکییەکانی خۆیە، ئەم کارە لە رێگای چاودێریکردنی چالاکییەکان و ئاگاداربوون لێیان، بە دیتنی بێرەحمییەکانی خۆی، شێوەی قسەکردنی لەگەڵ خزمەتکار، هاوسەر، کچ و دایك و هتد دایە. کاتێ بەشی سەرەوەی زەینی هۆشیار بە تەواوی لەم چالاکییانە ئاگادار بێت، ئەو کاتە لە رێگای ئەم تێگەیشتنەوە گورج و دەسبەجێ ئارام دەبێت، نە خورتیو زۆر سڕی دەکات و نە حەزو ئارەزوو و رێکوپێکی دەکات، ئەوکات دەکەوێتە بارودۆخێکەوە کە نزیکی و دۆستایەتی ئاماژەکانی زەینی ناهۆشیار، ئاماژەی چینە بێ ئەژمارەکانی زەین ـ ئینتیمای رەگەزپەرستانە، بیرەوەری دپۆکراو، ئۆگرییە نهێنییەکان و برینە قووڵە سارێژنەبووەکان ـ قەبوولدەکات، تەنیا کاتێ کە تەواوی ئەمانە خۆیان بەرجەستە بکەن و فام بکرێن و کاتێ کە بار لەسەر شانی هەموو هەستی وشیار لابردرێت و ئیتر هەموو برینەکان و هەموو بیرەوەریەکان لێی دوور بکەونەوە، لەو حاڵەدا، دەکەوێتە هەلومەرجێکەوە کە هەمیشەییو نەمری لە ئامێز دەگرێت.

مێدی تاتسیۆن، خۆناسییەو بەبێ خۆناسی، مێدی تاتسیۆن مانای نییە. ئەگەر ئێوە لە تەواوی وەڵامەکانتان لە هەموو کاتدا ئاگادار نەبن ـ ئەگەر وشیاریتان تەواو نەبێت ـ چالاکییەکانی رۆژانەتان



نەناسن، تەنیا خۆ زیندانی کردن لە ژوورێکداو مژوولی مێدی تاتسیۆن بوون لە بەرامبەر وێنەی رێبەرێك و مورشیدێکدا، هەڵاتنێك زیاتر نییە، چونکە بەبێ خۆناسی، بیرکردنەوەی راست نیەو بەبێ بیرکردنەوەی راست، ئەوەی ئەنجامی بدەن بێمانایە، هەر چەندە نییەتیشتان پاك بێت. کەوابوو دوعاو پاڕانەوەی بێخۆناسی مانای نیە، بەڵام کاتێ خۆناسی هەبێت، بیرکردنەوەی راست و سەرئەنجام کردەوەی راستیش هەیە. کاتێ کردەوەی راست هەبێت، نە پەرێشانی هەیەو نە پاڕانەوەو لالانەوە لەویتر کە ئێوە لە پەرێشانی رزگار بکات. مرۆڤێ کە وشیارە مراقبە دەکات، ئەو خەریکی دوعاو پاڕانەوە نابێت، چونکە شتێکی ناوێت. لە رێگای دوعا، دیسیپلین و دووبارەکردنەوە و کاروباری لەم جۆرە، دەتوانن جۆری ئارامی دروستبکەن، بەڵام شتێکی وا تەنیا ناڕەحەتییە و بەم کارە زەین و دڵی خۆتان تووشی ماندوویی و بێهێزی دەکەن. ئەوەی کە پێی دەڵێن **لەسەر هەست بوون**، سڕکردنی زەینو مۆنۆپۆلیستەو بەڕاستی ناگات. تەواو مۆنۆپۆلیستەکان هەر بەم جۆرەن. ئەوەی کە دەبێتە هۆی تێگەیشتن و فام، خۆناسییە و ئەگەر نیەتی راستیش لە گۆڕێدا بێت، ناسین دژوار نیە. ئەگەر ئێوە ئۆگر بن بە پەیداکردن و خستنەڕووی تەواو رەفتارەکانی خود ـ نە تەنیا بەشە رواڵەتییەکەی، بەڵکو گشت رەفتارەکانی تەواوبوونی خود ـ ئەوا کارئاسانە. ئەگەر بەڕاستی دەتانەوێت خۆتان بناسن، دەبێت خەریکی جوست و جۆی تەواو لە زەین و دڵی خۆتان بن، تا لە نێوەڕۆکیان بە تەواوی ئاگادار بن، کاتێ نیەتی ناسین لەگۆڕێدا بێت، دەیناسن، ئەوکات دەتوانن بێپاساو و مەحکووم کردن یەکەیەکەی جووڵەکانی هەست و بیر تێبگەن. بە تێگەیشتن لە هەر جووڵانێکی هەست و بیر ـــ هەر کە سەر هەڵدەدەن ـ ئێوە ئارامییەك دەخولقێنن کە زۆرەکی نییە و لە ژێر هیچ دیسیپلینێکدا دروستنابێت و تەنیاو تەنیا بدەی نەبوونی گرفت و نەبوونی ناکۆکییە. وەك حەوزێك وایە کە لەو شەوانەدا کە با نیە، هێمن و ئارامە. کاتێ زەین ئارامە، لەو کاتەدا ئەوەی کە لەو پەیمانەدا ناگونجێت، ئاشکرا دەبێت.

## ۲۰ـ دەربارەی زەینی هۆشیار و ناهۆشیار

**پرسیار: زەینی هۆشیار نەزان و لە زەینی ناهۆشیار دەترسێت. ئەوەی کە ئێوە باسی لێوە دەکەن بەگشتی زەینی هۆشیارە، ئایا ئەمە بەسە؟ ئایا شێوازی ئێوە دەبێتە هۆی رزگاری زەینی ناهۆشیار؟ تکایە بە شێوەی بەربەرەکانێی تەواو عەیار لەگەڵ زەینی ناهۆشیاردا باسبکەن.**

**کرشینا مورتی:** دەزانین کە زەینی هۆشیارو زەینی ناهۆشیارمان هەیە، بەڵام زۆربەی ئێمە تەنیا لە ئاستی زەینی هۆشیاردا واتا چینی سەرەوەی زەین کار دەکەین و تەواو ژیانی ئێمە، بەتایبەت هەر بەمە کورت دەبێتەوە. ئێمە لەو جێیێ کە بەناو زەینی هۆشیاری پێ دبێژین ژیان

دەکەین و هەرگیز سەرنج نادەینە زەینی قوولّتری ناهۆشیار کە جاروباریش لە لایەنیەوە نزیکیو دۆستایەتی و ئاماژەش ئاشکرا دەبێت، یان ئەم ئاماژانە سەرنجی نادرێتە یان لە هەمبەریدا رێگر دروستدەبیت یان بە پێی داخوازییە وشیارانەکانی ئەم چرکە تایبەتە شرۆڤەی دەکەین. پرسیاری پرسا ئەمەیە کە: "ئەوەی کە ئێوە باسی لێوە دەکەن بەگشتی زەینی هۆشیارە، ئایا ئەمە بەسە؟" بزانین مەبەستمان لە زەینی هۆشیار چییە؟ ئایا زەینی هۆشیار لەگەڵ زەینی ناهۆشیاردا جیاوازی هەیە؟ ئێمە هۆشیارمان لە ناهۆشیار جیا کردووەتەوە، ئایا ئەمە پاساو هەڵدەگرێت؟ ئایا راستە؟ ئایا وەها جیاوازییەك لە نێوان زەینی هۆشیارو ناهۆشیاردا هەیە؟ ئایا رێگرێکی تایبەت یان هێڵێك کە لەوێدا زەینی هۆشیار تەواو بێت و ناهۆشیار دەستپێبکات هەیە؟ دەزانین کە چینی سەرتری زەینی هۆشیار چالاکە، بەڵام ئایا ئەمە تەنیا ئامرازێکە کە لە تەواوی رۆژدا چالاکە؟*

ئەگەر من تەنیا دەربارەی چینی سەرتری زەین قسەم دەکرد بە دڵنیاییەوە ئەوەی کە ئێستا دەڵێم، بێ قازانج و بێمانا بوو. سەرەڕای ئەمە، فرەیەك لە ئێمە بە وەی کە زەینی هۆشیار قەبوولێکردووە ئاوێزان دەبین، لەبەر ئەوە بۆ زەینی وشیار یەکسان بوون لەگەڵ راستی روون و دیاریکراوەکاندا دژوار نیە، بەڵام ناوشیار لەوانەیە سەرپێچی بکات و بە زۆریش دەیکات. بۆیە لە نێوان ئەوەی کە بەناو وشیارو ناوشیار دبێژن ناکۆنی پێکدێت. *

کەواتە گرفتی ئێمە ئەمەیە. لەڕاستیدا تەنیا حاڵەتێك هەیە، نە دوو حاڵەتی هۆشیارو ناهۆشیار. ئەوەی هەمانە تەنیا حاڵەتێکی بوونە کە ناوی هۆشیارە، گەرچی لەوانەیە ئێوە ئەوە بە هۆشیارو ناهۆشیار دابەشبکەن، بەڵام ئەم زەینە وشیارە هەمیشە پەیوەندی بە رابردووەوە هەیە، نە ئێستا. زانیاری ئێمە تەنیا دەربارەی ئەو شتانەن کە لە رابردوودان. ئێوە دەمێك دواتر لەوەی کە من دەڵێم ئاگادار دەبن، جیا لەمەیە؟ ئێوە زانیاریتان دەربارەی هەنووکەو هەر ئێستا نیە. ئاگاداری دڵ و زەینی خۆتان بن تێدەگەن کە خودئاگاهی لە نێوان رابردوو و داهاتوودا مژولی چالاکییەو ئێستا، تەنیا رێگایەکە لە رابردووەوە بۆ داهاتوو. کەواتە خودئاگاهی تەڤگەرێکە لە رابردووەوە بۆ داهاتوو. *

ئەگەر لە کاتی ئیشکردندا سەرنجی زەینی خۆتان بدەن، دەزانن کە جوولە بۆ داهاتوو و بۆ رابردوو رێچکەیەکە کە لەودا ئێستا نیە. یان رابردوو ئامرازی هەڵاتنە لە چنگی ئێستا کە وێدەچێت مایەی خۆشی نەبێت. یان داهاتوو هیوایەکە لە رانەبردوو دوور کەوتووەتەوە. کەواتە زەین یان بە رابردوو، یان بە داهاتوو داگیر کراوەو زەمانی رانەبردوو دوور دەخاتەوە. بە دەربڕینێکیتر، رابردوو زەنیی مەرجی کردووەتەوەو ئەوی بە شێوەی هیندی، بەرەهێماییو



نابەرەهێمایی، مەسیحیو بوودایی و هتد دەرهێناوەو ئەم زەینە مەرجدار بووە خۆی لە داهاتوودا بەرجەستە دەکات، بۆیە هەرگیز ناتوانێت بە شێوەی راستەوخۆو عادڵانە بۆ هیچ راستییەك بڕوانێت. یان راستی تاوانبار کردوە و رەتی کردوەتەوە، یان قەبووڵی کردوە و خۆی لەگەڵی هاوشێوە دەکات. زەینێکی وا بێگومان توانایی دیتنی هیچ راستییەکی وەك راستی نیە. ئەم حاڵەتە شعووری ئێمەیە، شعوورێ کە بە یارمەتی رابردوو مەرجی کراوەو فیکری ئێمە وەڵامی مەرجی کراوە بە کێشەی راستییەك. هەرچی زیاتر لەسەر بنەمای مەرجیکرانی باوەڕ یان رابردوو وەڵام بدەنەوە، زیاتر بۆ بەهێزکردنی رابردوو هەنگاوتان هەڵگرتووە.

وزەدان بە رابردوو بێگومان بەردەوام بوونی خودی ئەوە، یانێ هەر ئەو شتەیە کە پێی دەڵێن داهاتوو. ئەرێ، ئەمە حاڵەتی فکرو شعووری ئێمەیە، پاندۆڵێکە لە نێوان رابردوو و داهاتوودا هاتوچۆ دەکات. ئەمە شعووری ئێمەیە، شعوورێ کە نە تەنیا لە چینەکانی سەرەوەی زەینی ئێمە دروستکراوە، بەڵکو چینە قووڵەکانی زەینیشی تێدایە، لەبەر ئەوە شتێکی جگە لەم جووڵەی بۆ پێشەوەو دواوە نیە. *

ئەگەر بەوردی سەرنج بدەن، دەیبینن کە جووڵەیەکی بەردەوام نیە، بەڵکو مەودایەکە لە نێوان دوو فیکردا، ئەگەرچی لەوانەیە لە بەشێکی بێئەندازە بچووك، بۆ نموونە لە چرکەیەکدا پێك هاتبێت، بەڵام مەودایەکە کە لە ریتمی پاندۆڵدا بایەخی هەیە. ئێمە ئەم راستییەی کە رابردوو دەبینین، رابردوویکە لە داهاتوودا بەرجەستە بووەو زەینی ئێمەی مەرجدار کردووە، دەبێت هەر ئەو چرکەی کە رابردوو قەبووڵدەکەن، داهاتووش قەبووڵبکەن، لەبەر ئەوە ئەم دوو حاڵەتە لە ژێر ناوی رابردوو و داهاتوودا بوونیان نیەو ئەوەی هەیە حاڵەتێکە و بریتییە لە وشیارو ناوشیار، واتا هەم رابردووی بەکۆو هەم رابردووی تاکی. رابردوو بەکۆو تاکی لە وەڵامدانەوە بە ئێستا، وەڵامی دیاریکراو دەداتەوە کە پێکهێنەری وشیاری تاکە، کەواتە وشیاری بەرهەمی رابردووە و ئەمە نەخشەی گشتی دەروونی ئێمەیە. هەر کە رابردووتان هەبوو، بە ناچار داهاتووشتان دەبێت، چونکە داهاتوو تەنیا بەردەوام بوونی رابردووی هاوسەنگ کراوە، بەڵام هێشتا رابردووە، کەواتە گرفتی ئیمەیە کە چۆن لەم رەوتەی رابردوودا بە بێ پێکهێنانی مەرجیکرانێکی ترو رابردوویەکیتر گۆڕانێك دروستبکەین.

بە دەربڕینێکی تر، گرفت ئەمەیە: زۆربەی ئێمە شێوەیەکی تایبەتی مەرجی کران دوور دەخەینەوەو بە شێوەیەکی دیکە، روو دەنێین لە مەرجی کرانێکی بەرینتر، گرنگتر یان دڵگیرتر. لە مەزهەبێکەوە دەڕۆین بۆ مەزهەبێکی تر، فۆرمێکی باوەڕ رەتدەکەینەوەو باوەڕێکی دی

قەبووڵدەکەین. ئەم جۆرە لە جێی یەکتر دانانە، بێگومان شارەزایی لە دونیا ــ دونیایەك کە پەیوەندیە ـ نیە. گرفتی ئێمە ئەمەیە کە چۆن لە چنگی تەواو مەرجیکرانەکان رزگار بین. قسەی ئێوە یان ئەمەیە کە شتی وا مەیسەر نییە و زەینی هیچ مرۆڤێك ناتوانێت لە ژێر باری مەرجیکران بێتە دەرەوە یان کاری تاقیکردنەوە، تاقیب و خستنەڕوو دەسپێدەکەن. ئەگەر بڵێن کە شتی وا مەیسەر نیە، بێگومان لە خولی کێبەکێ دەکرێنە دەرەوە. وتەی ئێوە لەوانەیە لەسەر بنەمای ئەزموونی سنووردار یان بەرین، یان لەسەر بنەمای قەبووڵکردنی باوەڕێك بێت. بەڵام ئەم داوایە نکۆڵی لە تاقیب کردن، توێژینەوە، پرسو جۆو ئاشکراکردنە. بۆ ئەوەی کە تێبگەین ئایا تەواو رزگاربوونی زەین لە تەواوی مەرجیکرانەکان مەیسەرە یان نا، دەبێت لە تۆڕی تاقیب و ئاشکراکردن ئازاد بین.

رای من ئەوەیە کە ئازادی لە تەواوی مەرجیکرانەکان بە دڵنیاییەوە مەیسەرەو قەبووڵکردنی ئوتریتەی منیش پێویست نیە. ئەگەر ئوتوریتەی کەسێك قەبووڵبکەن، هەرگیز بە مکاشفە ناگەن، ئەوەش لە جیاتی دانانێکی ترە و شتێکە ناڕوون. کاتێ من قسە لە مەیسەربوون دەکەم، هۆکارەکەی ئەوە نییە کە بۆ من ئەو مەسەلە راستییەکەو من دەتوانم بە شێوەی زارەکی بە ئێوەی نیشانبدەم. بەڵام ئەگەر وا بڕیار بێت کە خۆتان راستی پەیدا بکەن، دەبێت تاقیبکەنەوەو دەسبەجێ، شوێنی بگرن. تێگەیشتنی شێوازی گشتی مەرجیکران لە رێگای راڤەکردن یان دەروون روانییەوە نایەتە دی، لەبەر ئەوە هەر کە راڤەکار بێتە مەیدان، خودی ئەم راڤەکارەش دەبێت بە بەشێك لە رابردووی زەینی، کەوابوو راڤەکردنەکەی بایەخێکی نیە. ئەمە راستییێکە و دەبێت لە زەینی خۆتان بیکەنە دەرەوە. راڤەکارێ کە خەریکی توێژینەوە دەبێت، شتێك کە بۆی دەڕوانێت، راڤەی دەکات، خۆی بەشێکە لەحاڵەتی مەرجی کرانە و هەر بۆیە راڤە و تێگەیشتنی ئەو هەرچی بێت دیسان بەشێکە لە رابردووی زەینی. کەواتە رێگە دەربازبوونێك نییە و دەبێت رابردووی زەینی لە نێو ببەین، چونکە بۆ ئەوەی کە هەستینەوە بۆ خەباتکردن لە بەرامبەر شتی تازەدا، دەبێت زەین تازە بێت. بۆ گەیشتن بەڕاستی، پەروەردگار یان هەرچی کە ناوی دەنێن، زەین دەبێت تەڕو تازە بێت و بەدەستی رابردوو پیس نەبووبێت. راڤەی رابردوو، گەیشتن بە ئەنجامێك لە رێگای زنجیرەیەك تاقیکردنەوەوە، ئیدەعاکردنەکان و دوورکردنەوەکان و شتانی لەم جۆرە لە بنەڕەتدا ئاماژە بە بەردەوام بوونی رابردووی زەینی بە شێوەی جۆراوجۆر دەکات. کاتێ بەڕاستی ئەو راستییەتان زانی، تێدەگەن کە کاری راڤەکار کۆتایی پێ هاتووە. کەواتە،



شتێك جگە لە رابردووی زەینی نامێنێتەوە ـ رابردووی زەینی کە ناوی دیکەی فیکرە ــ فیکرێ کە وەڵامی زەینی هۆشیارو ناهۆشیاری تاك و کۆیە.

زەین بەرهەمی رابردووە، رابردوویەك کە شێوازی مەرجیکرانە، بەڵام زەین چۆن دەتوانێت ئازاد بێت؟ بۆ رزگاربوون، زەین دەبێت نە تەنیا هاتوچۆی وەك پاندۆڵ نێوان رابردوو و داهاتوو ببینێت، بەڵکو لە مەودای نێوان دوو فیکریش ئاگادار بێت. ئەم مەودایە کاتییە، لە رێگای هۆکاری وەك هۆو بەرهۆ، حەزو مەیلو یا زۆرەوە دروستنابێت.

ئەگەر بە تێڕامانی زۆرەوە بڕوانن، دەبینن کە گەرچی وەڵام یان جووڵانی فیکر، زۆر خێرا دێتە بەرچاو، بەڵام نێوان بیرکردنەوەکان مەودایەك هەیە. نێوان دوو بیرکردنەوە ماوەیەکی بێدەنگی هەیە کە پەیوەندی بە شێوازی بیرکردنەوەوە نیە. ئەگەر ورد بینەوە دەبینین کە ئەم مەودایە پەیوەندی بە زەمانەوە نییە و پەیداکردنی ئەم مەوداو ئەزموون کردنی تەواوی، ئێوە لە شەڕی مەرجیکران رزگار دەکات، یان باشتر بڵێم "ئێوە" رزگار ناکات، رزگاری لە چنگی مەرجیکران روو دەدات. کەواتە، تێگەیشتنی شێوازی بیرکردنەوە، ناوی مراقبەیە. ئێمە هەنووکە نە تەنیا دەستمان بە باس دەربارەی پێکهاتەو شێوازی بیرکردنەوە کردووە، بەڵکو لە بیری ئەوە داین کە ئایا زەین دەتوانێت خۆی لە تۆڕی پێشینە رزگار بکات یان نا؟ ئەنجامی ئەم کارە تەنیا کاتێ مەیسەرە کە زەین نەبێتە هۆی بەردەوام بوونی فیکرو ئارامییەکی خۆ ویست پەیدا بکات و پەیوەندی هۆو بەرهۆیشی نەبێت.

## ٢١ـ دەربارەی سێکس SEX

**پرسیار: ئێمە سێکس وەك پێویستییەکی حاشاهەڵنەگری جەستەیی و رۆحی دەناسین و واوێدەچێت هۆکاری سەرەکی ئاڵۆزی لە ژیانی تایبەتی نەسڵی ئەمڕۆی ئێمەدا بێت. چۆن دەکرێت لەگەڵ ئەم مەسەلەدا بەرەوڕوو ببیتەوە؟**

**کریشنا مورتی:** بۆچی بە هەرچی دەگەین گرفتێکی لێ ساز دەکەین؟ لە خوا گرفتمان ساز کردووە، لە عەشق گرفتمان ساز کردووە، پەیوەندی، ژیان، سێکس هەموو بوونەتە گرفت، بۆچی؟ بۆچی ئەوەی ئەنجامی دەدەین گرفت و ترسە؟ بۆچی دەبێت ئازار بکێشین؟ بۆچی سێکس بووە بە گرفت؟ بۆچی دەبێت تەسلیمی ئەم ژیانە پڕ گرفتە بین، بۆچی بەم وەزعە کۆتایی ناهێنین؟ بۆچی لە جیاتی ئەوەی کە گرفتەکانی خۆمان هەر رۆژ لەملا بۆ ئەولا ببەین بە هەبوونی یان کۆتایی ناهێنین؟ سێکس، ئەڵبەت پرسیارێکی بەجێیە، بەڵام پێش لەوە دەبێت پرسیارێك بکرێت: بۆچی

ژیانمان گۆڕیوە بۆ گرفت؟ کارکردن، سێکس، بەدەستهێنانی پارە، بیرکردنەوە، هەستکردن، ئەزموون ـ دەزانن تەواو مەسەلەکانی ژیان ـ کراوە بە گرفت، بۆچی؟ ئایا لە بنەڕەتدا لەبەر ئەوە نییە کە ئێمە لە روانگەیەکی تایبەت بە بۆچوونێکی نەگۆڕەوە بۆ مەسەلەکان دەڕوانین؟ ئێمە هەمیشە لە ناوەندێکەوە بۆ دەوروبەرمان دەڕوانین، بەڵام بۆ زۆربەی ئێمە دەوروبەر لە ناوەند دایە، کەوابوو دەست بۆ هەرچی دەبەین، رووکەش و رواڵەتییە، بەڵام ژیان رواڵەتی نیە. ژیان کردن دەبێت بە شێوەی تەواو بێت، بەڵام لەبەر ئەوەی ژیانی ئێمە رواڵەتییە، ئێمەش تەنیا دژکردەوە رواڵەتییەکان دەناسین. کەواتە هەرچی لە دەوروبەردا ئەنجامەدەدەین، بە ناچار گرفت دروستدەکات، ئەمە ژیانی ئێمەیە. بەڕواڵەت ژین دەکەین و بەم جۆرە ژیانە و هەموو رواڵەتی بوون و گرفتارییەکانیشیەوە قانع و رازین ـ ئەڵبەت تا کاتێ کە ژیانی ئێمە رواڵەتی و کەنارییە، یانێ پشتمان بە "من"و پاڵنەرەکانی بەستووە ـ شتێ کە دەکرێت شێوەی دەرەوەیی پێ بدەیت و تەجریدی بکەیت، شتێ کە دەکرێت لەگەڵ دونیاو وڵات و شتانی دیکەی دەستکردی زەین هاوشێوە بکرێت ـ گرفت دەمێنێت. تا کاتێ کە لە چوارچێوەی زەیندا دەژین، پێچاوییەکان و گرفتەکان بوونیان هەیە، ئەمە هەمووی ئەو شتەیە کە دەزانین. زەین یانێ هەست، یانی ئەنجامی هەستی پاشەکەوتکراو و دژکردەوەکان و ئەوەی کە دەستی زەینی پێ بگات، بە ناچار دەبێتە هۆی بەڵاو پەرێشانی و دەبێتە گرفتێکی بێکۆتایی. زەین ـ زەینێ کە وەك ماشێن شەوو رۆژ، هۆشیارو ناهۆشیار، سەرقاڵی کارە ـ لەبەر گرفتەکانی ئێمە شێوەی راستی بەخۆوە گرتووە. زەین رواڵەتیترین شتی دونیایەو ئێمە نەسڵە یەك لە دوای یەکەکان ژیانی خۆمان فیدای پەروەردەکردنی کردووە، کارێکمان کردووە کە ئەو بەهۆشتر، زیرەکتر، ناڕاستترو فێڵبازتر ببێت، هەموو ئەو شتەی کە لە یەکەیەکەی چالاکییەکانی ژیانی خۆماندا بە چاو دەیبینین. زەینی ئێمە بە شێوەی سروشتی دەیەوێت لە دروستکاری پاك بێت و فێڵباز، توانایی رووبەڕوو بوونەوەی لەگەڵ راستییەکاندا نییە و ئەمە هەر ئەو شتەیە کە گرفت دەخولقێنێت، ئەمە هەر ئەو شتەیە کە خودی گرفتە * مەبەستی ئێمە لە گرفتی سێکسی چییە؟ ئایا کردەوەیە یان فیکر دەربارەی کردەوە؟ بە دڵنیاییەوە کردەوە نیە. کردەوەی سێکس شتێکە لە ئاستی خواردندا، سەختتر لەو نیە. بەڵام ئەگەر لەبەر ئەوەی فیکرێکی دیکەتان نیە، شەو و رۆژ دەربارەی خواردن بیر بکەنەوە، ئەوا خواردنیش بۆتان دەبێت بە گرفت. کەوابوو ئەوەی گرفت خولقێنە خودی گرفتی سێکس نیە، بیرکردنەوە لەبارەیەوە، وایە. بۆچی دەربارەی بیر دەکەنەوە؟ بۆچی لە زەینی خۆتاندا



دروستیدەکەن؟ بەڵێ، ئەمە کارێکە کە دەیکەن. سینەما، گۆڤار، چیرۆکەکان، جۆری پۆششی ژنان و هەموو شتێکی زەینی ئێوە ئامادەی سێکس دەکات. بۆچی زەین ئەوە لە خۆیدا دروستدەکات؟ بۆچی بەڕاستی زەین دەربارەی سێکس بیر دەکاتەوە؟ بۆچی؟ بۆچی ئەمە لە ژیانی ئێمەدا بووە بە گرفتێکی سەرەکی؟ لە حاڵێکدا ئەم هەموو گرفتە هەیە کە دەخوازن و دەپاڕێنەوە ئێوە سەرنجیان بدەن، بۆچی ئێوە هەمووی فیکرتان بۆ سێکس تەرخاندەکەن؟ چی بووە، بۆچی زەینی ئێوە ئەوەندە بە سێکسەوە سەرقاڵ بووە؟ هۆکارەکەی ئەوەیە کە ئەم کارە دەربازبوونێکی یەکجاری و رێگایەك بۆ خود لە بیرچوونەوەی تەواوە. لەو حاڵەدا، لانیکەم لەو چرکەدا، دەتوانن خود لە بیر ببەنەوەو رێگایەکی دیکەشتان بۆ لە بیربردنەوەی خود نیە. هەرکارێکیتر لە ژیاندا بیکەن، جەغدکردنێکە لەسەر "من"و لەسەر "خود". کار، مەزهەب، ئەوەی دەیپەرستن، رێبەران، کاری سیاسی و ئابووری، هەڵاتنەکان، چالاکی چڤاکی، پەیوەندیکردنی ئێوە بە حیزبێکەوەو فیکری حیزبێکی دیکە، هەر هەمووی "من" بەهێز دەکات و تەئکید لەسەری دەکات. بە دەربڕینێکی تر، تەنیا کردەوەیەك هەیە کە لەودا جەغدکردن لەسەر "من" نییە و هەر ئەمە گرفت دروستدەکات. کاتێ تەنیا شتێك لە ژیانی ئێوەدا هەیە کە رێگایەك بۆ هەڵاتنی یەکجاری، خود لە بیرچوونەوەی تەواو ـ تەنانەت ئەگەر بۆ چەند چرکەش بێت ـ دەکاتەوە، ئاویزانی دەبن، چونکە ئەمە تەنیا چرکەی خۆشی ئێوەیە. دەست بۆ هەر مەسەلەیەکی دیکە ببەن، دەبێت بە مۆتەکەو سەرچاوەی ئازارو خەم. کەوابوو روو دەنێن لە تەنیا شتێك کە خود بە تەواوی لە بیر ئێوە دەباتەوەو ئێوە ناوی خۆشی لەسەر دادەنێن. بەڵام کاتێ رووی لێ دەنێن، ئەویش دەبێت بە مۆتەکەیەك، چونکە دەتانەوێت لە چنگی ئەویش رزگار بن و ناتانەوێت ببنە کۆیلەی. کەوابوو دووبارە لە زەینی خۆتاندا خەریکی داهێنانی ئایدیایەکیتر دەبن کە ناوی داوێن پاکیو دووری کردن لە سێکسی لەسەر دادەنێن و هەوڵدەدەن داوێن پاك و دوور لە گرفتی سێکس بمێننەوە، ئەڵبەت ئەم کارە لە رێگای سەرکوتەوە روو دەدات کە بە دەستی زەین و بە مەبەستی دابڕانی خود لە راستی جێبەجێ دەکرێت. ئەمەش جەغدی تایبەت لەسەر "من"ە کە هەوڵی ئەوەیە ببێت بە شتێك و دیسان ئێوە دیلی داوی رەنج، گرفتاری، تێکۆشان و خەم دەبن. * تا کاتێ کە زەین ـ ئەو زەینەی کە دەربارەی گرفتەکە بیر دەکاتەوە ـ نەناسن، سێکس گرفتێکی لە رادەبەدەر دژوارو پێچاوی دەبێت. خودی کردەوەکە هیچ کات گرفت نیە، بەڵام بیرکردنەوە دەربارەی، گرفت دەخولقێنێت.

ئەنجامدانی ئەو کردەوە یان بە شێوەی ژیانی بەرەڵاییە یان تەسلیم بوونە بە ژیانی هاوبەش، بەڵام بە دڵنیاییەوە گرفت کاتێ چارەسەر دەبێت کە ئێوە تەواوی رەوش‌و پێکهاتەی "من"و "هی من"، وەك هاوسەری من، منداڵی من، دارایی من، ماشێنی من، سەرکەوتنی من و دەسکەوتی من بناسن و تا کاتێ کە ئێوە هەمووی ئەمانە چارەسەر نەکەن، سێکس وەك گرفتێك دەمێنێتەوە. تا کاتێ کە مەزنخواز بن ـ چ بە شێوەی سیاسی، چ مەزهەبی‌و چ بە هەر شێوەیەکیتر ـ تا کاتێ کە ئێوە لەسەر خودی بیرەوەرو ئەو کەسەی ئەزموون دەکات جەغد دەکەن و لە رێگای مەزنخوازییەوە ـ چ بە ناوی خۆتانەوە وەك تاك و چ بە ناوی وڵات یان حیزب یان ئایدیایەك کە مەزهەبی پێ دەڵێن ـ خۆراکی پێدەدەن، تا کاتێ کە ئەم چالاکییەی بەرفراوان کردنەی خود، هەیە، گرفتی سێکس دەست لە یەخەمان هەڵناگرێت. لە لایەك ئێوە خود دەخولقێنن، خۆراکی پێدەدەن و بەرفراوانی دەکەن، لە لایەکی دی هەوڵتان ئەوەیە کە خود لە بیر ببەنەوەو بۆ چرکەیەکیش کە بووە خود بکەنە دەرەوە. چۆن ئەم دووانە دەتوانن پێکەوە بن؟ ژیانی ئێوە جۆرێ ناسازگارییە، جۆرێ جەغدە لەسەر "من"و جۆرێ لە بیربردنەوەی "من". سێکس گرفتی ئێمە نیە، گرفت، ئەم ناکۆکییەیە کە لە ژیانی ئێمەدا هەیەو ئەم ناکۆکییە جۆرێکە کە زەین ناتوانێت لێی دەرباز ببێت، لەبەر ئەوە خودی زەین شتێ جگە لە ناکۆکی نیە. تەنیا کاتێ ئەم ناکۆکییە دەدۆزرێتەوە کە بکرێت رەفتاری گشتی ژیانی رۆژانە تێبگەیت. رۆیشتن بۆ سینەماو سەیرنەکردنی دیمەنی ئەو ژنانەی کە دێنە روو، خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی کە فیکر دەورووژێنن و ئەو گۆڤارانەی کە وێنەی نیوە رووتی ژنانی تێدایە، شێوازی روانینی خەڵك بۆ ژنان، ئەو روانینە نهێنیانەی کە لەگەڵ روانینەکانی ئێوەدا لێکدەدەن، هەر هەمووی زەین لەو رێگایانەوە کە بە لارێگا دەبەن، هاندەدەن تا جەغد لەسەر "خود" بکەین و هەر لەو حاڵەدا هەوڵمان ئەوەیە کە خاوەنی میهرەبانی، عەشق و دڵنەرمی بین. ئەم دووانە پێکەوە سازگارییان نیە. مرۆڤێ کە ـ چ لە لایەنی ئەخلاقی‌و چ لایەنەکانی دیکە ـ مەزن خوازە، هەرگیز ناتوانێت گرفتی نەبێت، چونکە گرفت کاتێ کۆتایی پێ دێت کە "خود" لە بیر بچێتەوەو "من بوونی دەرەکی نەبێت و ئەم بارودۆخەی نەبوونی خود شتێکی خۆ ویست یان دژکردەوەیەکی رووت نیە. کۆششی زەینی بۆ چارەسەرکردنی گرفت، تەنیا گرفتەکە ئاڵۆزتر، پڕدەردی سەرترو بەئازارتر دەکات. کردەوە، گرفت نیە، گرفت، زەینە، زەینە کە دەڵێت لە کردەوەی دیکەدا داوێن پاکی ببێت. داوێن پاکی پەیوەندی بە زەینەوە نیە. زەین تەنیا دەتوانێت چالاکییەکانی خۆی سەرکوت بکات و سەرکوت، داوێن پاکی ناژمێردرێت. داوێن پاکی خۆپارێزی نیە، داوێن پاکی پەروەردە ناکرێت. مرۆڤێ کە خاکەڕایی



پەروەردە دەکات بێگومان مرۆڤێکی بێ‌فیز نیە، لەوانەیە کە ئەو فیزی بێ‌فیزی ناو بنێت، بەڵام کەسێکە لووت بەرزو هۆی ئەوەی کە بەدوای خاکەڕاییەوەیە، هەر ئەمەیە. لووت بەرزی، نابێتە بێ‌فیزی و داوێن پاکی پەیوەندی بە زەینەوە نیە، ئێوە دەتوانن ببنە داوێن پاك. ئێوە کاتێ بە داوێن پاکی دەگەن کە ئەڤین هەبێت و ئەڤین، نە بەرهەمی زەینەو نە هیچ پەیوەندییەکیشی پێوە هەیە.

کەواتە گرفتی مەسەلەی سێکس کە خەڵکانێکی بێ‌ژمار لە دنیادا ئازار دەدات، تا کاتێ کە زەین فام نەکەین، چارەسەر نابێت. ئێمە ناتوانین بیرکردنەوە کۆتایی پێ بێنین مەگەر ئەوەی کە ئەوەی بیر دەکاتەوە نەبێت و ئەم کارەش تەنیا کاتێ مەیسەرە کە رەفتاری گشتی فام بکرێت، ترس کاتێ دروسدەبێت کە لە نێوان بیرو بیرەوەردا جیایی هەبێت، کاتێ بیرەوەرێك نەبێت، ئەوا ناکۆکییەك لە نێوان بیردا نابێت. ئەوەی کە روونەو پێویستی بە کۆشش بۆ فامین نیە، ئەمەیە کە بیرەوەر بیر دروستیدەکات، ئەوجا ئەم بیرەوەرە بۆ فۆرم دان بە خۆی و بۆ کۆنترۆڵی بیری خۆی یان کۆتایی پێهێنانیان، زەخت دەخاتە سەر خۆی. بیرەوەر بوونێکی دەست سازو بەرهەمی گومان و خەیاڵی زەینە. کاتێ فیکر وەك راستییەك فام بکرێت، ئیتر پێویستییەك بە تێفکرین دەربارەی راستی نابێت. ئەگەر جۆرێ وشیاری سادەی بێ‌هەڵبژاردن هەبێت، ئەوەی کە دەروونی‌و ناڕوونە، بەرەبەرە خۆی ئاشکرا دەکات. سەرئەنجام فیکر وەك راستی بە کۆتایی دەگات. ئەوکات دەزانن ئەو گرفتانەی کە زەین و دڵی ئێوە دەخۆن و ئەو گرفتانەی کە لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ئێمەوە سەرچاوە دەگرن، چارەسەر دەبن. ئەو کاتە سێکس ئیتر نابێتە گرفتێك، شوێنی شیاوی خۆی دبێت و ئیتر نە شتێ پاکەو نە شتێ ناپاك. سێکس شوێنی شیاوی خۆی هەیە، بەڵام کاتێ کە زەین شوێنێکی لە پێشدا دەستنیشانکراوی پێدەدات، دەبێت بە گرفت. زەین لەبەر ئەوە بە سێکس شوێنێکی لە پێشدا دەستنیشانکراو دەدات کە ناتوانێت بەبێ چەشنێك خۆشی ژیان بکات و بەم شێوە سێکس دەبێتە گرفت. کاتێ زەین لە تەواوی رەفتارەکانی خۆی شارەزایی پەیدا بکات و هەر بەم شێوەیەش بە کۆتایی بگات، لەو شێوەدا تێفکرین رادەوەستێت، ئیتر داهێنان دروستدەبێت و هەر ئەم داهێنانەش دەبێتە هۆی خۆشحاڵی ئێمە. لە بوونی ئەم وەزعە داهێنەرەدا، چەشنێك شایی‌و شەوق هەیە، چونکە خۆ لە بیر چوونەوەیە، خۆ لە بیرچوونێك بەبێ دژکردەوە لە لایەن خودەوە. ئەمە وەڵامێکی تەجریدی بە مەسەلەی سێکس نیە، تەنیا وەڵامە. زەین نکۆڵی لە ئەڤین دەکات و بە بێ ئەڤین، داوێن پاکی نیە، سوودمەندنەبوون لە ئەڤین بۆ ئێمە لە سێکس گرفت ساز دەکات.

## ٢٢ـ دەربارەی ئەڤین

**پرسیار: مەبەستی ئێوە لە ئەڤین چییە؟**

**کریشنا مورتی:** دەمانەوێت لە رووی تێگەیشتنەوە بزانین کە چ شتێك ئەڤین نیە، چونکە لەبەر نەناسراوبوونی ئەڤین، ئێمە دەبێت لە رێگای دوورکردنەوەی نەناسراوەکانەوە پێی بگەین. نەناسراوەکان ناکرێت بە زەینێك کە لێوان لێو لە ناسراوە، بناسرێت. ئەوەی کە ئێمە دەمانەوێت ئەنجامی بدەین ئەمەیە کە لە بایەخی نەناسراوەکان تێبگەین، بە وردی سەرنجیان بدەین و کاتێ کە راست و دروست و بێتاوانبار کردن سەیرمانکردن، ئەوا زەین لە ناسراوەکان ئازاد دەبێت، ئەوجا زاتی ئەڤینمان بۆ دەردەکەوێت. کەواتە دەبێت بە شێوەیەکی نەرێنی لە ئەڤین نزیك ببینەوە نە ئەرێنیێ. * زۆربەی خەڵك دەربارەی ئەڤین بۆچوونیان چۆنە؟ کاتێك دبێژین یەکێکمان خۆش دەوێت، مەبەستمان چییە؟ مەبەستمان ئەوەیە کە ئێمە خاوەن ئەو کەسەین، لەم خاوەنداریەتییە، حەسوودی بردن سەرهەڵدەدات، چونکە ئەگەر ئەوە لەدەست بدەم، هەستدەکەم پووچم و خۆم ون کردووە، بۆیە بەم خاوەنداریەتییە شێوەی یاسایی دەدەم و ئەو (ژن یان پیاو) داگیر دەکەم. لە داگیرکردن و خاوەنداریەتی ئەم تاکە، حەسوودی بردن، ترس و ناکۆکیی بێئەژمار سەرهەڵدەدات. بێگومان ئەم جۆرە خاوەنداریەتییە ئەڤین نیە، ئێوە چۆن بیر دەکەنەوە؟

گومانێك نییە کە ئەڤین، سۆز نیە. سۆزداربوون ناوی ئەڤین نیە، چونکە ئەم دۆخانە هەستێك زیاتر نین. تاکێکی مەزهەبی کە لەبەر مەسیح یان کریشنا، لەبەر مورشیدەکەی یان کەسێکیتر گریان و پاڕانەوە بەرێ دەخات ـ تاکێکی سۆزدارو هەستیارە. ئەو خۆی بە دەست هەستێکەوە دەدات کە پرۆسەیەکە لە خەیاڵ و خەیاڵیش ئەڤین نیە. خەیاڵ، بەرهەمی سۆزە، کەواتە کەسێکە سۆزدارو هەستیارە، رەنگە ئەڤین نەناسێت. هەستیاربوون یان سۆزداربوون تەنیا شێوەیەك لە بەرفراوان کردنی خودە. کەیل لە سۆزبوون، ئەڤین نیە. لەبەر ئەوە کاتێك بە هەستی کەسێکی هەستیار وەڵام نەدەنەوە، کاتێ شوێنێك بۆ دەربڕینی هەستی نەبێت، لەوانەیە هەر ئەم کەسە ببێتە زەلامێکی زاڵم. تاکێکی هەستیار دەکرێت دنە بدرێت و وادار بە شەڕو کوشتاریشی بکەیت. لە دەروون تاکێکی هەستیاردا کە بۆ باوەڕ فرمێسك دەرێژێت، دڵنیابن کە ئەڤین جێگایەکی نیە. *

ئایا بەخشین ئەڤینە؟ لە بەخشیندا چ شتێك شاراوەیە؟ ئێوە سووکایەتی بە من دەکەن و من لەم کارە بێزارم و لە بیری ناکەم، ئەوکات یان لە رێگای زۆر، یان لە رێگای پەژیوانییەوە دەڵێم: "ئێوە دەبەخشم" کە ماناکەی ئەوەیە کە دیسان من، کاراکتەری سەرکی بوومە،



بایەخی خۆم هەیەو ئەمە منم کە تاکێکیتر دەبەخشم. تا کاتێ کە بۆچوونی بەخشین هەیە، من بایەخم هەیە نە ئەو کەسەی کە خەیاڵ دەکرێت سووکایەتییەکی بە من کردبێت. کەواتە لە عەمبارکردن و دواتر دوور رشتنی رقدا کە بەخشینی پێ دەڵێم، ئەڤین نیە. ئەو کەسەی کە ئەڤیندارە، بێگومان لەگەڵ دوژمنیدا دوژمنە و لە هەمبەر تەواوی ئەم کارانەدا ئاوڕناداتەوە. خەمخۆری، بەخشین، پەیوەندیی نێوان خاوەنداریەتی، ترس و بەخێلی، هیچ کام لەمانە ناویان ئەڤین نیە. تەواوی ئەم کاروبارانە پێوەندییان بە زەینەوە هەیە. تا کاتێ کە زەین داوەرە، ئەڤین بێمانایە و داوەری کردنەکەی ئەو، تەنیا خاوەنداریەتییە بە شێوەی جۆراوجۆر. زەین تەنیا دەتوانێت ئەڤین گەندەڵ بکات و توانایی ئەوەی نییە کە ئەڤین و جوانی بخولقێنێت. ئێوە دەتوانن دەربارەی ئەڤین شیعر بڵێن، بەڵام شیعر، ئەڤین نیە.

کاتێ رێز راستەقینە نەبێت، کاتێ رێز بۆ ئەویتر دانەنێن ــ چ ئەم ئەویترە خزمەتکارتان بێتو چ دۆستان ـ بێگومان ئەڤین نیە. ئایا بەمەتان زانیوە کە لە روانگەی خزمەتکارانتان و لە روانگەی ئەو کەسانەی کە بە ناو "ژێر" دەستی ئێوەن، شایانی رێز، خۆشویستن و بەخشندە نین؟ بە باڵادەستانی خۆ، بە خاوەنکار، ملۆنەر، کەسانێك ماڵ و ناوبانگی گەورەیان هەیەو کەسێ کە دەتوانێت پۆستێکی باشتر یان پیشەیەکی چاکتر بە ئێوە بدات و ئێوە دەتوانن شتێك لەو بگرن، رێز دادەنێن، بەڵام پێ لە ژێر دەستانی خۆتان دەدەن و بۆ ئەوانە زمانێکی تایبەتتان هەیە. کەواتە، ئیحترام و ئەڤین نییە یان لە شوێنێکدا میهرەبانی و دڵسۆزی و بەخشین نیە، ئەڤین نیەو لەبەر ئەوە زۆرێك لە ئێمە لەم حاڵەتە داین، دەروونمان لە ئەڤین خاڵیە. ئێمە نە موحتەرەمین، نە دڵسۆزین، نە دڵاواین. ئێمە بە دوای دارایەوەین، لێوان لێوین لە هەست و سۆز، هەست و سۆزێك کە دەکرێت بە هەر رێگایەکدا بیکێشیت، بۆ کوشتن، بۆ کوشتار یان بۆ یەکگرتوویی بۆ ئامانجێکی گێلانەو بێئەقڵانە. لەم حاڵەتەدا ئەڤین چۆن دەتوانێت ببێت؟ کاتێ ئەڤین دەناسن کە تەواوی ئەم باسانە تەواو بووبێتن، کاتێك ئێوە خاوەن شتێك نەبن، کاتێك لە مل کەچبوونی خۆتاندا بۆ شتێك ، لە هەست و سۆز کەڵك وەرنەگرن. ملکەچبوونی وا، جۆرێك پاڕانەوەیە، جۆرێ گەڕان بۆ دۆزینەوەی شتێك بە شێوەیەکیترە. ئەو کەسەی کە داواکارە، لە ئەڤین خەبەری نیە. لەوێڕا کە بەدوای هەبوونەوەن، لەوێڕا کە لە رێگای تەسلیمی دوعابوونەوە کە ئێوە هەستیارو سۆزدار دەکات، بە دوای ئامانج و ئەنجامەوەن، بە شێوەی سروشتی ئەڤین نیە، بێگومان هەرکات رێز نەبێت، ئەڤین نیە. لەوانەیە بڵێن رێز دادەنێن، بەڵام ئەم رێزە بۆ باڵادەستە، رێز بۆ داواکردنی شتێکە، رێز لە ترسە. ئەگەر هەستی رێز لە دەروونتاندا دەبوو،

بەرامبەر بە ژێردەست باڵادەست، هەردوویان ڕێزدارانە هەڵسوکەوتیان دەکرد، ئێستاکە ئەم هەستەتان نیە، دەی ئەڤینیشتان نیە. بەراستی چ زۆر کەمن ئەوانەی کە بە گوزەشت و دڵاوان! ئێوە کاتێك چاوپۆشی دەکەن کە پاداشتەکەی وەرگرن، کاتێك دڵسۆزن کە قەرەبووەکەی ببینن، کاتێك ئەمانە لە نێو بچن، کاتێك ئەم شتانە زەینی ئێوە مژول نەکەن و کاتێك شتەکانی ناو زەین دڵی ئێوە پڕ نەکەن ئەو کاتە ئەڤین دێتە مەیدان و تەنیا شتێك کە دەتوانێت شێتی ئێستای دونیا بگۆڕیت، ئەڤینە، نە دەسەڵاتەکان و تئۆری، چ تئۆری چەپ و چ تئۆری ڕاست. کاتێ ئێوە بەشێوەی ڕاستی ئەڤیندارن کە لە بیری داراییدا نەبن و بەخیلیو چاوچنۆکیتان نەبێت و ڕێز بۆ ئەوانیتر دابنێن، دڵسۆزو میهرەبان بن و لە هاوسەر، منداڵان، دراوسێ و خزمەتکارانی چارەڕەشتان ئاوڕێك بدەنەوە.

ئەڤین شتێك نییە کە بکرێت بیری لێ بکرێتەوە، ئەڤین نە پەروەردە دەبێت و نە مەشق دەکرێت. مەشقی ئەڤین، مەشقی برایەتیو دیسان لە چوارچێوەی زەین دایە. بۆیە ناوی ئەڤین نیە. کاتێ کە تەواوی ئەمانە راوەستێت و کاتێ ئەڤین بوون پەیدا بکات، ئەوکاتە دەزانن کە ئەڤینداری یانی چی. کەوابوو ئەڤین شتێك نییە کە ئەندازەی هەبێت، ئەڤین شتێکە ناپێورێت. ئێمە نابێژین: "من تەواوی دونیام خۆش دەوێت"، بە هەر حاڵ کاتێ بزانن چۆن یەکێکتان خۆش بوێت، دەزانن کە چۆن هەمووتان خۆش بوێت. لەوێڕا کە ڕێگای خۆش ویستنی نەفەرێك نازانین، ئەڤینی ئێمە بەرامبەر بە مرۆڤایەتی تەزویرە. کاتێ کەسێك ئەڤیندارە، یەکێك و زۆر بوونی نیە: تەنیا ئەڤین هەیە. تەنیا کاتێك ئەڤین هەبێت، تەواوی گرفتارییەکانی ئێمە چارەسەر دەبێت و ئەو کاتەیە کە شاییو شەوق و خوشحاڵیشی دەناسین.

## ٢٣ـ دەربارەی مردن

**پرسیار: پەیوەندی مردن لەگەڵ ژیان چییە؟**

**کریشنا مورتی:** ئایا نێوان مردن و ژیان جیاوازییەك هەیە؟ بۆچی ئێمە مردن بە شتێکی جیا لە ژیان دەژمێرین؟ بۆچی لە مردن دەترسین؟ بۆچی ئەم هەمووە کێشەیان دەربارەی مردن نووسیوە؟ بۆچی نێوان مردن و ژین، ئەم هێڵە جیاکەرەوە هەیە؟ ئایا ئەم جیاییە ڕاستە، یان شتێکی زۆرەکیە و دەستکردی زەینە؟

کاتێك دەربارەی ژیان قسە دەکەین، مەبەستی ئێمە ژیان لە ئاستی پرۆسەیەکی بەردەوام بوون دایە کە لەودا دیاریکردنی شوناس هەیە. من و ماڵم، من و هاوسەرم، من و پارەی بانکیم، من



و ئەزموونی ڕابردووم، مەبەستی ئێمە لە ژیان، یانێ ئەو شتانە، وانییە؟ ژیان شێوازێکی بەردەوام بوونەوەیە لە زەمیردا، زەمیری وشیارو ناوشیار، زەمیرێك بە کێشمەکێشی جۆراوجۆر، خەبات، ئەزموونی تایبەتی خۆی و شتانی لەم جۆرە. ئەمانە هەر ئەو شتەن کە ئێمە ژیانی پێ دەڵێین و لە بەرامبەریدا، شتێك کە مردنی پێدەڵێین و بە هەموو ئەم کارانە کۆتایی دێنێت. لەوەیڕا کە ئێمە ئەم دژەمان کە ناوی مەرگە خولْقاندوەو لێی دەترسین، بەدوای پەیوەندیی نێوان مردن و ژیندا دەگەڕێین، ئەگەر بتوانین ئەم مەودایە بە جۆرێك باسکردن، بە باوەڕ بەردەوام بوون یان بە دونیای دوای مردن، پێکەوە ببەستین، هەست بە ڕەزامەندی دەکەین. بە دۆنادۆن یان شێوەیەکی دیکە لەبەردەوام بوون باوەڕمان هەیە و سەرئەنجام تێدەکۆشین لە نێوان ناسراو و نەناسراودا پەیوەندی دروستبکەین. تێدەکۆشین لە نێوان زانراو و نەزانراو پەیوەندی دروستبکەین و بەم جۆرە دەمانەوێت لە نێوان ڕابردوو و داهاتوودا پەیوەندی ساز بکەین. کاتێ کە دەربارەی بوون یان نەبوونی پەیوەندی نێوان مردن و ژیان پرس‌وجۆ دەکەین، مەبەستمان ئەنجامدانی هەر ئەم کارەیە. دەمانەوێت بزانین چۆن دەبێت لە نێوان مردن و ژیاندا پەیوەندی پێکبێنێت، شتێکە ئارەزووی سەرەکی ئێمەیە.

ئێستا بزانین ئایا ئەنجامی ئەم کارە کە مردنە، لە کاتی ژیندا دەکرێت بناسرێت؟ ئەگەر بتوانین لە کاتی ژیندا مردن بناسین، ئیتر گرفتێکمان نابێت. هۆی ترسانی ئێمە ئەوەیە کە لە کاتی ژینماندا ناتوانین ئەوەی کە نەناسراوە تاقیبکەینەوە. هەوڵی ئێمە ئەوەیە کە پەیوەندییەك لە نێوان خود کە بەرهەمی ناسراوەکانە و ئەوەی کە نەناسراوە و ناوی مردنە، دامەزرێنین. ئایا نێوان ڕابردووو ئەوەی کە زەین ناتوانێت قەبووڵیبکات و ئێمە پێی دەڵێین مردن، پەیوەندییەك هەیە؟ بۆچی ئەم دووانە لێك جیا دەکەینەوە؟ ئایا لەبەر ئەوە نییە کە زەینی ئێمە تەنیا دەتوانێت لە چوارچێوەی ناسراوەکان و لە چوارچێوەی بەردەوامیدا ئیشبکات؟ مرۆڤ تەنیا خۆی وەك بیرەوەرو هۆکاری پەیوەندی لەگەڵ بیرەوەرییەکان و بەڵا جۆراوجۆرەکان کە بەرهەمی عەشق، میهرەبانی و ئەزموونی جۆراوجۆرە دەناسێت. ئەو خۆی بە شتێکی بەردەوام دەزانێت، ئەگینا لە خۆی وەك شتێك بیرەوەرییەکی نەدەبوو. ئێستا کاتێ شتێك بە کۆتایی دەگات کە مردنی پێدەڵێین، ترس لە شتێکی نەناسراو زاڵدەبێت، کەوابوو ئێمە بیر لەوە دەکەینەوە کە نەناسراو بکێشین بۆ لای ئەوەی کە ناسراوەو تەواوی هەوڵمان ئەوە دەبێت کە بەوەی کە نەناسراوە بەردەوام بوون بدەین. بە واتایەکی تر، ئێمە نامانەوێت دونیا کە بریتی دەبێت لە مردنیش، بناسین، بەڵکو دەمانەوێت بزانین چۆن درێژەی

پێ بدەین‌و بە کۆتایی نەگەین. ناخوازین مردن و ژین بناسین، تەنیا دەخوازین بەبێ بە ئـەنجام گەیشتن، درێژە بدەین.ئەوەی بەردەوام دەبێتەوە، خاوەنی ژیانەوە نیە، لەوەیدا کە بـەردەوامی هەیە، هیچ شتێکی تازە نیە، هیچ شتێکی داهێنەریش ناتوانێت ببێت و ئەمە بابەتێکی زۆر روونە. تەنیا کاتێ بەردەوام بوون کۆتایی بێـت، دەرفـەتی هاتنـەدیی ئـەوەی کـە هەمیـشە تازەیە مەیسەر دەبێت، بەڵام ئەوەی ئێمە لێی دەترسین، هەر ئەم کۆتاییهاتنەیە و ئەوەی کـە نابینین کە ژیانەوە، داهێنـان و نەناسـراوەکان لـەم کۆتاییهاتنـەدا جێگایـان هەیـە نـە لـە بەردەوامی ئەزموونی رۆژانە، بیرەوەری و بێدەرەتانییەکان. تەنیا ئەوکاتەی هـەموو رۆژێـك لە پەرۆ دڕاوەکاندا بپێچینەوە و چـاڵیان بکـەین، تازەکـان سـەر دەر دێـنن. جێگایـەك کـە بەردەوام بوون هەیە، تازەبوون مانای نیە. مەبەست لـە تـازەبوون، یانـێ ئـەوەی داهێنـەرە، ئەوەی نەناسراوەو ئەوەی نەمرە، یانی خواوەند یان هەرچی ناوی لێدەنێن. تـاك یـان زاتێکـی خاوەن بەردەوام بوون کە لە تاقیبی نەزانراو، راستی‌و نەمری دایە، هەرگیز پەیدایان ناکـات، لەبەر ئەوە تەنیا شتێك کە گیری دێنێت، هەر ئەو شتەیە کـە لـە خـودی ئـەوەوە بەرجەسـتە کراوەو راستیان نیە. ناسـینی تـازەیی، تـەنیا لـە کۆتاییهـاتن و مردنـدا روو دەدات و ئـەو کەسەی کە بەدوای پەیوەندیی نێوان مردن و ژیاندا دەگەڕێت تا ئەوەی کە بەردەوامی هەیـەو ئەوەی کە بەڕای ئەو لەوپەڕ دایە، پەیوەند بدات، لە دونیایەکی دروستکراو و ناڕاستدا ژیـان دەکات، دونیاییێکە بەرجەستەبوونی خودی ئەوە.

ئێستا ئایا ئەو ئیمکانە هەیە کە لە ژیاندا بمرین، واتا بە کۆتایی بگەین، واتا ببینە هـیچ؟ ئایا هاوکات کە لەم دونیا دەژین، لەم دونیایەی کە هەموو شت زیاترو زیاتر یان کەمترو کەمتر دەبێت، لە شوێنێکدا کە هەموو شت رەوتی سەرەوە چوون، گەیشتن و سەرکەوتنی هەیە، ئایـا لەم دونیا، دەکرێت مردن بناسرێت؟ ئایا کۆتایی هێنان بە هەموو بیرەوەرییەك مسۆگەرە ـ نـە بە بیرەوەرییەکی راستەقینە وەك رێگا رۆیشتن بۆ ماڵەوەو شتانی لەم جۆرە ـ بەڵکو پەیوەنـدی دەروونی لە رێگای بیرەوەرییـەوە بـە ئاسایـشی رۆحـی، ئـەو بیرەوەرییانـەی کـە مـرۆڤ کـۆی کردووەتەوە، پاشەکەوتی کردووەو لەودا بەدوای ئاسایش و خۆشیدا دەگـەڕێت؟ ئایـا دەکرێـت هەمووی ئەمانە کۆتایی پێ بێنێت؟ یانێ هە رۆژ مردن بۆ ئەوەی کە بەشکو سبەی ژیانەوەیەك هەبێت؟ تەنیا لەو حاڵەتەدایە کە مرۆڤ هاوکات لەگەڵ ژیان کردن مردنیش دەناسێت. تەنیا لەو مردنەدا، لەو کۆتایی هاتنەدا، لەو کۆتایی دان بە بەردەوام بوونەدا، ژیانەوە، واتا خوڵقانـدنی ئەوەی نامرێت، دێتە دی.



## ٢٤ـ دەربارەی زەمان

**پرسیار: ئایا دەکرێت لە ناکاو واز لە رابردوو بێنین یان پێویستیمان بە کات هەیە؟**

**کریشنا مورتی:** ئێمە بەرهەمی رابردووین، فیکری ئێمە لەسەر بنەمای دوێنـێ و هـەزاران دوێنێی دیکە دامەزراوە. ئێمە بەرهەمی زەمـانین و وەڵامـەکانمان و روانینـەکانی ئێـستامان، کۆی کاریگەریی هەزاران چرکە، رووداو و ئەزموونە. بۆیە رابردوو بۆ زۆربەی ئێمە بریتییـە لـە حاڵ کە حەقیقەتێکی حاشاهەڵنەگرە. ئێوە، بیری ئێوە، کـردەوەی ئێـوە و وەڵامـەکانی ئێـوە، بەرهەمی رابردووە. ئێستا پرسا دەیەوێت بزانێـت ئایـا دەکـرێ بـە یـەکجاری واز لـە رابـردوو بهێنرێ، واتە نە بە خاوەخاو، بەڵکو زۆر بێدرەنگ، یان ئەوەی کـە ئـەم رابـردووە کۆکراوەیـە، پێویستی بە وەخت هەیە تا زەین، خۆی لە زەمانی رانەبردوو رزگار بکات. فامینی پرسـیارەکە گرنگە کە بەم جۆرەیە: لەبەر ئەوەی کە هەریەك لـە ئێمـە بەرهـەمی رابـردووین، کاریگـەریی زۆری رابردوومان لەسەرەو بەردەوام لە حاڵی گۆڕان داین، ئایا دەکرێ ئـەم کاریگەرییانـە، بـێ ئەوەی کە بڕۆینە ناو رێچکەی زەمانەوە، مەحفو بکەینەوە؟ رابردوو چییە؟ مەبەستی ئێمە لـە رابردوو چییە؟ بێگومان مەبەستی ئێمە لە رابـردوو، بـەدوای یەکـدا هـاتنی وەخـت نیـە. بـە دڵنیاییەوە مەبەستی ئێمە بریتییە لە: ئـەزموون و وەڵامـە کۆکراوەکـان، بـیرەوەری، نـەریت، زانست، پاشەکەوتی هزرە بێژمارەکانی زەینی نیوە وشیار، سۆز، کاریگەری و کاردانـەوەکان. بەم پێشینە زەینییەوە، تێگەیشتن لە راستەقینە مەیسەر نیە، چونکە راستی نابێت پەیوەنـدیی بە هیچ زەمانێکەوە هەبێت، راستی کـات ناناسـێت. هەربۆیـە کەسـێ کـە زەینـی بەرهـەمی زەمانە، ناتوانێت بێ زەمانی تێبگات. پرسا دەیەوێت بزانێت کە ئایا زەین دەتوانێـت رزگـاری ببێت یان ئەوەی کە بۆ زەین کە بەرهەمی زەمانە ئەم دەرفەتە هەیە کە خێرا راوەسـتێت، یـان ئەوەی کە پێویستە ئێمە بۆ رزگـارکردنی زەیـن لـە پیـشەی زەینـی خـۆی، کۆمـەڵێك راڤـەو لێکۆڵینەوە ئەنجامبدەین.* زەین، واتا پێشینەی زەینی، زەین ئاکـامی زەمانـە، زەیـن، واتـا رابردوو، زەین واتا شتێك کە داهاتوو نیە. زەین دەتوانێت وەدانی خۆی لە داهـاتوودا ببینێـت، زەین لە ئێستا وەك رێگایەك بەرەو داهاتوو کـەڵك وەردەگرێـت، کەواتـە لـە تەڵـەی زەمانـدا بێجووڵەیە، جیاوازییەك نییـە کـە چـی بکـات، چـالاکی چـی بێـت، چـالاکی داهـاتوو یـان چالاکییەکانی ئێستاو رابردووی. ئایا زەین دەتوانێت بە تەواوی راوەستێیت یان لەوانەیە رۆژێك رێچکەی بیر بە کۆتایی بگات؟

هەنووکە زەین بێژمار چینی هەیە، ئەوەی کە وشیاری پێدەڵێین چینێکی زۆری هەیە، هەر چینێك لەگەڵ چینی دیکەدا پەیوەندی هەیە، هەر چینێك بەستراوە بە چینی دیکەو لە کردەوەدا جیاوازن. تەواوی شعووری ئێمە نە تەنیا خەریکی تاقیکردنەوەیە بەڵکو کاری ناونان، ڕۆنانی زاراوە و ڕاگرتنەکانی وەك بیرەوەریشی لە ئەستۆدایە، شێوازێکی گشتی شعووری ئێمە ئەمەیە.

کاتێ دەربارەی شعوور قسە دەکەین، مەگەر مەبەستمان شتێك جیا لە تاقیکردنەوە، ناونان و ـ ڕۆنانی زاراوەو ئەزموونییە؟ مەگەر نە ئەوەی کە ئێمە ئەم ئەزموونە وەك بیرەوەری لە زەینی خۆماندا ڕادەگرین؟ هەروایە و هەمووی ئەمانە لە ئاستە جیاوازەکاندا یانی شعوور. ئایا زەین کە بەرهەمی زەمانە، دەتوانێت، هەنگاو بە هەنگاو خەریکی ڕاڤە بێت تا خۆی لە چنگی پێشینەی زەینی ڕزگار بکات؟ ئایا دەکرێت بەگشتی لە شەڕی زەمان ئازاد بیت و ڕاستەوخۆ چاو ببڕیتە ڕاستی؟ فرەیەك لە ڕاڤەکاران بە ئێوە دەڵێن کە بۆ ئازادی لە دەستی پێشینەی زەینی دەبێت یەك بە یەکی وەڵام، پێچاوی، ڕێگرو بەربەستەکان تاقیبکەنەوە، شتێك کە ئاماژەی بە پرۆسەی زەمانە. مانای ئەم قسە ئەوەیە کە ڕاڤەکار دەبێت ئەوەی کە ڕاڤەیدەکات تێبگات و خراپی لێکنەداتەوە. ئەگەر ڕاڤەی ئەو لەوەی کە ڕاڤەی دەکات خراپ بێت، ناوبراو بە ئاکامی هەڵە ڕێنوێنی دەبێت و بەم جۆرە پێشینەیەکی دیکەی زەینیش جێگیر دەکات. ڕاڤەکار دەبێت بتوانێت هەست و بیری بەبێ بچووکترین لادانێك ڕاڤە بکات و لە ڕاڤەکردنیشیدا نابێت هیچ هەنگاوێکی لە بیر بچێت، لەبەر ئەوە بۆ هەنگاو هەڵگرتنی چەوت و بۆ گەیشتن بە ئاکامی هەڵە بەسە کە پێشینەیەکی زەینی لە هێڵێکیتر، یان ئاستێکیتردا جێگیر بکەین، ئەم گرفتەش دروستدەبێت کە ئایا ڕاڤەکار لە ئەوەی کە ڕاڤەی دەکات جیایە؟ ئایا ڕاڤەکارو ئەوەی کە ڕاڤە دەبێت، خۆڵقاوێکی ئاوێتە نیە؟

بە دڵنیاییەوە ئەزموون و ئەوەی ئەزموون دەکات، خولقاوێکی ئاوێتەن، ئەوان دوو ڕێچکەی جیا لە یەك نین، کەواتە وەرن سەرەتا لە گرفتی ڕاڤەکاری بکۆڵینەوە. ڕاڤەکردنی تەواوی نێوەڕۆکی زەینی ئێمە بۆ گەیشتن بە ڕزگاری لە ڕێگای ئەو شێوازەوە، نزیك بە نامەیسەربوونە. جیا لەمەش، ڕاڤەکار کێیە؟ ڕاڤەکار لەگەڵ ئەوەیدا ڕاڤەیدەکات، جیاوازییەکی نیە، ڕەنگە هەستبکات جیاوازی هەیە. ڕاڤەکار لەوانەیە لە ئەوەی وا ڕاڤەی دەکات خۆی جیا بکاتەوە، بەڵام ڕاڤەکار بەشێکە لەو شتەی کە ڕاڤە دەبێت. من هەست یان بیرێکی وەك تووڕەییم هەیە، ئەو کەسەی تووڕەیی ڕاڤە دەکات، دیسان بەشێکە لەوە. کەواتە



ڕاڤەکارو ئەوەی کە ڕاڤە دەکرێت خۆڵقاوێکی ئاوێتەن. ئەوانە بە دوو هێزی جیا لە یەك یان دوو ڕێچکەی جیا لە یەك ناژمێردرێن. کەوابوو گرفتی ڕاڤە، کردنەوەو هەڵدانەوەی لاپەڕە بە لاپەڕەی خود، چاودێریکردنی هەر دژکردەوەیەك، چاودێریکردنی هەر وەڵامێك، مەسەلەیەکی لەڕادەبەدەر دژوارە. بۆیە ڕێگای ڕزگاری خۆ لە دەستی پێشینەی زەینی ئەمەیە. دەبێت ڕێگایەکی سادەترو سەرڕاستتر هەبێت و ئەمە هەر ئەو شتەیە کە ئێوەو من، بەدوای پەیداکردنیەوەین. بۆ پەیداکردنی دەبێت ئەوەی درۆیە فڕێی بدەین و نزیکی نەکەوینەوە. بۆیە ڕاڤەی ئەو ڕێگا مەبەست نیەو ئێمە دەبێت خۆمان لە داوی شێوازی ڕاڤەکردن ڕزگار بکەین.

ئەوجا چ دەمێنێتەوە؟ ئێمە تەنیا عادەتمان لە ڕاڤەیە، مەگەر جیا لەمەیە؟ چاودێر لە چاوەدێری ـ کاتێ چاودێرو چاودێری خولقاوێکی ئاوێتە بن ـ چاودێر لە ڕاڤەی ئەوەی کە بۆی دەڕوانێت، شتێکی دەستگیر نابێت و یارمەتی ڕزگاری لە پێشینەی زەینی نادات. ئەگەر وەزع بەم جۆرەیە ـ کە هەیە ـ ئێوە لەم ڕەوشە چاوپۆشی بکەن، ئایا ئەم کارە دەکەن؟ ئەگەر دەزانن ڕێگایەکی هەڵەیە، ئەگەر نە تەنیا بە شێوەی زارەکی، بەڵکو بەکردەوە دەزانن کە ئەم ڕێگا هەڵەیە، دەی باشە کاری ڕاڤەی ئێوە بەکەڵکی چی دێت؟ ئێوە دەست لە کاری ڕاڤە بکێشن، ئەوجا خەریکی ڕوانین و لێکۆڵینەوە لەوەی بن کە ماوەتەوە، جا دەیبینن کە تاك بە چ خێرایی و گۆڕێکەوە دەتوانێت لە چنگی پێشینەی زەینی ڕزگاری بێت؟ ئەو حاڵ و وەزعە زەین کە خووی گرتووە بە ڕاڤە، لێکۆڵینەوە، شیکاری، بڕیاردان و شتی لەم جۆرە، مەحفۆ دەبێت و بە ڕاوەستانی ئەم شێوازە وەزعی زەینی ئێوە دەگۆڕدرێت. ناوێك کە ئێوە بۆ ئەم وەزع و دۆخەی زەین هەتانە: "زەینی خاڵی"یە. ئێستا تۆزێ زیاتر لەم زەینە خاڵییە بکۆڵنەوە. بە واتایەکیتر، ئەگەر زانراوەکان وەك شتانی ناڕاست فڕێبدەن، چی بۆ زەینتان پێش دێت؟ چ شتێکتان فڕێ داوە؟ ئەوەی فڕێتان داوە، شێوازێکی ناڕاستە کە بە ئاکامی پێشینەیەکی زەینی دەژمێردرێت، ئەی وانیە؟ بە تەکانێك هەموو شتێکتان فڕێداوە، جگە لەمەش نەبووە. کەوابوو، زەینی ئێوە، دوای فڕێدانی شێوازی ڕاڤەکردن و ئەوەی کە ئاماژە بەوە دەدات، هەروەها بە ناڕاست زانینیشی، لە چنگی دوێنێ ڕزگار دەبێت و بەم شێوە دەتوانن ڕاستەوخۆ بڕوانن و بەبێ ئەوەی کە لە ڕەوتی زەمان تێپەڕێت و بەم جۆرە و دەسبەجێ کێبەرکێی زەینیش وەلاوە بنێت.

بۆ هێنانە بەرباسی مەسەلەکە بە شێوەیەکی دیکە، دبێژین کە فیکر ئەنجامی زەمانە. فیکر، بەرهەمی شوێن و جێگا، کاریگەریی مەزهەبی و جڤاکییە کە هەموویان بەشێکن لە زەمان. ئایا فیکر دەتوانێت لە تۆڕی زەمان ئازاد بێت؟ مەبەستم فیکرێکە کە بەرهەمی

زەمانە، بەڵێ، ئایا ئەم فیکرە دەتوانێت راوەستێت و لە ڕێچکەی زەمان ئازاد ببێت؟ فیکر دەکرێت کۆنترۆڵ بکرێت و فۆرمی پێبدرێت، بەڵام کۆنترۆڵی فیکر دیسان لە چوارچێوەی زەمان دایە، کەوابوو گرفتی ئێمە ئەوەیە کە: فیکرێك کە ئاکامی زەمانەو ئاکامی هەزاران دوێنێیە چۆن دەتوانێت خێرا لە دەستی ئەم پێشینە پێچاوپێچییەی زەین رزگار بێت؟ ئێوە دەتوانن لێی رزگار بن، بەڵام نە سبەی، بەڵکو هەر ئێستاو هەر لەم کاتەدا، ئەم کارە تەنیا کاتێ روو دەدات کە ئێوە ناڕاستەکە بناسن و ناڕاستیش بێگومان شێوازی راڤەکردکاریەو ئەمە تەنیا سەرمایەی ئێمەیە. کاتێ شێوازی راڤەکاری بە تەواوی راوەستێت، نە لە رێگای بەهێزکردن، بەڵکو لە رێگای تێگەیشتن لە ناڕاست بوونی لاعلاجی ئەو شێوازە، ئەوا دەزانن کە فیکری ئێوە خۆی بە تەواوی لە رابردوو جیا دەکاتەوە، مانای ئەم قسە ئەوە نییە کە ئێوە رابردوو ناناسنەوە، بەڵکو ماناکەی ئەوەیە کە ئێوە پەیوەندی فیکری‌و هەستیاری راستەوخۆتان لەگەڵ رابردوودا نابێت. کەواتە دەتوانێت خۆی ئیستەرەم و هەر ئێستا رزگار بکات و ئەم جیاییە لە رابردوو، ئەم تەواو رزگاربوونە لە دوێنێ، نە بە شێوەی بەدوای یەکدا هاتنی وەخت، بەڵکو بە شێوەی دەروون ناسانە مەیسەرەو ئەمە تەنیا رێگای فامی راستییە.

بە زمانی سادە، کاتێ ئامانجتان فامینی شتێکە، وەزعی زەینتان چۆنە؟ کاتێ دەتانەوێت منداڵەکانتان فام بکەن، کاتێ دەتانەوێت تاکێك فام بکەن یان شتێك کە کەسێك دەڵێت، وەزعی زەینتان چۆنە؟ لەم حاڵەدا، ئێوە بە راڤەو رەخنەو داوەری ئەو شتەی کە ئەویتر دەڵێت مژوڵ نین، ئێوە گوێ بۆ قسەکانی دەگرن، ئەی وانییە؟ زەینی ئێوە وەزعێکی هەیە کە لەو وەزعەدا چالاك نییە، بەڵام زۆر وشیارە. ئەم وشیارییە پەیوەندی بە زەمانەوە نیە. ئێوە تەنیا هۆشیارن، بە شێوەیەکی پاسڤ وەردەگرن و هاوکات بە تەواوی وشیارو تەنیا لەم دۆخە دایە کە تێگەیشتن هەیە. کاتێك حەزو ئارەزووی زۆر بۆ تێگەیشتن هەیە، بێگومان زەین ئارام دەبێتەوە. ئەڵبەت ئێوە لەم بارەوە تا بێت قسەکانی من قەبووڵبکەن، دەبێت خۆتان دەست بە تاقیکردنەوە بکەن، بەڵام بۆتان روون دەبێتەوە کە هەرچی زیاترو زیاتر راڤە بکەن، کەمترو کەمتر تێدەگەن. لەوانەیە برێك لە رووداوەکان و ئەزموونە دیاریکراوەکان تێبگەن، بەڵام ناکرێت لە رێگای شێوازی راڤەکارییەوە زەین لە شتەکانی خاڵی بکرێت. تەنیا کاتێك ئەم خاڵیکردنە مەیسەرە کە لە رێگای راڤەی ناڕاست بوونەوە ئەم رەوشە ببینن. کاتێك ناڕاستتان ناڕاست دی، ئەوا بەرەبەرە دەبینن کە راستی چییە و ئەو شتەی ئێوە لە تۆڕ و داوی پێشینەی زەینی رزگار دەکات، راستییە نە شتێکی دی.



## ٢٥ـ دەربارەی پراکتیکی بێ ئایدیا

**پرسیار: ئێوە بۆ گەیشتن بەڕاستی پراکتیکی بێئایدیاتان پێشنیاز کردووە. ئایا کارکردن بێ هەبوونی ئایدیا، یانێ بێ لەبەرچاوگرتنی ئامانج، مەیسەرە؟**

**کریشنا مورتی:** هەنووکە کردەوەی ئێمە چییە؟ مەبەستی ئێمە لە کردەوە چییە؟ کردەوەی ئێمە ـ ئەوەی کە دەمانەوێت ببین یان جێبەجێی بکەین ـ لەسەر بناغەی ئایدیایە، ئەی وانییە؟ ئێمە هەر ئەمە دەزانین. ئێمە دەربارەی ئەوەی کە هەین‌و ئەوەی کە نین، ئایدیاکان، ئیدەئاڵەکان، هیواداری و فورمۆڵی جیاوازمان هەیە. بنەمای کردەوەی ئێمە پاداشت لە داهاتوو یان ترس لە سزایە. ئێمە ئەمە دەزانین، جیا لەمەیە؟ چالاکێکی لەم جۆرە تەریك کەرەوە و سنووردارکردنی خودە. ئێوە ئایدیایەکتان دەربارەی خۆپارێزی هەیە و لە پەیوەندیدا، بە گوێرەی ئەو ئایدیا کار ئەنجامدەدەن و ژیان دەکەن. بۆ ئێوە پەیوەندی، تاکی یان گشتی، کردەوەیەکە بە ئیدەئاڵ، خۆپارێزی، سەرکەوتن و کاری لەم جۆرە ئاماژە دەدات.

کاتێ کردەوەی من لەسەر بناغەی ئیدەئاڵێکە کە خۆی ئایدیایە کە ـ وەك، "من دەبێت ئازا بم"، "دەبێت لە سەرمەشق پەیڕەوی بکەم"، "دەبێت دڵاوا بم"، "دەبێت لە رووی جڤاکییەوە زانیاریم هەبێت" و قسانی لەم جۆرە، ئەم ئایدیا فۆرم بە کردەوەی من دەدات و رێنمایی دەکات. هەمووی دبێژین: "نموونەیەك لە تەقوا هەیە کە دەبێت پەیڕەوی لێ بکەین" کە ماناکەی ئەمەیە: من دەبێت بەبێ ئەوەی ژیان بکەم. کەوابوو پراکتیك بە پێی ئەو ئایدیایە، نێوان ئایدیاو پراکتیك دەریایەك هەیە، جیاییەك هەیە، رێچکەیەکی زەمان هەیە. بەڵێ، هەر وایە. قەبووڵتانە؟ بە دەربڕینێکیتر، من دڵاوا نیم ،کەسێکم خۆش ناوێت،لیبۆردەیی لەدڵمدا نییە بەلام خەیاڵ دەکەم دەبێت دڵاوابم. بۆیە نێوان ئەوەی هەم و ئەوەی دەبێت ببم، مەودایەك هەیە، ئێمە بەردەوام هەوڵدەدەین لەم نێوانەدا پەیوەندی ساز بکەین. ئەمە چالاکی ئێمەیە، ئەی وانییە؟

دەی ئەگەر ئایدیا نەدەبوو چی رووی دەدا؟ بە تەکانێك ئەم مەودایەتان لە نێو دەبرد، وانییە؟ ئەوکات دەبوون بە شتێك کە هەن. دەڵێن: "من دزێوم، دەبێت جوان ببم، چ بکەم؟ کە پراکتیکێکە لەسەر بنەمای ئایدیا. دەڵێن: "من میهرەبان نیم، دەمەوێت میهرەبان بم". کەوابوو ئێوە ئایدیاکان جیا لە پراکتیك دەناسێنن. بۆیە، کردەوەی راستەقینە پشتی نەبەستووە بە ئەوەی کە هەن، بەڵکو هەمیشە پشتی بە ئیدەئاڵێك بەستووە کە دەبێت.

مرۆڤی گەمژە هەمیشە دەڵێت کە دەیهەوێت زیرەك بێت. دادەنیشێت و دەستدەکات بە گێڕاڤ تا ببێت، هەرگیز ناوەستێت، هەرگیز ناڵێت: "من گەمژەم" کەواتە کردەوەکەی کە لەسەر بنەمای ئایدیایە، بە هیچ جۆر کردەوە نیە.

پراکتیك یانێ ئەنجامدان، یانێ جووڵان، بەڵام کاتێ ئیدەیەکتان هەیە، ئەوەی لە تەڤگەڕدایە، ئیدەپەروەریە و شێوازی بیرکردنەوە کە لە پەیوەندی لەگەڵ پراکتیکدا، بەردەوامە. ئەگەر ئیدەیەك نەبێت، چ دەبێت؟ ئێوە ئەوەی هەن هەر ئەوەن. ئێوە دڵڕەق، بێبەزەیی، زاڵم، گەمژەو بێفیکرن، ئایا دەتوانن لەگەڵ ئەمانەدا ژیان بکەن؟ ئەگەر توانیتان، بزانن چ دەبێت؟ کاتێك من بزانم بێبەزەییم، دڵرەقم، گەمژەم، حاڵ و وەزعی من چۆن دەبێت؟ ئەگەر بە تەواوی دڵڕەق بوون فام بکەم ـ نە بە شێوەی زارەکی یان دەستکرد ـ کاتێ بزانم کە دڵاوا نیم، کەسێکم خۆش ناوێت هەر لە دیتنی ئەم "ئەوەی هەیە"دا عەشق هەیە. ئایا من گورج نابمە دڵاوا ؟؟ ئەگەر من پێویستی پاك و خاوێنی بزانم، کارێکە سادەیە دەڕۆم و دەشۆم، بەڵام ئەگەر پاك و خاوێنی ئیدەئالی من بێت، ئەوجا چ دەبێت؟ ئەوا، خاوێنی لە بیر دەچێتەوە یان دەبێتە کارێکی کەم بایەخ.

پراکتیك لەسەر بنەمای ئیدە زۆر کەم بایەخە، شتێکی وانییە کردەوەیەکی راستەقینە نیە، تەنیا ئیدەپەروەریە، یانی شێوازێکی بیرکردنەوەیە کە بەردەوام بوونی هەیە. پراکتیکی کە ئێمە وەك بوونەوەرانی مرۆیی دەگۆڕێت، ژیانەوەو رزگاری ـ ناوی هەرچی دەنێن ـ دروستدەکات، لەسەر بنەمای ئیدە دانەمەزراوە. پراکتیکێکە بیری بەلای پاداشت یا سزای بەردەوامەوە نییە. پراکتیکێکی وانییە، زەمان ناناسێت، لەبەر ئەوە زەین کە رەوتی زەمان، ژماردن، جیایی و گۆشەگیرییە، نزیکی ناکەوێتەوە. ئەم مەسەلە بە ئاسانی شیکار ناکرێت، زۆرێك لە ئێوە پرسیارێك دەپرسن و چاوەڕوانی وەڵامی "ئەرێ"و "نا" دەکەن. پرسینی پرسیاری وەك "مەبەستتان چییە"و دواتر پاڵدانەوە و ئیزن دان بە من بۆ باسکردنی، ئاسانە، بەڵام پەیداکردنی وەڵام لە لایەن خودی ئێوەوە و بەدواداچوونی قووڵ و روونی مەسەلەکە بەبێ خراپ کردنی مەسەلەکە بە جۆرێك کە ئیتر مەسەلە نەبێت، زۆر دژوارە. شتێکی وا تەنیا کاتێك روو دەدات کە زەین لە بەربەرەکانێ لەگەڵ مەسەلەکەدا بەڕاستی ئارام بێت. ئەگەر بەڕاستی حەز لە مەسەلەکە بکەن، وەك جوانی ئاوابوونی خۆرەو ئەگەر لەگەڵی دژایەتی بکەن هەرگیز فامی ناکەن. زۆربەی ئێمە لەبەر ئەوە لە ئاکام دەترسین و



نازانین کە ئەگەر پێی بگەین چ دەبێت لە خۆماندا هەست بە دوژمنایەتی دەکەین و هەربۆیە گرنگ و بایەخی مەسەلەکە جیا ناکەینەوە.

## ٢٦ـ دەربارەی تازە و کۆنە

**پرسیار: کاتێ گوێ بۆ قسەکانت شلدەکەم، هەموو شتێ روون و تازەیە، دەڕۆمە ماڵەوە، کۆنەو بێئارامییەکی لەش گرانکەر ئازارم دەدەن. گرفتی من لە کوێ دایە؟**

**کریشنا مورتی:** راستی لە ژیانی ئێمەدا چ شتێك دەیهەوێت روو بدات؟ کێشە کاردانەوە بووە بە کارێکی هەمیشەیی. بەمە دەڵێین ژیان، بەمە دەڵێین رابواردنی تەمەن، بەڵێ، بەم کێشەو دژکردەوە بەردەوامە، کێشە هەمیشە تازەو وەڵام هەمیشە کۆنەیە. من دوێنێ ئێوە دیوەو ئەمڕۆ ئێوە دێن بۆ لای من. ئێوە گۆڕاون، ئێوە خۆتان گرتووە، ئێوە فەرقتان کردووە، ئێوە تازەن، بەڵام من لە ئێوە هەر ئەو وێنەیەم هەیە کە دوێنێ هەمبوو. کەوابوو، من تازە لە کۆنەدا هەرسدەکەم، من ئێوە لە سەرەتاوە نابینم، بەڵام وێنەی دوێنێی ئێوە هەیە، بۆیە دژکردەوەی من بە کێشەی لای سەرەوە هەمیشە مەرجی کراوە. لێرەدا لەم چرکە تایبەتییەدا، ئێوە بە رەهیمایی بوونتان، مەسیحی بوونتان، لە هۆزێکی رەسەن بوونتان، یان هەرچی کە هەن رادەگرن و هەموو شتێك لە بیر دەبەنەوە. تەنیا گوێ دەگرن، گوێگرتنێکی تەواوی و هەوڵتان ئەوەیە کە لە باسەکە تێبگەن. کاتێ ئێوە دەست بە ژیانی رۆژانەتان دەکەنەوە، هەر دەبنەوە بە "خود"ەکەی جارانی خۆتان هەڵدەگەڕێننەوە بۆ پیشەی خۆتان، هۆزی خۆتان، سیستمی خۆتان و خێزانی خۆتان. بە دەربڕینێکیتر، تازە هەمیشە لە کۆنەدا هەرس دەبێت و دەچێتە خانەی عادەت، نەریت، داب، ئیدەو بیرەوەری کۆنەوە. هەرگیز لە تازە هەواڵێك نیە، چونکە ئێوە هەمیشە لەگەڵ کۆنەدا دەڕۆن بۆ دیدەنی تازە. کێشە نوێیە بەڵام ئێوە بە کۆنەوە دەیبینن. گرفتی ئەم مەسەلە ئەوەیە کە بە هیچ شێوەیەك فیکر لە تۆڕی کۆنە ئازاد بکەین تا هەردەم تازە بێت. کاتێ گوڵێك دەبینن، کاتێك روخسارێك دەبینن، کاتێ ئاسمان، درەخت یان بزەیەك دەبینن، چۆن دەکرێت تازە ببینن؟ بۆچی کۆنە تازەی هەرس کردوە و هاوسەنگی دەکات؟ بۆچی کاتێ دەڕۆنە ماڵەوە، تازەیەك نیە.

وەڵامی کۆن، لە لایەن بیرەوەرەوە بەرز دەبێتەوە. ئایا بیرەوەر بەردەوام کۆن نیە؟ چونکە فیکری ئێوە لەسەر پایەی رابردوو دامەزراوە، کاتێ تازە دەبینن، ئەوەی کە ئەو دەیبینێت، بیرەوەرە، ئەزموونی دوێنێیە کە تازەکە دەبینێت. بیرەوەر هەمیشە کۆنە.

کەواتە، دووبارە لە ڕێگایەکی دیکەوە بەو مەسەلە دەگەینەوە. چۆن دەبێت زەین لە خۆی وەك بیرەوەر ڕزگار بکرێت؟ چۆن دەبێت ئەندێشە کە ئەزموونێکی زۆرە لە نێو بەریت؟ تا کاتێ کە ڕزگاری لە پاشماوەکانی ئەزموون نەیەتە دی، وەرگرتنی تازە ڕوو نادات. بۆ ڕزگارکردنی ئەندیشە و بۆ ڕزگاربوون لە ڕەوتی ئەندێشە و بەرەوڕووبوونەوە لە بەرامبەر تازەدا، کارێکی دژوارە، لەبەر ئەوە تەواوی باوەڕو نەریت و شێوازەکانمان لە فێرکردن و بارهێناندا جگە لە شێوازی گێڕاڤ، کۆپی، لەبەرکردن و عەمبارکردنی بیرەوەری شتێکی دیکە نیە. ئەم ئەندێشە هەمیشە وەڵام بە تازەکان دەداتەوە، وەڵام بەم ئەندێشە پێی دەڵێین بیرکردنەوە، هەر ئەم بیرکردنەوە واو وانییەیە کە بەرەولای تازەکان دەڕوات. کەوایە، چۆن تازەیەك دەتوانێت هەبێت؟ تەنیا کاتێ کە پاشماوەی بیرەوەری نەبێت، تازەیی هەیەو هەرکاتیش ئەزموون تەواو نەبووبێت، بە کۆتایی نەگەیشتبێت و تەواو نەکرابێت، پاشماوە هەیە، بە واتایەکیتر، کاتێ کە ئەزموون بە تەواوی فام نەکرا بێت، کاتێ ئەزموون بە تەواوی بێت پاشماوەیەك نابینرێت، بەمە دبێژین جوانیی ژیان. ئەڤین پاشماوەی شتێك نیە، ئەڤین ئەزموون نیە، حاڵەتێکە لە بوون. ئەڤین تازەیەکی نەمرە.

کەوایە، مەسەلەی ئێمە ئەوەیە: ئایا کەسێ دەتوانێت تازە ـ تەنانەت لە ماڵەوە ـ بە بەردەوامی ببینێت؟ بە دڵنیاییەوە دەتوانێت. بۆ ئەم کارە مرۆڤ دەبێت لە زەمیرو لە هەستی خۆیدا شۆڕش بەرپا بکات، تەنیا کاتێ دەتوانن ئازاد بن کە هەر ڕووداو و هەر بیرێك، چرکە بەچرکە بە وردی سەرنج بدرێت، کاتێکە هەر وەڵامێك بە شێوەی تەواو فام بکرێت، نەلامسە لایانە بۆی بڕوانیت و دواتر وەلاوە بنرێت: ڕزگاری لە چنگ بیرەوەرییەك کە لە حاڵی کەڵەکەبوون دایە، کاتێ ڕوو دەدات کە هەر بیرو هەستێك تەواو بووبێت و بە وردی ئاوڕی لێ درابێتەوە. بە دەربڕینێکیتر، کاتێ کە هەر بیرو هەستێکی بە وردی ئاوڕ لێدراو بەئەنجام بگات، کۆتاییەکی هەبێت و لە نێوان کۆتایی بیرێك لەگەڵ بیرێکی دیکە مەودایەك دەبێت، لەو مەودا ئارامەدا شتێك بەناوی ژیانەوە و داهێنانی نوێ ڕوو دەدات. شتێکی وا نە تئۆریەو نە ناپراکتیك. ئەگەر هەوڵبدەن هەر هەست و فیکرێك بە وردی سەرنج بدەن، بۆتان دەردەکەوێت کە شتێکی وا بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لە ژیانی ڕۆژانەی ئێوەدا پراکتیزەیە. چونکە لەو کاتەدا ئێوە تازەن و ئەوەی کە تازەیە، بە شێوەیەکی نەمر دەمێنێتەوە. تازەبوون، واتا داهێنەربوون، داهێنەربوون یانی خۆشحاڵ بوون، مرۆڤی شادو خوشحاڵ لە بیری دەوڵەمەندبوون یان نەبووندا نیە، گرنگی بەوە نادات کە لە چ ئاستێکی کۆمەڵایەتی دایە یان



بە کام هۆزو کامە وڵات بەستراوەیە، نە ڕێبەر، نە بوت، نە پەرستگا، نە کلێساو هەر بۆیە نە شەڕو نە دوژمنی و نە دوژمنایەتیش.

بێگومان ئەمە پراکتیکیترین شێوازی چارەسەرکردنی گرفتەکانی ئێمەیە لەم دونیا ئاڵۆزەی ئێستادا. لەبەر ئەوەی کە ئێمە داهێنەر نین ـ مەبەست لە داهێنەربوون ئەو مانایە کە جێی مەبەستی منە ـ و لە تەواو چینە جۆراوجۆرەکانی وشیاری خۆماندا دژی کۆمەڵایەتین. بۆ هەبوونی پەیوەندییەکی ڕاستەقینە و کاریگەر لەگەڵ هەموو شتێکدا دەبێت خوشحاڵ بێت، هەرکات کۆتاییەك نەبێت، خۆشحاڵی نیە، ئەگەر ڕەوتی بەردەوام بوون درێژەی هەبێت، هەواڵێك لە خۆشی نیە. ژیانەوە، لە دایکبوونێکی تر، تازەییو شایی لە دوای قەبووڵ کردنەوەیە.

تا کاتێ پێشینەی زەینی هەیەو تا کاتێ زەین و بیرەوەر کە بیرەکە ئەوی مەرجی کردووەتەوە هەیە، تازە لەکۆندا هەرسدەبێت. بۆ ڕزگاری لە چنگی پێشینەی زەینی، کاریگەریەکانی مەرجیکران و بیرەوەری، دەبێت لە تۆڕی بەردەوام بوون ڕزگارت بێت. تا کاتێ کە هەست و بیرکردنەوە بە تەواوی کۆتاییان پێ نەیەت، بەردەوام بوون هەر دەبێت. ئێوە کاتێك ئەندیشەیەك بە کۆتایی دەگەیەنن کە هەتا کۆتایی تاقیبی بکەن و هەر بەم جۆرە بە هەموو هەست و بیرێك کۆتایی بێنن. ئەڤین نە عادەتە و نە بیرەوەری، ئەڤین بەردەوام تازەیە. دیتنی تازە تەنیا کاتێك دەبێت کە زەین تازە بێت و تا کاتێ کە پاشماوەی ئەزموون هەیە، تازە نابێت. بیرەوەری هەم ڕاستییەو هەم دەروون ناسانە. من دەربارەی بیرەوەری ڕاستی قسە ناکەم، قسەی من دەربارەی بیرەوەری دەروونناسانەیە. تا کاتێ کە ئەزموون بە تەواوی فام نەکرێت، پاشماوە ـ کە کۆنەو لە دوێنێ و شتێکە کە ناوی ڕابردووە ـ هەیەو ئەم ڕابردووە بەردەوام خەریکی هەرسکردنی تازەیەو بەم جۆرە مەفعی دەکاتەوە. تەنیا کاتێکە زەین لە کۆن ڕزگار ببێت، دەتوانێت هەموو شتێك لە سەرەوە ببینن و خۆشی و خۆشحاڵیش هەر لەمە دایە.

## ٢٧ـ دەربارەی ناولێنان

**پرسیار: چۆن مرۆڤ دەتوانێت لە سۆزێك بەبێ ناونان و مارك لێدانی، ئاگادار بێت؟ ئەگەر من لە هەستێك ئاگادار بم، هەستدەکەم دوای هۆشیاربوونەوەی، خێرا لە نێوەڕۆکی تێدەگەم، تۆ بڵێیت کاتێ ئێوە دەڵێن "ناو لێ مەنێن" مەبەستتان شتێکیتر بێت؟**

**کریشنا مورتی:** بۆچی ئێمە ناوی شتێك دەنێین؟ بۆچی لە هەر گوڵ و مرۆڤ و هەستێك مارکێ دەدەین؟ یان دەخوازین هەستی خۆمان دەربڕین یان ئەو کەسەو ئەو گوڵەو هتد شرۆڤە

بکەین یان خۆمان لەگەڵ ئەو هەستەدا هاوشێوەو یەکسان بکەین. راستی بۆچی؟ ناونانی شتێك، وەك هەستێك بۆ تەلقین کردنیەتی، بۆ نموونە "من تووڕەم". هەندێ جار خۆیشم لەگەڵ ئەو هەستەدا یەکسان دەکەم بۆ ئەوەی کە وزەی پێ بدەم یان لە نێوی ببەم، یان ئیشێکی بۆ بکەم. ناوێك لە شتێك دەنین، بۆ نموونە گوڵی سوور، تا بەوانیتر بناسێنین یان بە خەیاڵی خۆمان بەم ناونانە فامی بکەین. دبێژین: "ئەمە گوڵی سوورە"، سەرنجێکی خێرای دەدەین دەچین. بە ناونانی هەستدەکەین کە فاممان کردووە، پۆلێنی دەکەین و هەستدەکەین بەم جۆرە تەواوی نێوەرۆك و جوانیی گوڵەکەمان فام کردووە.

بە ناونانی شتێك، تەنیا وەك چەمکێك چوارچێوەیەکمان پێداوەو هەستدەکەین لێی تێگەیشتووین، بەڵام وردتر سەرنجی نادەین، ئەگەر ناوێکی بۆ دانەنین، ناچارین بە وردی سەرنجی بدەین. بە دەربڕینێکیتر، لەگەڵ گوڵ یان هەر شتێکیتر بە شێوەیەکی تازەتر بەرەوڕوو دەبینو توێژینەوەیشمان لەو بارەوە چۆنیەتێکی تازەتر پەیدا دەکات، بە جۆرێك سەرنجی دەدەین کە گۆیا لە رابردوودا هەرگیز نەماندیوە. بۆ رزگاری لە چنگی هەر شتێك و هەر تاکێك ناولێنان رێگایەکی زۆر ئاسانە، بە وتنی ئەمەی کە ئەوانە ئاڵمانی، یابانی، ئەمریکیو هیندین. ئێوە دەتوانن مارك لە کەسانە بدەن لێیان بکەنەوە. ئەگەر مارك لە خەڵك نەدەن، ناچارن سەرنجیان بدەن و ئەوجا مرۆڤ کوشتن زۆر دژوارتر دەبێتەوەو لابردنی مارك بە بومباو هەستکردن بەوەی کە تۆ راستیت و هەقت بەدەستە ئاسانە، بەڵام ئەگەر مارکیان لێ نەدەن و ناچار بن یەك بە یەك سەرنجیان بدەن ـ چ مرۆڤ، چ گۆڵ، چ رووداو، چ سۆز ـ ئەوکات مەجبوورن پەیوەندیی خۆتانو کردەوەیەك کە لە دوای ئەو دێت، بخەنە ژێر توێژینەوەیەکی ورد. کەوابوو، ناولێنان یان رۆنانی زاراوە بۆ لەنێوبردنی شتێك، نکۆڵیکردن لە شتێك، تاوانبارکردن یا رەوایی پێدانی شتێك، رێگایەکی سووك و ئاسانە، ئەمە لایەنێکی پرسیارەکەیە.

ناوەندێك کە ناولێنان لەوەوە سەرهەڵدەدات، ناوەندێك کە بەردەوام کاری ناولێنان، هەڵبژاردن و مارك لێدانە چییە؟ هەمووممان هەستدەکەین کە ناوەندێك هەیە، ناوەندێك کە لەوەوە فەرمانی کردەوە دەگرین و داوەری دەکەین و کاری ناونان ئەنجامدەدەین. ئەم ناوەندە چییە؟ هێندێك پێیان باشە وابیر بکەنەوە کە ئەمە زاتێکی مەعنەوییە، شتێك وەك پەروەردگار یان هەر شتێك کە ناوی لێدەنێن. کەوابوو وەرن بزانین ئەم ناوەندە کە کاری ناولێنان، دانانی زاراوەو داوەریە چییە؟ بێگومان ئەم ناوەندە ناوی "خاطرە"یە ئەی وانییە؟ "خاطرە" واتە کۆمەڵێك لەو پاڵنەرانەی کە ناسراون و لە چوارچێوەیەکدا



ماونەتەوە، هەروەها رابردوویەك کە لە رێگای ئێستاوە ماوەتەوەو ژیان دەکات. ئەم ناوەندە لە رێگای ناونان، مارك لێدان و بە بیرهێنانەوە لە ئێستا پێداویستیی خۆی دابیندەکات. بە زوویی بەکردنەوەی زیاتری ئەم بابەتە بۆمان روون دەبێتەوە کە هەتا ئەم ناوەندە هەبێت، تێگەیشتن نیە. تێگەیشتن تەنیا لە رێگای لەنێوبردنی ئەم ناوەندەوە مەیسەرە، چونکە لە هەر حاڵدا ئەم ناوەندە یادە، بیرەوەری ئەزموونی جۆراوجۆر کە ناو و مارکیان وەرگرتووەو شۆناسیان دیاریکراوە. ئەم ئەزموونانەی کە لە لایەن ناوەندەوە ناویان لێ نراوەو مارکیان لێ دراوە بە پێی سۆزو چێژو ئازارەکانی بیرەوەری ئەزموون، لەگەڵ وەرگرتن و وەرنەگرتن و بڕیاردان بۆ بوون یان نەبووندا پێکەوە، بە جۆرێ کە دەکرێ بڵێیت ناوەند یانێ وشە. ئەگەر ناوی ئەم ناوەندە نەنێن، ئایا ناوەندێك هەیە؟ بە دەربڕینێکیتر، ئەگەر بە پێی وشەکان بیر نەکەنەوەو کەڵکیان لێ وەرنەگرن، دەتوانن بیر بکەنەوە؟ تێفکرین لە رێگای شێوەی پەیداکردنی وشەکانەوە پێکدێت یان بە شێوەی پەیداکردنی وشەکان وەڵامدانەوە بە هزرین دەسپێدەکات. ناوەند یان کاکڵە یانێ یادی ئەزموونی بێژمار لە ئازارو چێژ کە لە چوارچێوەی وشەدایە، بیر لە خۆتان بکەنەوە، دەیبینن کە وشەکان و مارك لێدانەکان لە چەمکەکان ئەولاتر چوونە و بایەخی زیاتریان پەیدا کردووە. بەڵێ، ئێمە بە وشەکانەوە زیندووین.

بۆ ئێمە وشانی وەك خواوەندە، هەقیقەت ـ یان هەستێك کە ئەم وشانە دەربڕی ئەون ـ بایەخی زۆریان پەیدا کردووە. کاتێ وشەکانی وەك ئەمریکایی، مەسیحی، هیندو، یان وشەی تووڕەیی دەردەبڕین، ئێمە خۆمان هەر ئەو وشانەین و دەربڕی ئەو هەستانەین. بەڵام ئەم هەستانە ناناسین، چونکە وشە بایەخی بۆ ئێمە پەیدا کردووە. کاتێ خۆتان بە بوودایی یان مەسیحی ناو دەبەن، مانای ئەم وشانە چییە؟ ئەو مانای کە لە پشتی وشەوەیەو ئێوە هەرگیز تاقیتان نەکردوەتەوە چییە؟ کاکڵەو ناوەندی ئێمە، لە وشەو مارك پێکهاتووە. ئەگەر مارك عەیبێکی نەبێت و ئەگەر عەیب لە شتێکەوە بێت کە لە پشتەوەی مارك دایە، ئێوە دەتوانن پرس و جۆ بکەن، بەڵام ئەگەر لەگەڵ مارکەکەدا یەکسان بنو پێیەوە بەستراوە بن، پێشڤەچوون مەیسەر نییە و ئێمە لەگەڵ مارکدا هاوشێوەین: لەگەڵ ماڵ، فۆرم، ناو، کەلوپەل، رەقمی بانکی، باوەڕمان، هاندەرەکانمان چیوچی. ئێمە هەموو ئەم شتانەین، تەواوی ئەو شتانەی کە بە ناوێکەوە نیشاندەدرێن. شتەکان، ناوەکان و مارکەکان بایەخیان پەیدا کردووە، هەربۆیە ناوەند یان کاکڵە بووە بە هەمان وشە.

ئەگەر مارك یان وشەیەك نەبێت، شتێكمان بە ناوی ناوەند نابێت. لەو حاڵەدا ناوەند لەبەر یەك هەڵدەوەشێت و چۆڵدەبێت، ئەڵبەت نە لەبەر ترس كە شتێكی بە تەواوی جیاوازە. ئەوكات جۆرێ هەست بە "هیچ بوون" دێتە ئاراوە، لەبەر ئەوە ئێوە تەواو ئەتێكێتەكانتان هەڵگرتووە یان چاكتر بڵێم لەبەر ئەوەی كە تێگەیشتوون بۆچی لە هەست و ئیدەكانتان ئەتێكێت دەدەن و بە تەواوی تازە دەبنەوە. ئیتر ناوەندێك كە لەوڕا فەرمانی كاركردن بگرن نیە. ئەو ناوەندە درۆینە ـ واتە وشە ـ لە نێو چووە. ئەتێكێت هەڵكنراوەو ئێوە دەچنە جێگای ناوەند، بەڵام گۆڕانێك روویداوە. ئەو گۆڕانكارییە تۆزێ مەترسیهێنەرە، لەبەر ئەوە دەست لەو شتەی نادەن كە هێشتا لەودا نەخشی هەیە. لەبارەی ئەوەوە دەستان بە كاری جۆراوجۆر كردووە، دەتانەوێت بزانن خۆشتان دەوێت یان نا؟ دەست ناكەن بە كاری تێگەیشتن لەوەی وا روو دەدات. لە بەرامبەردا دەست بە داوەری دەكەن و ماناكەی ئەوەیە كە ئێوە بە فەرمانی ناوەندێك ئیش دەكەن. كەوابوو هەر لەو چركەی داوەریەدا نەگۆڕ دەمێننەوە، وشەكانی "حەز لێكردن"و "حەز لێنەكردن" بایەخ پەیدا دەكەن، بەڵام كاتێ ناوی لێنانین، چ دەبێت؟ راستەوخۆتر بۆ پاڵنەر یان هەستێك دەڕوانن و بەم جۆرە پەیوەندییەكی جیاوازتان لەگەڵی دەبێت، هەرواكە لە بارەی گوڵیشە ئەگەر ناوێكی لەسەر دانەنێین، شتی وا روو دەدات. ئێوە ناچار دەبن بە نیگایەكی تازەوە سەیری بكەن. كاتێ ناو لە سەر گرووپێكی خەڵك دانەنێن ناچار دەبن بۆ هەر تاكێك بە وردی بڕوانن و لەگەڵیان وەك كۆمەڵێك بەرەوڕوو نەبنەوە. بەم جۆرە هۆشیارتر، ئاگادارتر، رێكوپێكترو خاوەن هەستێكی قووڵتر لە ئەڤین و خەمخۆری دەبن.

ئەگەر ئەتیكێت دانەنێن دەبێت لەگەڵ هەر هەستێكدا بەو جۆرەی كە سەرهەڵدەدات بجووڵێنەوە، بەڵام كاتێك ماركی لێدەدەن لە نێوان مارك و هەستدا جیاوازییەك نابێت. ئەتیكێت دەبێتە هۆی وشیاربوونەوەی هەست. تكایە بە باشی سەرنج بدەن. كاتێ ئەتیكێت دادەنێن، زۆربەی ئێمە هەستەكە دەورووژێنینەوە. هەستكردن و ناونان هاوكات روودەدات، ئەگەر لە نێوان هەستكردن و ناولێناندا مەودایەك دەبوو ئەوكات دەمانتوانی تێبگەین كە ئایا هەستكردن لەگەڵ ناولێناندا جیاوازە یان نا؟ ئەوكات دەمانتوانی لەگەڵ هەستكردندا بەبێ ناولێنانی بەربەرەكانێ بكەین.* مەسەلە ئەوەیە كە چۆن دەكرێ لە چنگی هەستێك كە ئێمە ناوی دەنێین، وەك تووڕەیی، رزگار ببین؟ نە ئەوەی كە چۆن رامی بكەین، گەورەی بكەینەوە یان سەركوتی بكەین كە هەمووی كاڵ و كرچ و گەمژانەیە، بەڵكو چۆن بەڕاستی لە چنگی رزگار ببین؟ بۆ رزگاربوون بە مانای راستەقینە دەبێت



تێبگەین كە ئایا وشە لە هەست بایەخی زیاترە یان نا؟ بۆ نموونە ئایا وشەی تووڕەیی مانایەكی زیاتری هەیە لە هەستی تووڕەیی؟ راستییەكەی ئەوەیە كە بۆ دۆزینەوەی ئەم وەڵامە دەبێت لە نێوان هەست و ناولێناندا مەودایەك هەبێت. ئەگەر من بۆ هەستێك ناوێك دانەنێم، بە واتایەكیتر ئەگەر هزر لەبەر وشەكان ئیشنەكات، یان ئەگەر من بە پێی وشەكان، وێنەی زەینی و هێماكان بیر نەكەمەوە كە زۆربەی ئێمە هەر ئەم ئیشە دەكەین، لەو حاڵەدا چی روو دەدات؟ بێگومان لەو حاڵەدا زەین، تەنیا بینەرێك نابێت، كاتێ زەین بە پێی وشەكان وێنەی زەینیو هێماكان بیر ناكاتەوە، بیرو بیرەوەر كە وشەن، لێك جیا نین. لەو حاڵەدا زەین ئارامە، ئارامە نەك ئەوەی كە ئارام دەبێت. كاتێ زەین بەڕاستی ئارامە دەكرێ بە خێرایی لەگەڵ ئەو هەستانەیدا كە دروستدەبن بەربەرەكانێ بكەین. تەنیا كاتێ كە هەستەكان ناو دەنێین و بەم جۆرە دەسەڵاتیان پێ دەدەین، بەردەوام بوون پەیدا دەكەن، لە ناوەنددا كۆ دەبنەوەو ئێمە ماركی تریان لێدەگرین، ئەم كارە بە مەبەستی راگەیاندن یان بەهێزكردنی ئەوانە.

كاتێ زەین ئیتر ناوەند نەبێت، وەك بیرەوەرییەك كە لە وشەو ئەزموونی رابردوو پێك هاتووە و تەواوی ئەوانەش مارك و بیرەوەرین، كۆكراونەتەوە، پۆلێن كراون و هەركامەیان خراونەتە قۆژبنێكەوە، كاتێ هیچ كام لەم كارانە ئەنجام نەدات، روونە كە زەین ئارام دەبێت. ئیتر لە بەنددا نیە، ئیتر ناوەندێكی لە مندا نییە ـ وەك ماڵی من، سەركەوتنی من و كاری من ـ كە دیسان وشەن و هێز بە هەست دەدەن و بەم شێوە بیرەوەری بە هێز دەكەن. كاتێ هیچ كام لەمانە روو نەدات زەین زۆر ئارامە. حاڵەتێكی وا ناوی رەتكردنەوە نیە، بە پێچەوانە ئێوە بۆ گەیشتن بەو خاڵە دەبێت لە تەواوی ئەم قۆناغانەوە تێپەڕن كە ئەركێكی گرانە، ئەمە تەنیا فێربوون نییە كە ئێوە وەك مندالانی سەرەتایی كۆمەڵێك وشە دووپات بكەنەوە. تاقیبی هەموو ئاماژەكانی زەین و تاقیكردنەوەی و ئاگاداربوون لە شێوازی كاركردنی زەین و ئەوەی كە چۆن لەو رێگاوە دەگات بە شوێنێك كە ئیتر ئێوە كاری ناونان ئەنجام نادەن، واتە ئیتر ناوەندێك جیاتر لە هزر نییە. بەڵێ، هەمووی ئەم ئاراستە پێی دەڵێین تێفكرینی راستەقینە.

كاتێ زەین بەڕاستی ئارامە، ئەو كاتە هاتنەدیی ئەوانەی كە ناپێورێت مەیسەرە. هەر شێوازێكی دیكە، هەر گەڕانێكی دیكە لە دوای راستیدا تەنیا لە خۆ دوورخستنەوەو دەستكردی ئێمەیە، كەوابوو هەقیقەتی نیە. بەڵام ئەم ئاراستە گرنگە ماناكەی ئەوەیە كە زەین دەبێت بە بەردەوامی لەوەی كە لە دەروونیدا روو دەدات ئاگادار بێت. بۆ گەیشتن بەم مەبەستە

لە سەرەتاوە تا بنەتا نە دەکرێ داوەرییەك لە گۆڕێدا بێت و نە پاساوهێنانەوەیەك و نە ئەوەی کە ئەمە بنەتایە. بنەتایەك نیە، لەبەر ئەوە شتێکی لەڕادەبەدەر بێجوولە لە حاڵی ئەنجام دایە. شتێکی وا هیوابەخش نیە. ئەمە ئێوەن کە دەبێت تاقیبکەنەوە، لە خۆتاندا قوولتر و قوولتر و قوولتر ببنەوە تا ئەوەی کە تەواوی چینە بێژمارەکانی ناوەند لە نێو بچێت، ئەڵبەت ئێوە دەتوانن ئەم کارە بەخێرایی‌و بە هێمنیش ئەنجامبدەن. چەندە سەرنجڕاکێشە کە لە ئاراستەی زەین تێڕامانمان هەبێت و بزانین کە چۆن بە وشەکانەوە بەستراوەتەوە، وشەکان چۆن زەین هاندەدەن، یان گیان بە بەر ئەزموونی مردووەکاندا دەکەن. لەو شێوازەدا زەین یان لە داهاتوودا دەژیت یان لە رابردوودا. کەواتە وشەکان لە هەر روویێکەوە بایەخی بێوێنەیان هەیەو تکایە ئەمانە نە لە من فێر بن و نە لە کتێب. ئێوە لە هیچ کەس‌و هیچ کتێبێك فێری ئەوە نابن. ئەوەی کە فێری دەبن یان لە کتێبدا پەیدای دەکەن، هەقیقەت نیە، بەڵام ئێوە دەتوانن تاقیبکەنەوە، دەتوانن خۆتان لە کاتی کردەوەو هزریندا بخەنە ژێر چاوەدێری، بزانن کە چۆن بیر دەکەنەوەو هەر هەستێك کە لە دەروونتاندا سەرهەڵدەدات بە خێرایی ناوی لێ دەنێن‌و چاودێری ئاراستەی گشتیش زەین لە شەڕی ناوەندی خۆی رزگار دەکات. سەرئەنجام زەین، زەینێکە ئارامی گرتووە، دەتوانێت ئەوەی نەمر بێت وەری بگرێت.

## ٢٨ـ دەربارەی ناسراو و نەناسراو

**پرسیار: زەینی ئێمە تەنیا خەبەری لە ناسراو هەیە. چ شتێك لە دەروونی ئێمەدا هانمان دەدات کە نەناسراو، پەروەردگار یان هەقیقەت پەیدا بکەین؟**

**کریشنا مورتی:** ئایا زەینی ئێوە بۆ چوون بەرەولای نەناسراو پێداگری دەکات؟ ئایا لە دەروونی ئێمەدا پاڵنەرێك هەیە بۆ گەیشتن بە نەناسراو، پەروەردگار یان هەقیقەت؟ تکایە لەم بارەوە چاك و جیدی بیر بکەنەوە، ئەمە پرسیارێك نییە کە خێر بە باسەکە بگەیەنێت، بەڵکو پرسیارێکە بۆ تێگەیشتن لە باسەکە. ئایا لە دەروونی ئێمەدا پاڵنەرێك هەیە بۆ گەیشتن بەوەی کە نەناسراوە؟ بەڕاستی هەیە؟ نەناسراو چۆن پەیدا دەبێت؟ ئەگەر ئێوە نایناسن چۆن دەتانەوێت پەیدای بکەن؟ ئایا رژدبوونێك هەیە بۆ پەیداکردنی هەقیقەت یان ئەوەی کە هەیە، تەنیا ئینتیمایەکە بۆ ناسراوەکە بەڵام بە شێوەیەکی بەرین. ئایا بایەخ بە قسەکانم دەدەن؟ من زۆر شتم ناسیوە، ئەوان منیان خۆشحاڵ و رازی نەکردووە و چێژیان بە من نەداوە. کەواتە ئێستا خوازیاری شتێکی دیکەم کە چێژی زیاترو خۆشی زیاترو



شادومانیی زیاترم پێبدات. ئایا ئەوەی کە ناسراوەو بریتییە لە زەین و بەرهەمی رابردوو، دەتوانێت بڕوات بە دوای نەناسراودا؟ ئەگەر من بڕۆم بە دوایدا، بەدوای شتێکی نەناسراودا دەڕۆم کە رەنگدانەوەیەکە لە خودی من. گرفتی ئێمە ئەوە نییە کە چ شتێك لە دەروونی ئێمەدا، ئێمە وادار بە پەیداکردنی نەناسراو دەکات، ئەمە بە تەواوی روونە. حەزی خودی ئێمە ئەوەیە کە زیاتر لە ئاسایشدا بین و سەقامگرتووترو خۆشحاڵتر بین هەتا لە ئاژاوەو شۆڕش، رەنج و ئازارو پەرێشانی دوور بکەوینەوە. ئەمە حەزی حاشاهەڵنەگری دەروونیی ئێمەیە. کاتێ ئەم حەزو سووربوونە هەیە، ئێوە رێی دەربازبوونێکی سەیرو پەناگەیەکی غەریو ـ لە بوودا، مەسیح، دروشمە سیاسییەکان و هتد ـ پەیدا دەکەن. ئەمە هەقیقەت نیە، ئەمە نەناسین یان نەناسراو نییە. کەوابوو حەزێك کە بۆ پەیداکردنی نەناسراو هەیە، دەبێ بە کۆتایی بگات، یانێ دەبێت دەربارەی ئەو ناسراوانەی کە کۆ کراونەتەوەو هەر هەمان زەینە، تێگەیشتن هەبێت، زەین دەبێت خۆی وەك شتێك کە ناسراوە فام بکات، لەبەر ئەوە هەموو کاری ناسینی هەر ئەمەیە. ئێمە ناتوانین دەربارەی شتێك کە نایناسین بیر بکەینەوە. ئێمە تەنیا دەتوانین لەبارەی ئەوانەوە وا دەیانناسین بیر بکەینەوە.*

گرفتی ئێمە ئەوەیە کە زەین مژوڵی ئەو کارەی کە ناسراوە نەبێت، ئەم کارەش کاتێ روو دەدات کە زەین لە خۆی تێبگات و تێبگات کە چۆن "با فرافکنی خویش" هەمووبزاڤەکانی لە رێگای ئێستاوە، لە رابردووەوە دەڕوات بۆ داهاتوو، ئەمە تەڤگەرێکی بەردەوامی ناسراوە، ئایا ئەم تەڤگەرە دەتوانێت تەواو ببێت؟ ئەم کۆتاییهاتنە کاتێ روو دەدات کە میکانیزمی خودی ئەو تەڤگەرە فام بکرێت، کاتێ زەین خۆی و ئەو کارانەی کە دەیکات، رێگاکانی خۆی، ئامانجەکانی خۆی، ئۆگری و داخوازییەکانی خۆی ـ نە تەنیا داخوازییە رواڵەتییەکان، بەڵکو حەزو رژدبوونە بە تەواوی دەرونییەکانیشی ـ تێبگات. ئەمە ئەرکێکی زۆر گرانە، شتێك نییە لە چاوپێکەوتنێکدا یان ئاخاوتنێکداو لە کتێبێکدا پەیدا بکرێت، بە پێچەوانە، بەڵکو پێویستی بە چاودێریکردنی بەردەوام و ئاگاداربوونی بەردەوام لە تەواوی تەڤگەرەکانی زەین هەیە. نە تەنیا لەو کاتانەیدا کە خەبەرن، بەڵکو ئەو کاتانەش کە لە خەودان، دەبێت شێوازێکی تەواو بێت نە پەڕاگەندەو هەندەکی.

نابێت لە بیرمان بچێت کە نیەتیش دەبێ دروستبێت، بە دەربڕینێکیتر دەبێت بەم دەمارگیرییە، کە ئێمە هەموومان لە دەروونەوە خوازیاری نەناسراوین کۆتایی بێنین. شتێکی وا کە بیر بکەینەوە هەموومان بە دوای پەیداکردنی خواوەین، خەیاڵێکی پووچە. ئێمە نابێت بە

دوای رووناکیدا بگەڕێین. هەرکات تاریکی لە نێو بچێت، رووناکی ئاشکرا دەبێت، لە رێگای تاریکییەوە ناکرێ رووناکی ببینین. تەنیا کارێك کە دەبێت بکرێت ئەوەیە کە ئەو رێگرە، رێگری تاریکیخولقێن لە نێو بچێت و لەنێوبردنی ئەم کۆسپەش پەیوەندی بە نیەتی ئێمەوە هەیە. ئەگەر هەڵگرتنی کۆسپەکان بۆ دیتنی رووناکییە، کەوابوو ئێوە شتێك لە نێو نابەن، تەنیا کارێك کە دەیکەن ئەوەیە کە وشەی رووناکی لە جیاتی تاریکی دادەنێن، تەنانەت روانین بۆ ئەوپەڕی تاریکی، هەڵاتنە لە تاریکی.

ئێمە نابێت سەرنجی ئەوەی بدەین کە دەبێتە هۆی بزووتنی ئێمە، بەڵکو دەبێت بزانین هۆکاری ئەم شێواوی و ئاڵۆزی و کێشمەکێش و دوژمنایەتیی ـ یانێ تەواوی چۆنایەتییە گەمژەکانی دەروونی ئێمە ـ لە دەروونی ئێمەدا چییە؟ کاتێ ئەم شتانە نەبێت، ئەوا رووناکی بۆخۆی ئاشکرا دەبێت و پێویست ناکات بە دوایدا هەڵوەدا بین. کاتێ گەمژەیی لە نێو بچێت، زیرەکی ئاشکرا دەبێت، بەڵام مرۆڤێ کە گێلەو هەوڵدەدات ببێت بە زیرەك هێشتا گێلە. گێلی هەرگیز نابێت بە زیرەکی، تەنیا کاتێ کە گێلی نەبێت، زیرەکی ئاشکرا دەبێت. تاکێ کە گێلە و کۆشش دەکات ببێت بە ئاقڵ و زیرەك، بێگومان هەرگیز نابێت. بۆ ئەوەی کە بزانین گێلی چییە، دەبێت بڕوینە ناخییەوە نە بە شێوەی رواڵەتی، بەڵکو دەبێت بە تەواوی و قووڵ توێژینەوە لە توێژەکانی گێلی بکەین، کاتێ کە گێلی بە کۆتایی بگات، ئەقڵ ئاشکرا دەبێت.

لەبەر ئەوە ئەمە گرنگ نییە کە بزانین ئایا شتێك زیاترو گەورەتر لەوەی کە ناسراوەو ئێمە هاندەدات بڕۆین بەرەولای شتی ناسراو یان نا، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە بزانین ئەوەی کە لە دەروونی ئێمەدا دەبێتە هۆی شێواوی، شەڕ، ناکۆکیی چینایەتی، فیز، کەوتنە شوێن ناوداران کۆکردنەوەی زانست، دەربازبوون لە رێگای مۆسیقا، هونەرو بێژمار رێگای دیکە، چییە؟ ئەڵبەت گرنگ ئەوەیە کە ئەم شتانەی بەو جۆرەی کە هەن بیانبینین، ئەوکات بەو جۆرەی کە هەین، هەڵگەڕێینەوە بۆ خۆمان. ئێمە دەتوانین لەوێڕا دەسپێبکەین. ئەوکات دوور رشتنی ئەوەی ناسراوە ئاسان دەبێت. کاتێ زەین ئارام بێت و ئیتر خۆی لە داهاتوودا بەرجەستە نەکات، ئیشتیای لە شتێك نەبێت، کاتێ زەین بە راستی هێمن و بە شێوەیەکی قووڵ ئارام بێت، نەناسراو ئاشکرا دەبێت. پێویست ناکات بەدوایدا بگەڕین، داهێنانی مەیسەر نیە. تەنیا شتێك دەتوانین دابهێنین کە ناسراوە، ئێوە ناتوانن میوانێکی نەناسراو بخولقێنن. تەنیا ئەو کەسەی کە دەیناسن دەتوانن بانگهێشتی بکەن. ئێوە نەناسراو ناناسن. ئێستا ئەم نەناسراوە دەتوانێت خوا، هەقیقەت یان هەر شتێکیتر بێت. لە هەر



حاڵدا دەبێت بۆخۆی چەکەرە بکات و ئەمەش کاتێ مەیسەرە کە کێڵگە ئامادە و زەوی کێڵراو بێت، بەڵام ئەگەر زەوی بکێڵن تا چەکەرە بکات، ئەوجا لە دیتنی بێبەش دەبن. گرفتی ئێمە ئەوە نییە کە چۆن بڕۆین بە دوای ئەوانەیدا کە نەناسراون، بەڵکو گرفت ئەوەیە کە چۆن ئەو شێوازەی کە خەریکی کۆکرنەوەی زەینەو بەردەوامیش ناسراوە، تێبگەین. ئەمە ئەرکێکی زۆر قورسە و پێویستی بە وشیاریی بەردەوام هەیە، وشیارییێك کە لەودا پاشەکشە، دیاریکردنی شوناس و تاوانبارکردن نەبێت. واتە بوون لەگەڵ ئەوەیدا کە هەیە. تەنیا لەو بارودۆخەدا زەین ئارام دەبێت. تێفکرین و دیسیپلین بە هەر ئەندازەش کە بێت ناتونێت زەین بە مانای تەواوی وشە ئارام بکات. تەنیا کاتێ کە شنە لەسەرخۆکان راوەستن، ئەم دەریاچە ئارام دەبێت. ئێوە ناتوانن ئەو دەریاچە ئارام بکەن، ئیشی ئێمە بەدواداچوونی ئەوەی کە نەناسراوە نیە، ئیشی ئێمە ئەوەیە کە لە شێواوی، بەڵاو ئاڵۆزی دەروونی خۆمان تێبگەین، سەرئەنجام ئەوەی کە تاریکەو شادی تێدا شاراوەیە، ئاشکرا دەبێت.

## ٢٩ـ دەربارەی راست و درۆ

**پرسیار: چۆن راستی، بەو جۆرەی کە ئێوە گوتووتانە لە ئەنجامی دووپاتبوونەوەدا دەبێت بە درۆ؟ بەڕاستی درۆ چییە؟ بۆچی درۆکردن هەڵەیە؟ ئایا ئەمە لە تەواوی ئاستەکانی دەروونی ئێمەدا گرفتێکی قووڵ و غەریب نیە؟**

**کریشنا مورتی: لەم پرسیارەدا دوو پرسیاری دیکە هەیە، کەواتە وەرن سەرەتا بە پرسیاری یەکەم وەڵام بدەینەوە کە دەپرسێت: چۆن دووپات بوونەوەی راستی دەبێتە هۆی گۆڕانی بۆ درۆ؟ ئایا ئێوە دەتوانن تێگەیشتنێك دووپات بکەنەوە؟ من شتێ تێدەگەم ئایا دەتوانم دووپاتی بکەمەوە؟ بەڵێ، من دەتوانم بە شێوەی وشە دەری بێنم و دەری ببڕم، بەڵام بێگومان ئەزموون ئەو شتەی نییە کە دووبارە دەبێتەوە. ئێمە لە داوی وشەکاندا گرفتار دەبین و مانای ئەزموون لە دەستدەدەین. ئەگەر ئەزموونێکتان هەبێت ئایا دەتوانن دووبارەی بکەنەوە؟ لەوانەیە بتانەوێت دووبارەی بکەنەوە و حەزو هەستی دووبارەکردنەوەشتان هەبێت، بەڵام کاتێك ئەزموونێك کرا ئیتر تەواو بووە و دووبارەبوونەوەیشی مەیسەر نیە. ئەوەی دەتوانێت دووبارە بێتەوە هەستی تایبەت بەو ئەزموونەیەو وشەیەکی بەرامبەرە کە دەبێتە هۆی زیندووکردنەوەی ئەو هەستە. لەبەر ئەە زۆربەی ئێمە بەداخەوە پڕوپاگەندە دەکەین، کەوتووینەتە ناو داوی**

دووبارەبوونەوەی وشە، کەواتە فەرمانمان دەروات بەناوی پێچاوی وشەکانداو راستی نکۆڵی لێدەکرێت. هەستی ئەڤین بە نموونە دێنینەوە، ئایا دەکرێ دووپاتی بکەینەوە؟ کاتێ دەبیسن کە دەڵێن: "دراوسێکەتان خۆش بوێت" ئایا بەڕای ئێوە راستی بەم جۆرەیە؟ نا، تەنیا کاتێ ئەم گوتراوە راستە کە ئێوە بەڕاستی دراوسێکەتان خۆش بوێت و ئەم خۆش ویستنەش ناتوانێت دووبارە بێتەوە، ئەوەی دووپات دەبێتەوە وشەیە. هەر بۆیە زۆربەی ئێمە لە دووبارەکردنەوەی "دراوسێکەتان خۆش بوێت" یان "چاوچنۆك مەبن" رازی و خوشحاڵبن. کەوابوو، راستییەکیتر یان ئەزموونێکی راستەقینە کە ئێوە لە رێگای دووبارەکردنەوەوە هەتان بووە، نابێتە راست. بە پێچەوانەوە، دووبارەکردنەوە، رێگری رێگای راستییە. دووپاتکردنەوەی رووتی ئیدە دیاریکراوەکان راستی نییە.

گرفتی ئەم باسە لە فامینی پرسیارەکە دایە کە بەبێ هزرین و بیرکردنەوە بە پێی دژەکەی روویداوە. درۆ شتێك نییە کە دژ بە راست بێت. مرۆڤ دەتوانێت راستی ئەوەی کە دەگوترێت چاو لێبکات، نە کاتێ کە وەك راست یان درۆیەك بەراوردی بکات یان لە هەمبەری یەکدا دایان بنێت. بەڵکو تەنیا بزانێت کە زۆربەی ئێمە بەبێ فام و تێگەیشتن دووبارە دەکەینەوە. بۆ نموونە ئێمە دەربارەی ناولێنان باسمانکردووە نە ناونانی هەستێك و هتد. دڵنیام زۆرێك لە ئێوە بە خەیاڵ ئەوەی کە "راستی" ئەمەیە دووبارەی دەکەنەوە. ئێوە هەرگیز ناتوانن ئەزموونێکی راستەوخۆ دووبارە بکەنەوە. لەوانەیە ئەمە بەوانیتر بڵێن، بەڵام کاتێ ئەزموون واقیعە، هەستێك کە لە گەڵێدا بووە لە نێو دەچێت و نێوەرۆکی ئەو سۆزەش مەحف دەبێتەوە.

بۆ نموونە ئیدەی یەك بوونی بیرو بیرەوەر لەبەرچاو بگرن. لەوانەیە ئەمە بەلای ئێوەوە راستی بێت، چونکە ئێوە راستەوخۆ تاقیتان کردوەتەوە. ئەگەر من دووبارەی بکەمەوە، ئیتر بەڕاستی ناژمێردرێت، ئاگادار بن، مەبەست راستییە، نە راستی لە بەرامبەر درۆدا. بەڵێ، شتێ لەم جۆرە راستی نیە، تەنیا دووپاتکردنەوەیەك بووە، هەربۆیە مانایەکی نابێت. بڕوانن، ئێمە بە دووپاتکردنەوە دەمارگیری دروستدەکەین، کلێسا ساز دەکەین و تێیدا پەنا دەگرین. وشە، نە راستی جێگای "راستی" دەگرێتەوە. وشە، خودی شت نیە. بەڕای ئێمە خودی شت وشەیەو هەر لەبەر ئەم هۆیەیە کە مرۆڤ دەبێت لە رادەبەدەر وشیار بێت شتێ کە بەڕاستی فامی ناکات دووبارەی نەکاتەوە. ئەگەر شتێك تێبگەن دەتوانن دەربیبڕن، بەڵام بیرەوەری و وشەکان مانای هەستیاری خۆیان لەدەستدەدەن. کەوابوو ئەگەر کەسێك ئەمە لە گفتوگۆیەکی ئاساییدا تێبگات، روانگەو رادەی زانیاریشی دەربارەی وەشەکان تووشی گۆڕان دەبێت.



لەبەر ئەوە ئێمە لە رێگای خۆناسییەوە بەدوای راستییەوەین و تەنیا پڕوپاگەندەکارێك نین، فامی ئەمە بایەخی هەیە. مرۆڤ بە دووبارەکردنەوەو بە یارمەتی ورووژاندن یان وشەکان خۆی هێپنۆتیزم دەکات و تووشی گومان و خەیاڵ دەبێت. بۆ رزگاری لەمەش، روانینی راستەوخۆ پێویستە و بۆ روانینی راستەوخۆش، مرۆڤ دەبێت لە رەوتی دووبارەکردنەوە، رەفتار، وشەکان و پاڵنەرەکان لەخۆیدا ئاگادار بێت. ئەم وشیارییە ئازادیی زیاتر دەدات بە مرۆڤ بە جۆرێ کە دەبێتە هۆی ژیانەوە، تاقیکردنەوەی بەردەوام و تازەیی.

پرسیاری دیکە ئەمەیە: "بەڕاستی درۆ چییە؟ بۆچی درۆکردن هەڵەیە؟ ئایا ئەمە لە تەواوی ئاستەکانی دەروونی ئێمەدا گرفتێکی قووڵ و غەریبە؟"

درۆ چییە؟ درۆ، جۆرێ ناکۆکی وتنە، دژایەتی لەگەڵ دەروونی خۆ دایە. مرۆڤ دەتوانێت بە شێوەی خۆویست یان خۆ نەویست ناکۆکی بڵێت، لەوانەیە ئەم کارە بە ئەنقەست بێت یان لە رووی نەزانینەوە، ئەم دژو ناکۆکی وتنە لەوانەیە زۆر زۆر سەیرو سەمەرە بێت یان زۆر زۆر روون و ئاشکرا. کاتێ کەلێنی نێوان ناکۆکی وتن زۆر گەورە بێت ئەوا هەرکام هاوسەنگی خۆیان لە دەستدەدەن یان تاك لە کەلێنەکە تێدەگات و هەوڵی چاکسازی دەدات.

بۆ تێگەیشتن لە نێوەرۆکی درۆو هۆکاری درۆکردن دەبێت توێژینەوە لەسەر بنەمای دژەکەی ئەنجام نەبێت. ئایا دەتوانین بۆ ئەم مەسەلەی ناکۆکی وتنە لە خۆماندا جۆرێ بڕوانین کە هەوڵمان ئەوە بێت ناکۆکیبێژ نەبین؟ گرفتی ئێمە لەم لێکۆڵینەوەدا ئەوەیە کە ئێمە خێراو ئاسان درۆ تاوانبار دەکەین، بەڵام ئایا بۆ تێگەیشتنی دەکرێ بە پێی راستیو درۆ بیر نەکەینەوە، بەڵکو بزانین ناکۆکیبێژی چییە؟ هۆکاری ناکۆکیبێژی ئێمە چییە؟ بۆچی لە دەروونی ئێمەدا ناکۆکی هەیە؟ ئایا ئەمە کۆششێکی بەردەوام بۆ بوون بە شتێك لەبەر چاوی ئەوانیتر یان خۆ دا نیە؟ ئێمە دەمانەوێت خۆمان لەگەڵ نموونەکاندا هاوشێوە بکەین، ئەگەر کەسێك خۆی لە سەرمەشق و نموونەیەك نزیك نەکاتەوە، ناکۆکی هەیە؟

ئێستا بزانین هۆکاری بوونی نموونە، پێوەر، نزیك خستنە یان ئیدەیەك کە هەوڵدەدەین خۆمانی پێ بگەیەنین چییە؟ بێگومان ئەم کۆششە بۆ ئەوەیە کە تەندروست، دڵنیاو خۆشەویست بین و سەبارەت بە خۆمان و ئەوانیتر بۆچوونێکی باشمان هەبێت، هەوێنی ناکۆکی هەیە. تا کاتێ کە ئێمە خۆمان لە شتێك نزیك دەکەینەوەو تێدەکۆشین ببین بە شتێك، ناکۆکیش دەبێ ببێت و هەر بۆیە ئەم کەلێنەی نێوان راست و درۆیش دەبێ لە نێو نەچێت. بەڕای من ئەوەی کە گرنگە و بە ئارامی لە سەری لێکۆڵینەوە بکەین، ئەوەیە کە هۆکاری

ناکۆکی لە دەروونی ئێمەدا چییە؟ نە ئەوەی کە نکۆڵی لە بوونی درۆو راست لە دەروونی خۆماندا بکەین. ئایا هۆکارەکەی ئەمە نییە کە دەمانەوێت شتێك بین؟ شەریف، شیاو، دژکام، داهێنەرو خوشحاڵو ... بین؟ هەر لەم حەز بە شتێك بوونەدا ـ حەز بە شتیتر نەبوون ـ ناکۆکی هەیە. هەر ئەم ناکۆکییەیە کە زۆر رووخێنەرە. ئەگەر کەسێك بتوانێت بە تەواوی لەگەڵ شتێکدا هاوشێوە بێت ـ هەرچی بێت ـ ئەوا ناکۆکی رادەوەستێت، کاتێ بەڕاستی ئێمە خۆمان لەگەڵ شتێکدا بە تەواوی هاوشێوەو یەکسان بکەین، دەرگا بە رووی "خود"دا دادەخرێت و خۆڕاگری کە هۆکاری تێکچوونی هاوسەنگییە، دروستدەبێت.

بەڕاستی بۆچی لە دەروونی ئێمەدا ناکۆکی هەیە؟ من کارێکم کردووەو نامەوێت ئاشکرا بێت، فیکریكێ گەیشتووەتە زەینم و لەگەڵ پێوەردا یەك ناگرێتەوە، تووشی بارودۆخێکی ناسازگارم دەکات کە لێی بێزارم. کاتێ نزیك خستنەوە هەیە، دەبێ ترسیش هەبێت، هەر ئەم ترسەیە کە ناکۆکی ساز دەکات. لە حاڵێکدا ئەگەر مەسەلەی کران لە گۆڕێدا نەبێت و تێکۆشان بۆ بوون بە شتێك لە ئارادا نەبێت، ئەوا ناکۆکیش نییە. لە دەروونی ئێمەداو لە هیچ ئاستێکدا ـ چ لە هەستو چ لە نەستدا ـ درۆ جێ خۆش ناکات و شتێکیش کە سەرکوت بکرێ یان پیشان بدرێت پەیدا نابێت. لەبەر ئەوەی کە زۆربەی ژیانی ئێمە ئاوێتەیەکە لە بارودۆخ و هەلومەرجەکان، زۆربەی ئێمە بە پێی ئەو حاڵ و وەزعەی کە هەمانە ئەوەی کە ناکۆکییە باسی دەکەین. کاتێ حاڵ و وەزع نەمێنێت هەر دەبینەوە بەو شتەی کە هەین. ئەوەی کە گرنگە هەر ئەم ناکۆکییەیە نە ئەوەی کە ئێوە درۆیەکی مەسلەحەتی مۆحتەرەمانە دەڵێن یان نا. تا کاتێ کە ئەم ناکۆکییە هەیە، دەبێ بوونێکی ئاشکرا ببێت و بە پەیڕەوی لەویش ئەو ترسە رواڵەتیانە کە دەبێت ئاگاداریان بین ـ و دواتر درۆ مەسڵەحەتییەکان ـ دەزانن باقیی کارەکانیتر بۆخۆیان بە دوای ئەمانەدا دێن. وەرن لەسەر ئەم مەسەلە ورد ببینەوە نە ئەوەی بپرسین درۆ چییەو راست کامەیە، بەڵکو بەبێ سەرنجدان بەم ناسازگارییانە مەسەلەی ناکۆکی لە خۆماندا باسبکەین، شتێکە کە زۆر دژوارە، چونکە لەبەر ئەوەی کە ئێمە زۆر پشتمان بە هەستو سۆز بەستووە، زۆربەی ژیانی ئێمە لە ناکۆکی پێکهاتووە. ئێمە بە باوەڕو بیرەوەری باوەڕ دەکەین، ترسی زۆرمان هەیە کە دڵمان دەخوازێت لە ژێر پەردەیەکدا بیانشارینەوە، تەواوی ئەمانە لە دەروونی ئێمەدا ناکۆکی ساز دەکەن، کاتێ توانای تەحەمولی ئەم ناکۆکییە لە نێو بچێت، مرۆڤ شێت دەبێت. مرۆڤ خوازیاری ئاشتییە بەڵام هەرچی کە ئەنجامدەدات خولقێنەری شەڕە، نە تەنیا لە



خێزاندا، بەڵکو لە دەرەوەی بنەماڵەشدا هەروایە. ئێمە بە جێگای تێگەیشتن لەوەی کە هۆکاری ناکۆکییە تەنیا هەوڵدەدەین ببین بەمە یان ببین بەوەو هەر ئەمەش کەلێن دروسدەکات. ❊ ئایا تێگەیشتن لە هۆکاری ناکۆکی مەیسەرە؟ ئەڵبەت نە بە شێوەی رواڵەتی بەڵکو بە شێوەیەکی زۆر قووڵترو دەروونناسانە؟ سەرەتا ئایا مرۆڤ دەزانێت کە ژیانی تێکەڵ بە ناکۆکییە؟ ئێمە ئاشتیخوازین، دواتر قسە لە ناسیۆنالیزم دەکەین، دەمانەوێت لە بەلای کۆمەلایەتی دووری بکەین، بەلام بەو حاڵەش، یەك بە یەکی ئێمە "تاك خوازی"، سنووردارو لە حەساری خود داین، ئێمە بەردەوام لە ناسازگاری و ناکۆکیدا دەژین، بۆچی؟ هۆی چییە ئێمە کۆیلەی هەست و سۆزین؟ ئەمە نە دەبێ نکۆڵی لێ بکرێ و نە دەبێ قبووڵبکرێت. پێویستی بە تێگەیشتنی زۆر لە ئارەزووەکان هەیە کە هەمان مانای رواڵەتی هەست و سۆزن. ئێمە خوازیاری شتی زۆرین کە هەرکامەیان لەگەڵ ئەویتردا لە ناتەبایی دایە. ئێمە بێئەندازە ماسکی دژی یەك و ناکۆکین. هەرکات ماسکێ بۆ ئێمە گونجاو بوو هەڵیدەگرین و لەسەر روخسارمانی دادەنین. ئەگەر ماسکێکیتر بۆ ئێمە بەکەڵکترو پڕخێرتر بوو ئەوا یەکەمین لا دەبەین. ئەم بارودۆخە ناکۆکەییە کە دەبێتە هۆی درۆکردن و لە هەمبەریدا "راستی" دەخولقێنین، بەلام لەڕاستیدا "راستی" دژی "درۆ" نیە. ئەوەی کە خاوەنی ناکۆکییە، ناوی "راستی" نیەو بۆ تێگەیشتنی قووڵ لەم مەسەلە، مرۆڤ دەبێت لە تەواوی ئەو ناکۆکییانەی کە تێدا دەژیت ئاگادار بێت. وتنی: "تۆم خۆش دەوێت" لە لایەن منەوە، تێکەڵە بە بەخیلی، هەڵچوون و ترس ـ کە ناکۆکییە ـ ئەوەی کە دەبێت فام بکرێت هەر ئەم ناکۆکییەیە و مرۆڤ تەنیا کاتێ لێی تێدەگات کە لێی ئاگادار بێت، ئاگادار تەنیا دەبێت چاودێری بکات نە ئەوەی کە تاوانباری بکات یان سزای بدات. بۆ ئەوەی کە پاسیڤانە بڕوانین بۆ ئەو ناکۆکییە دەبێت لە شێوازی پاساودان و تاوانبارکردن بە تەواوی تێبگەین.

پاسیڤانە روانین بۆ شتێك ئاسان نیە، بەلام بە تێگەیشتن، مرۆڤ بەرەبەرە لە گشت ئاراستەی رێگاکانی هەست و هزری تاك شارەزا دەبێت. کاتێ مرۆڤ لە مانای تەواوی ناکۆکی لە دەروونی خۆیدا ئاگادار بێت، ئەم ئاگاداربوونە دەبێتە هۆی گۆڕانێکی بێوێنەو لەو حاڵەدا، هەر خۆتان دەبن بەو شتەی کە هەوڵدەدەن ببن. ئیتر بەدوای پەیداکردنی خۆشیو ئیدەئالدا ناڕۆن. ئێوە هەر ئەوەن کە هەن و دەتوانن لێرەوە دەس بەکار ببن. لەو حاڵەدا ئیتر ناکۆکییەك نابێت. ❊

## ۳۰ـ دەربارەی پەروەردگار

**پرسیار: ئێوە لە هەقیقەت تێگەیشتوون. ئایا دەتوانن بڵێن خوا چییە؟**

**کریشنا مورتی:** چۆن دەزانن کە من هەقیقەتم فام کردووە؟ بۆ ئەوەی کە بزانن من لە هەقیقەت تێگەیشتووم، ئێوەش دەبێت هەقیقەتتان فام کردبێت. ئەم وەڵامە زیرەکانە نیە. بۆ زانینی شتێك دەبێت بەشێك لەو شتە بیت. ئێوەش بۆخۆتان دەبێت ئەو شتەتان تاقی کردبێتەوە، کەوابوو ئەمەی کە ئێوە دەڵێن من لە راستی تێگەیشتووم بەرواڵەت بێ‌مانایە. چ جیاوازییەك هەیە کە من تێگەیشتبێتم یان تێنەگەیشتبێتم. ئایا لەوەی کە من دەڵێم هەقیقەت نیە؟ تەنانەت ئەگەر من پێگەیشتووترین و پۆختەترین مرۆڤی رۆژگار بم، ئەگەر ئەوەی کە من دەڵێم هەقیقەت نەبێت چ پێویستییەك دەکات کە ئێوە گوێی بۆ بگرن؟ بێگومان تێگەیشتنی من لەگەڵ ئەوەی کە من دەڵێم بە هیچ جۆر پەیوەندییان نیە. ئەگەر مرۆڤێ ئەویتر پەرستش بکات لەبەر ئەوەی کە ئەم ئەویترە لە هەقیقەت تێگەیشتووە، لە راستیدا ئەمە جۆرێ پەرستشی دەسەڵاتە و مرۆڤێکی وایش هەرگیز بە هەقیقەت ناگات. تێگەیشتنی ئەوەی کە هاتۆتە دی و ناسینی ئەو کەسەی کە هەقیقەتی فام کردووە بە هیچ جۆر بایەخی نیە.

دەزانم کە هەموو تەریقەتەکان باوەڕیان وایە کە: "لەگەڵ کەسێکدا بن کە لە هەقیقەت تێگەیشتبێت" چۆن دەبێت بزانین کە تاکێك بە هەقیقەت گەیشتووە؟ تەنیا کارێ کە دەکرێ ئەوەیە کە لەگەڵێدا هەڵسوکەوت بکەیت گەرچی ئەمەش ئەمرۆژە زۆر دژوارە. لەم دنیادا مرۆڤی چاك بە مانای راستیی وشە ئێجگار کەمە، مەبەست لە مرۆڤی چاك ئەو مرۆڤانەن کە بەدوای پەیداکردنی شتێکدا نارۆن و تاقیبی شتێك ناکەن. ئەوانەی کە لە تاقیبی شتێکدان یان بەدوای شتێکەوەن، چەوسێنەرانی زیاتر نین، هەربۆیە پەیداکردنی کەسێ کە مرۆڤ بەراستی خۆشی بوێت و لەگەڵی هەڵسوکەوت بکات دەگمەنە. ئێمە لەو کەسانەی کە بە هەقیقەت گەیشتوون ئیدەئالێك ساز دەکەین و هیوادارین کە شتێکمان پێ بدەن کە ئەمە پەیوەندییەکی هەڵەیە. چۆن کەسێ کە بە تێگەیشتنی هەقیقەت گەیشتووە، دەتوانێت بەبێ ئەشق پەیوەندی دامەزرێنێت؟ گرفتی ئێمە ئەمەیە. ئێمە لە هیچ کام لە باسەکانی خۆماندا یەکترمان خۆش ناوێت، بەرامبەر یەکتر بەگومانین، ئێوە لە من شتێکی وەك زانست و تێگەیشتن لە هەقیقەتتان دەوێت یان دەتانەوێت لەگەڵ من ببنە هاودەم کە هەر هەمووی نیشانەی ئەوەن کە ئێوە کەسێکتان خۆش ناوێت. ئێوە شتێکتان دەوێت، کەواتە لە بیری ئەوەدان بچەوسێنەوە. ئەگەر ئێمە بەراستی یەکترمان خۆش ویستبا، پەیوەندی گورج دادەمەزرا. بەم جۆرە، چ



جیاوازییەك هەیە کە ئێوە لە هەقیقەت تێگەیشتبێتن و من پێنەگەیشتبێتم یان ئەوەی کە ئێوە لە سەرەوە بن یان لە خوارەوە. بەهۆی ژاکاویی دڵەکانی ئێمە، پەروەردگار بایەخی زۆری پەیدا کردووە. لەبەر ئەوە دەتانەوێت خوا بناسن کە ئاوازی دڵتان لە بیر چووەتەوە و ئێستا بەدوای گۆرانی زانێکەوەن و لێی دەپرسن کە ئایا دەتوانێت خوێندتان پێ فێر بکات. ئەو دەتوانێت بە ئێوە تەکنیکی خوێندن فێربکات، بەڵام ئەم تەکنیکە نابێتە هۆی داهێنان، تەنیا فێرکردنی تەکنیکی خوێندن ئێوە ناکات بە موسیقی زان. لەوانەیە ئێوە تەواوی هەنگاوە تایبەتییەکانی هەڵپەڕین شارەزا بن، بەڵام ئەگەر داهێنان لە دڵتاندا نەبێت وەك ماشینێك ئیشدەکەن. ئەگەر ئامانجی ئێوە گەیشتن بە ئەنجامێك بێت دۆستان پێ رازی نابێت. شتێ بە ناوی ئیدەئال نییە، چونکە ئیدەئال جۆرێ گەیشتن بە رازیبوونە. جوانی رازیبوون نییە، هەقیقەتە، ئێستایە، ئێستا نە داهاتوو. ئەگەر ئەڤین هەبیت لە نەناسراو تێدەگەن، خواوەند دەناسن و پێویست ناکات کەسێك بە ئێوەی بناسێنێت و جوانی ئەڤین هەر لەمەدایە. ئەڤین یانێ نەمری. لەبەر ئەوە لە دەروونماندا ئەڤین نییە ئەویترمان دەوێت یان بە دوای خوادا دەگەڕێین تا ئەوەی وا نیمانە پێمان بدەن. ئەگەڕ بەراستی ئەڤینمان دەبوو، دەزانن ئەم دونیا دەبووە چ دونیایەکیتر؟ ئێمە دەبێت کەسانی خۆشحاڵ بین. هەربۆیە نابێت لە شتەکان، بنەماڵەو ئیدەئالەکاندا بەدوای خۆشحاڵیی خۆماندا بگەڕێین. ئێمە دەبێت خۆشحاڵ بین، کەواتە نابێت شتەکان، ئیدەئالەکان و خەڵکان بەسەر ژیانی ئێمەدا زاڵبن. ئەمانە کاروباری پلە دوون. لەبەر ئەوە ئەڤین لە دەروونی ئێمەدا نیەو ئێمە خۆشحاڵ نین، لە شتەکاندا سەرمایەگوزاری دەکەین بەو هیوایەی کە بە ئێمە خۆشحاڵی بدەن، یەکێ‌تر لەو کارانەی کە تێدا سەرمایەگوزاری دەکەین، خوایە.

ئێوە لە منتان دەوێت کە پێتان بڵێم هەقیقەت چییە؟ ئایا ئەوەی کە وەسفنەکرێت، دەکرێ بە وشەکان دەربببڕین؟ ئایا شتێ کە نەپێورێت ئێوە دەتوانن بیپیون؟ ئایا دەتوانن با لە مشتتاندا زیندانی بکەن؟ ئەگەر کردتان ئایا ئەوە بایە؟ ئەگەر ئەوەی کە ناپێورێت بیپێون، ئایا راستەقینەیە؟ ئەگەر بیکەن بە فۆرموڵ دەبێت بەراستی؟ بێگومان نا، لەبەر ئەوە هەر لەو چرکەیدا کە ئێوە شتێك کە وەسفناکرێت وەسفدەکەن، ئیتر هەقیقەت نیە. هەر ئەو چرکەی کە نەناسراو بکەن بە ناسراو، ئیتر ئەوەی کە نەناسراوە، نیە. کەواتە ئەمە هەر ئەو شتەیە کە بە شەوق و ئارەزووەوە بەدوایەوەین. ئەو کاتە هەستدەکەین دەتوانین خۆشی کۆتاییو هەمیشەیی رام بکەین. دەمانەوێت بزانین، چونکە خۆشحاڵ نین، چونکە بە وەزعێکی سەخت تێدەکۆشین، چونکە لە پێ‌کەوتووین و ورد بووین. هەر بۆیە لە جیاتی پەیداکردنی ئەو راستییە سادە ـ کە

ئێمە سووك كراوین، كە ئێمە مەلوول، ماندوو، دڵژێچوون، پڕ لە بەڵاو ئاژاوەین ـ دەمانەوێت لەوەی كە ناسراوە دوور بكەوینەوەو بڕۆینە لای نەناسراوەكان كە دیسانەوە دەناسرێن، كەوابوو ئێمە هەرگیز بە هەقیقەت ناگەین.* كەواتە لە جیاتیی ئەوەی كە بپرسن بە هەقیقەت گەیشتوون یان خوا چییە؟ بۆچی هەموو هەستتان ئاراستەی "ئەوەی كە هەیە" ناكەن؟ لەو حاڵەدا نەناسراو پەیدا دەكەن یان چاكتر بڵێم نەناسراو بەرەولای ئێوە دێت. ئەگەر لەوەی كە ناسراوە تێبگەن، ئەوكات ئەو ئارامییە بێوێنە كە تەڵقین ناكرێت، ئەو خاڵیبوونە كە داهێنەرەو راستی تەنیا دەتوانێت لەو نزیك ببێتەوە، تاقیدەكەنەوە. راستی لەوەی كە لە حاڵی كراندایەو ئەوەی كە تێدەكۆشێت، نزیك نابێتەوە، تەنیا شتێك نزیك دەبێتەوە كە بوونە، شتێكە "ئەوەی هەیە" فام دەكات. ئەوكات تێدەگەن كە راستی لە مەودایەكی دووردا نیە، لەگەڵ نەناسراودا مەودایەكی ئەوتۆتان نیە، بەڵكو دەتوانن لە "ئەوەی كە هەیە" پەیدای بكەن. لەبەر ئەوە وەڵام بە مەسەلەكە لە خودی مەسەلە دایە، كەواتە راستیش لە"ئەوەی هەیە"دا هەیە، ئەگەر بتوانین لێی تێبگەین، ئەوا هەقیقەتیش دەناسین.

ئاگاداربوون لە رەنج، تەماح، خراپەخوازی، مەزنخوازی و شتی لەم جۆرە، بێئەندازە دژوارە. واقیعیەتی ئاگاداربوون "لە ئەوەی هەیە" كتوومت هەقیقەتە. ئەوەی ئازادی دەبەخشێت هەقیقەتە نە تێكۆشانی ئێوە بۆ ئازادی. كەواتە هەقیقەت دوور نیە، بەڵام ئێمە دوور رادەگرین، چونكە دەمانەوێت وەك ئامرازێك بۆ بەردەوام بوونی خۆمان كەڵكی لێوەربگرین. هەقیقەت لێرەدایە، هەر ئێستا، بەبێ مەودا، هەمیشەیی یان جیا لە زەمان بوونیش هەر ئێستایەو ئەو كەسەی كە لە تۆڕی زەماندا گرفتار بووە، لە ئێستا تێناگات. رزگاری لە هزر پێویستی بە كردەوەیە. بەڵام زەین تەوەزەل و تەمەڵە، هەربۆیە بەردەوام كۆسپی دیكە دروستدەكات. ئەم كارە تەنیا لە رێگای تێفكرینی دروستەوە مەیسەرە، یانێ پراكتیكی تەواو، نە پراكتیكی بەردەوام، فامی پراكتیكی تەواو تەنیا كاتێ مەیسەرە كە زەین دەتوانێت رەوتی بەردەوامبوون كە هەمان بیرەوەریە ـ نە بیرەوەری راستی، بەڵكو بیرەوەریی دەروون ناسانە ـ پەیدا بكات. تا كاتێ كە یاد خەریكی كاركردنە، زەین ناتوانێت لە "ئەوەی كەهەیە" تێبگات، بەڵام ئەگەر تاك مانای كۆتاییهاتن تێبگات، زەین و دەروونی لەڕادەبەدەر داهێنەر دەبن و بە چەشنێكی پاسیڤانە وشیار دەبێت، چونكە ژیان لە كۆتایی هاتن دایە، گەرچی لە بەردەوام بووندا، گەندەڵی و مردن جێگایان هەیە.



## ٣١ـ دەربارەی تێگەیشتنی خێرا

**پرسیار: ئایا ئێمە دەتوانین بەبێ ئەوەی كە لە پێشدا ئامادەییمان هەبووبێت، لە ئەوەی كە ئێوە پێی دەڵێن هەقیقەت، تێبگەین؟**

**كریشنا مورتی:** مەبەستتان لە هەقیقەت چییە؟ وەرن لەو وشانەی كە ماناكانیان نازانین كەڵك وەرنەگرین. دەتوانین لە جیاتی ئەوە لە وشەیەكی سادە كەڵك وەربگرین. ئایا دەتوانن لە گرفتێك راستەوخۆ تێبگەن؟ واتە ئەو شتەی كە مانای رواڵەتی گرفتەكەیە، ئایا دەتوانن "ئەوەی كە هەیە" هەر ئێستاو بێدرەنگ تێبگەن؟ بە گەیشتن لە "ئەوەی كە هەیە" ئێوە دەتوانن لە چەمكی هەقیقەت تێبگەن، بەڵام ئەگەر بڵێین: مرۆڤ دەبێت هەقیقەت تێبگات، ئەمە مانایەكی ئەوتۆی نیە. ئایا دەتوانن لە گرفتێك راستەوخۆ تێبگەن و لە شەڕ رزگار بن؟ ئەمە مانای رواڵەتیی ئەم پرسیارەیە، وانیە؟ ئایا ئێوە دەتوانن لە قەیرانێك یان كێشەیەك بەخێرایی تێبگەن؟ ئایا دەتوانن لە تەواو ماناكەی تێبگەن و لە چنگی رزگار بن؟ ئەوەی كە تێدەگەن تەواوی ئەو شتەیە هەر بۆیە فامین یان هەقیقەت رزگاریبەخشە. ئایا دەتوانن لە چنگی گرفتێك یان كێشەیەك هەرئێستارزگاربن؟بێگۆمان ژیان بریتییە لەكومەلەیەك لە كێشەو وەڵامەكان، ئەگەر ئێوە بە كێشەیەكی مەرجی وەڵامی سنووردارو ناتەواو بدەنەوە، ئەوا ئەو كێشە شوێن پێ و پاش ماوەیەك لە خۆی بەجێ دەهێڵێت كە لە لایەن كێشەی دیكەوە زیاتر بەهێز دەبێت. كەواتە، لە لایەك پاشماوەی بەردەوامی بیرەوەریەكان، هێماكان و ئەوەی كۆمان كردوەتەوە وەستاون و لەلایەكیتر، هەوڵی ئێمە ئەوەیە كە تازە ببینین و هەر بۆیە شتی وا هەرگیز مەیسەر نابێت و سەرئەنجام نە تێگەیشتنێك دەبێت و نە رزگاری لە چنگی هەر چەشنە كێشەیەك.

گرفتی ئێمە ئەوەیە كە ئایا دەكرێ لە كێشەیەك بە تەواوی راستەوخۆ تێبگەین؟ تەواوی ماناكەی، خۆشییەكانی، قووڵایی، جوانی و دزێوی هەست پێ بكەین و لە تۆڕی رزگار بین؟ كێشە هەمیشە تازەیە، گرفت هەمیشە تازەیە. بۆ نموونە گرفتێ كە دوێنێ بووتان، ئەوەندە هاوسەنگ بووە كە كاتێ ئەمڕۆ دەیبینن، تازەی تازەیە، بەڵام ئێوە بە شێوازێكی كۆن لەگەڵی بەرەوڕوو دەبنەوە، چونكە ئێوە بەبێ گۆڕان لەگەڵی رووبەڕوو دەبنەوە، ئێوە تەنیا فكری خۆتان هاوسەنگ دەكەن.

ئیزن بدەن بە شێوەیەكی دیكە باسیبكەم. من دوێنێ ئێوەم دی. لەم ماوەدا ئێوە گۆڕان و هاوسەنگیتان پەیدا كردووە، بەڵام من هێشتا هەر وێنەی دوێنێی ئێوەم لە زەیندا هەیە. ئەمڕۆ

من ئێوە هەر بەو وێنەوە دەبینم کە هەم بوو، کەوابوو ئێوە فام ناکەم. من تەنیا لەو وێنەی کە دوێنێ لە ئێوە کێشاومە تێدەگەم. ئەگەر بڕیار بێت لە ئێوە ـ ئێوەیەك کە گۆڕاون و هاوسەنگیتان پەیدا کردووە ـ تێبگەم، دەبێت ئەو وێنەی دوێنێ بسڕمەوە و خۆم لە چنگی رزگار بکەم. بە دەربڕینێکی تر، بۆ تێگەیشتن لە کێشەیەك کە هەمیشە تازەیە، منیش دەبێت لە سەرەتاوە لەگەڵی بەرەوڕوو ببمەوە و ئەمەش نابێت پاشماوەیەك لە دوێنێ بێت و هەربۆیە لەگەڵ دوێنێدا ماڵئاوایی بکەم.

کەواتە ژیان چییە؟ ئایا شتێکی بەردەوام تازەیە؟ بەڵێ، شتێکە کە بەردەوام دەگۆڕدرێت و هەستی تازە دروستدەکات. ئەمڕۆ هەرگیز دوێنێ نیەو ئەمە جوانیی ژیانە. ئایا ئێوەو من دەتوانین لەگەڵ هەر گرفتێکدا لەسەرەتاوە دەسپێبکەینەوە؟ ئایا کاتێ ئێوە دەچنەوە بۆ ماڵ، دەتوانن ژن و منداڵەکەتان لە هەوەڵەوە ببینن؟ ئایا دەتوانن لەگەڵ کێشەیەکدا چاوپێکەوتنێکی تازەتان هەبێت؟

ئەگەر باری بیرەوەریەکانی دوێنێتان لەسەر شان بێت، هەرگیز ناتوانن ئەم کارە ئەنجامبدەن. کەوابوو بۆ تێگەیشتن لە هەقیقەتی گرفتێك یان پەیوەندییەك دەبێت لە سەرەتاوە لەگەڵی بەرەوڕوو ببنەوە نە بە زەینێکی ئاوەڵاوە، چونکە ئەمە مانای نیە. ئێوە دەبێت بە بێئەوەی کە نیشانەیەك لە بیرەوەرییەکانی دوێنێتان لە تەکدا بێت، لەگەڵی بەرەوڕوو ببنەوە، یانێ هەرکە کێشەیەك سەرهەڵدێنێت ئێوە دەبێت لە تەواوی وەڵامەکانی دوێنێ ئاگادار بن و هەر بەم ئاگاداربوونە لە پاشماوەی بیرەوەریەکانی دوێنێ، تێدەگەن کە بێ هیچ هەوڵ و تێکۆشانێك لە نێو دەچن و بەم جۆرە زەینی ئێوە تازە دەبێتەوە.

ئایا ئێمە دەتوانین بەبێ ئەوەی کە لە پێشدا ئامادەییمان هەبووبێت، لە هەقیقەت تێبگەین؟ من دەڵێم ئەرێ، نە لە رێگای ئەندێشەکردنی شەخسی و نە لە رێگای گومان و خەیاڵەوە، بەڵکو لە رووی دەروونناسییەوە تاقیبکەنەوەو خۆتان لێی تێدەگەن. هەر جۆرە کێشە یان هەر رووداوێك کە دەتانەوێت لەبەرچاو بگرن ـ چاوەڕێی قەیرانە گەورەکان مەبن ـ و بزانن کە چۆن لە هەمبەری ئەوانەدا دژکردەوە ئەنجامدەدەن؟

ئەگەر لە دژکردەوەکان، ئامانج و بۆچوونەکانی خۆتان ئاگادار بن لەوانە تێدەگەن و لە رابردووی زەینی خۆتانیش ئاگاداردەبن. من بە دڵنیاییەوە بە ئێوە دەڵێم کە ئەگەر تەواوی هەست و هۆشتان بخەنە سەر ئەوە، ئەم کارە دەسبەجێ ئەنجام دەبێت. ئەگەر بەدوای پەیداکردنی مانای وردو تەواوی رابردووی زەینی خۆتانەوە بن، ئەم تاقیب کردنە بەکەڵك



دەبێت، لەو حاڵەدا، لە چاو تروکاندنێکدا لە هەقیقەت تێدەگەن و گرفتەکە پەیدا دەکەن. تێگەیشتن لە ئێستا، هەر لە ئێستاوە کە هیچ کات زەمان ناناسێت، روو دەدات. گەرچی لەوانەیە سبەی بێت، بەڵام هێشتا ئێستایە، دواخستنی رووت، ئامادەبوون بۆ قەبووڵی ئەوەی کە تاك ئەوەیە، واتە نەهێڵێت خۆی لەوەی کە ئێستایە، تێبگات. بە دڵنیاییەوە ئێوە دەتوانن راستەوخۆ لەوەی کە ئێستایە تێبگەن. بۆ تێگەیشتنی ئەوەی کە هەیە، نابێت لە دەروونی ئێوەدا شێواندن و وازهێنان هەبێت، دەبێت زەینو دڵتانی پێ بسپێرن و لەو چرکە تایبەتەدا ئەوە بە تەنیا مەسەلەی جێی ئۆگری خۆتان بزانن. لەو حاڵەدا، ئێوە دەتوانن "ئەوەی کە هەیە" بە قووڵی ببینن و لە مانای تەواوی تێبگەن و بەم جۆرە لە چنگی ئەو گرفتە رزگار دەبن.

ئەگەر دەتانەوێت لە هەقیقەت تێبگەن و بۆ نموونە هەر ئێستا دەتانەوێت لە چەمکی وەك خاوەنیەتی راستەوخۆ تێبگەن، چۆن لەگەڵی رووبەڕوو دەبنەوە؟

بێگومان دەبێت لەگەڵ گرفتدا هەست بە نزیکی بکەن، نابێت لێی بترسن و نابێت لە نێوان ئێوەو گرفتدا هیچ جۆرە باوەڕ پێبوونێکی تایبەتی یان هیچ جۆرە وەڵامێك هەبێت. تەنیا کاتێ کە ئێوە راستەوخۆ لەگەڵ گرفتەکەدا لە پەیوەندیدا بن، دەتوانن وەڵامەکە پەیدا بکەن. ئەگەر وەڵامێك پێشنیار بکەن و دەسبکەن بە داوەریکردن و هیچ ویستێکی دەروون ناسانەتان نەبێت، ئەوا کارەکە بەدوا دەخەن و خۆتان ئامادەی تێگەیشتن لە سبەی دەکەن کە تەنیا لە "ئێستا"دا دەکرێ لێی تێبگەن. هەربۆیە هەرگیز بە تێگەیشتن ناگەن. ئەندێشەکردنی هەقیقەت هەرگیز پێویستی بە ئامادەیی نیە. ئامادەیی هەمیشە لەگەڵ زەمان دایە و زەمان، ئامرازی تێگەیشتنی هەقیقەت نیە. زەمان بەردەوام بوونە و هەقیقەت، بەردەوام بوون و زەمان ناناسێت. لە تێگەیشتندا بەردەوام بوون نیە، شتێکە چرکەبەچرکە و پاشماوەی نیە.* بە داخەوە دەبێت بڵێم کە من کارێ دەکەم کە ئەم مەسەلە بە تەواوی دژوار بێتە بەرچاو، ئەی وانیە؟ بەڵام تێگەیشتن سادەو ئاسانە بە مەرجێك تاقیبکەنەوە. ئەگەر بڕۆنە ئەو دونیاو دەسبکەن بە خەیاڵڕێسی و لە بارەیەوە بیر بکەنەوە، کارەکە زۆر دژوار دەبێتەوە. کاتێ لە نێوان ئێوەو (من) **دا** بەربەستێك نیە، من ئێوە فام دەکەم. ئەگەر من لە بەرامبەر ئێوەدا کراوە بم، راستەوخۆ ئێوە فام دەکەم و کراوەبوون مەسەلەیەك نییە کە پەیوەندی بە زەمانەوە بێت. ئایا زەمان دەبێتە هۆی ئاوەڵایی و کراوەیی من؟ ئایا ئامادەیی، سیستەم و دیسیپلینی من لە بەرامبەر ئێوەدا کراوە دەکات؟ نەخێر، ئەوەی کە من لە بەرامبەر ئێوەدا کراوە دەکات

نیەتی منە بۆ تێگەیشتن. من دەمەوێت کراوە بم، چونکە شتێکم بۆ شاردنەوە نیەو ناترسم، کەوابوو، کراوەم و پەیوەندی فیکری و سۆزداری دەسبەجێیە و هەقیقەت هەیە. بۆ تێگەیشتنی هەقیقەت، بۆ ناسینی چێژو جوانیی هەقیقەت دەبێت قەبوولکردن و وەرگرتنی خێرا هەبێت، وەرگرتنێ کە تئۆری، ترس و وەڵامەکان ئەویان لێڵ نە کردبێت.

## ٣٢ـ دەربارەی سادەیی

**پرسیار: سادەیی چییە؟ ئایا ئاماژە بە دیتنی زۆر روونی بنەما دەکات و چاوپۆشیکردن لە شتەکانی تر؟**

**کریشنا مورتی:** یەکەم جار وەرن تێبگەین کە سادەیی نیە. نەڵێن: "ئەمە رەتکردنەوەیە" یان "شتێکی ئەرێنیێ بە ئێمە بڵێ" دژکردەوەیەکی وا کاڵ و کرچ و تێکەڵ بە بیر نەکردنەوەیە. ئەوانەی کە "ئەرێنییەکان" لەبەر دەستی ئێوە دادەنێن چەوسێنەرن. ئەوان شتێك بە ئێوە دەدەن کە ئێوە خوازیارین و لە رێگای ئەوەوە کەڵکی خراپ لە ئێوە وەردەگرن. بەڵام بە هیچ جۆر کاری وا ناکەین. ئێمە هەوڵدەدەین هەقیقەتی سادەیی پەیدا بکەین. کەواتە، ئێوە دەبێت ئەو ئیدەیانەی کە لە پشت ئەم بابەتەوە هەتانە وەلاوەی بنێن و لەسەررا دەس بە روانین بکەن. مرۆڤێ کە زۆری هەیە، لە شۆڕشی دەروونی و دەرەوەیی دەترسێت.

وەرن بزانین چ شتێك سادەیی نیە؟ زەینی پێچاوی، زەینی سادە نیە. زەینی بەهۆش، زەینی سادە نیە، زەینێ کە ئامانجێکی لە پێش دایەو بۆ گرتنی پاداش یان لە ترسا ئیشی بۆ دەکات، زەینێکی سادە نیە. زەینێ کە لە ژێر بارێکی قورس لە زانست دایە، سادە نیە. زەینێ کە باوەڕ ئیفلیجی کردووە سادە نیە. زەینێ کە خۆی لەگەڵ شتێکی گەورەتردا هاوشێوە کردووەو تێدەکۆشێت ئەو شوناسە رابگرێت، زەینێکی سادە نیە. ئێمە هەستدەکەین کە ئەگەر یەك دوو کەم و کۆڕمان هەبێت، ئەوا سادەین، ئێمە دەمانەوێت رواڵەتی سادەیی نیشان بدەین، هەربۆیە ئەم کارەش زۆر زوو فریومان دەدات. هەر لەبەر ئەم هۆکارەیە کە مرۆڤێ کە زۆر دەوڵەمەندە، ئەو کەسەی کە پیشەی قەناعەت کردنە، دەپەرستێت.

سادەیی چییە؟ ئایا دەکرێ سادەیی بە دوور رشتنی شتە ناسەرەکییەکان و بە شوێن گرتنی شتە بنچینەییەکان ـ کە ناوی شێوازی هەڵبژاردنە ـ بزانین، ئایا سادەیی هەمان هەڵبژاردن نیە؟ هەڵبژاردنی بنەماو دوور رشتنی شتی ناسەرەکی؟



ئایا سادەیی لە زەیندا نیە؟ جیاوازییەك نییە کە ئێوە ناوی چی لەسەر دابنێن. ئێوە دەڵێن: "من ئەمە هەڵدەبژێرم کە سەرکییە"، چۆن دەزانن کە بنەماو سەرەکی کامەیە؟ یان نموونەیەکتان هەیە کە خەڵکانیتر بە ئێوەیان گووتوە یان ئەزموونی تایبەتیتان بە ئێوە دەڵێت کە ئەو شتە سەرەکییە. ئایا دەتوانن متمانە بە ئەزموونی خۆتان بکەن؟ کاتێ هەڵدەبژێرن، هەڵبژاردنتان بە پێی حەزی ئێوەیە. ئەوەی کە پێیدەڵێن "بنەما" هەر ئەو شتەیە کە ئێوە رازی دەکات. کەوابوو دووبارە دێنەوە سەر هەمان گەندە رەوت، ئەی وا نیە؟ ئایا زەینێکی پەرێشان دەتوانێت هەڵبژێرێت؟ ئەگەر دەتوانێت، هەڵبژاردنیش دەبێت پەرێشان بێت.

کەوابوو تەڵکردن لە نێوان ئەوەی کە سەرەکییە و ئەوەی کە ناسەرەکییە، سادەیی نیە. ئەمە ناکۆکییکە. زەینێ کە لە ناکۆکیو شێواویدا بێت، ناتوانێ سادە بێت. کاتێ ئەم شتانە فڕێبدەن و بەڕاستی خەریکی تێڕامان بن، تەواوی ئەو شتە دەروونییانەی کە ناویان گزیو فێڵێ زەینە دەبینن، کاتێ زەینی خۆتان بە وردی بخەنە ژێر چاودێری و لێی ئاگادار بن، ئەوا خۆتان دەزانن کە سادەیی چییە؟ زەینێ کە گرفتاری باوەڕە سادە نیە. زەینێ کە زانست ئیفلیجی کردووە، سادە نیە. زەینێ کە ژن، موسیقا یان شتانیتر بە لاڕێدا بردوویانە، سادە نیە، زەینێ کە لە نەگۆڕیو ئیدارەو چەسپاوی رێوڕەسم و دوعادا گرفتار هاتووە، سادە نیە. سادەیی، پراکتیکی بەبێ ئیدەیە، بەڵام شتی وا زۆر دەگمەنە و مانای داهێنەربوونی هەیە. تا کاتێ کە خۆڵقاندن نیە، ئێمە ناوەندی خراپەکاری، بەڵاو خراپین. سادەیی شتێ نییە کە بکرێ بڕۆن بە دوایداو ئەزموونی بکەن. سادەیی وەك گوڵێك کە لە کاتی خۆیدا دەکرێتەوە، ئامادە دەبێت. کاتێ ئاراستەی گشتی پەیوەندی و دەروون بە تەواوی فام بکەن، بە سادەیی دەگەن. لەبەر ئەوەی کە ئێمە هەرگیز لە بارەیەوە بیرمان نەکردووەتەوە و نەماندیوە، ئاگاداری نین، ئێمە بۆ بوونی دەرەکی تەواو ئەو شتانەی کە هی ئێمەن، بایەخ دادنێین، بەڵام هیچ کام لەمانە سادەیی نیە. سادەیی شتێ نییە کە بتوانین پەیدای بکەین، هەڵبژاردنێك نییە لە نێوان شتی سەرەکی و شتی ناسەرەکیدا. تەنیا کاتێ ئاشکرا دەبێت کە "خود" نەبێت، کاتێ کە زەین لە تۆڕی پێش بینی، دەرئەنجام، باوەڕو ئیدەپەروەریدا نەبێت. تەنیا زەینێکی رزگاربووی لەم چەشنە دەتوانێت بە هەقیقەت بگات و ئەوەی کە ناپێورێت و ئەوەی کە ناکرێ ناوێکی لەسەر دابنین، تێبگات و سادەییش هەر ئەوەیە.

## ٣٣ـ دەربارەی سەرسەری بوون

**پرسیار: مرۆڤێ کە سەرسەرییە، چۆن جدی دەبێت؟**

**کریشنا مورتی:** سەرەتا دەبێت بزانین کە ئێمە سەرسەرین، وانیە؟ مانای سەرسەری بوون چییە؟ لە بنەڕەتدا، یانێ بەستراوەبوون، بەستراوەبوون بە پاڵنەر، کێشە، ئەویترو لە رووی دەروونناسییەوە بەستراوەبوون بە بایەخی تایبەت، ئەزموون و بیرەوەریی دیاریکراو، ئایا تەواوی ئەم کارانە ئێمە بەرەو سەرسەریبوون نابەن؟ کاتێ من هەر بەیانی یان هەر حەوتوویەك ناچارم بڕۆم بۆ کلێسا تا لەوێدا بە "تعالی" بگەم و پشتیوانیم لێ بکرێت، ئایا ئەم کارە من سەرسەری پەروەردە ناکات؟ ئەگەر بڕیار بێت من هەندێ رێوڕەسم تایبەت بەجێ بێڵم تا بەو جۆرە هەستی یەکپارچەیی خۆم راگرم یان لەوانەیە زەمانێك هەستێکم بووبێت و دووبارە بە دەستی بێنمەوە، ئایا ئەم کارە من سەرسەری ناکات؟ ئایا کاتێ کە خۆم تەسلیمی وڵات یان نەخشە یان گرووپێکی سیاسیی تایبەت دەکەم، خۆم سەرسەری نەکردووە؟ بێگومان، ئەم شێوازە گشتییەی بەستراوەبوونە، خواربوون و لادانێکە لە خۆ، ئەم هاوشێوەکردن و خۆ یەکسان کردنە لە گەڵ گەورەتردا، نکۆڵی کردنە لە ئەوەی کە من هەم، بەڵام من ناتوانم ئەوەی کە هەم حاشای لێبکەم، من دەبێت ئەوەی کە هەم تێبگەم و هەوڵ نەدەم خۆم لەگەڵ دونیا، پەروەردگار، حیزبێکی سیاسیی تایبەت یان هەرچی کە ئێوە بڵێن هاوشێوە و یەکسان بکەم تەواوی ئەمانە دەبنە هۆی سەرسەری بیرکردنەوەو لەم سەرسەری بیرکردنەوەشدا، کردەوەیەك روو دەدات، چ لە ئاستی دونیاو چ لە ئاستی ژیانی تاکدا کە هەمیشە خراپەکارانەیە. سەرەتا، ئایا ئێمە دەزانین کە ئەم کارانە دەکەین؟ نەخێر، ئیشی ئێمە پاساودانی ئەوانەیە. ئێمە دەڵێین: "ئەگەر ئەم کارانە نەکەم، ئەی چی بکەم؟ بارودۆخی من لەمە خراپتر دەبێت، مێشکم لێك هەڵدەوەشێت، ئێستا لانیکەم بۆ گەیشتن بە شتێکی باشتر تێدەکۆشم". هەرچی زیاتر تێبکۆشین سەرسەریتر دەبین. من دەبێت سەرەتا لەم مەسەلە تێبگەم. زانینی ئەوەی کە هەم، دانپێدانان بە گەمژەیی خۆم، وردبین نەبوون، وردبین بوون و هەبوونی بەخیلی، یەکێ لە دژوارترین کارەکانە. ئەگەر من بزانم کە چیم و جیای بکەمەوە و دیارییبکەم، ئەوا بە یارمەتیی ئەمە دەسبەکار دەبم. بێگومان زەینێ کە قووڵ نابینێت، زەینێ کە لە "ئەوەی کە هەیە" هەڵدێت، هەڵنەهاتن، پێویستی بە توێژینەوەیەکی زۆر دژوارو نکۆڵیکردنێکی تەمەڵانە هەیە هەر لەو چرکەوەی کە من بزانم سەرسەریم، رەوتێکی قووڵ بیرکردنەوە دەسپێدەکات، بە مەرجێ کە من لەبارەی ئەم سەرسەریبوونەوە کارێ بکەم. ئەگەر زەین بڵێت: "من هیچ نیم و من دەبێت لە تەواوی



مەسەلەکە تێبگەم، من هۆکاری مەسەلەی هیچ بوون و ئەم کاریگەریەی کە بەرهەمەکەی لاوازکردنەوەیە پەیدای دەکەم" ئەوکاتە دەکرێ ئاڵوگۆڕ پێکبێت، بەڵام زەینێکی زەبوون کە دان بە لاوازبوونی خۆیدا دەنێت و هەوڵدەدات کە لە رێگای خوێندنەوە، چاوپێکەوتن لەگەڵ خەڵك، سەفەرکردن و هەبوونی چالاکیی بەردەوام و مەیموون ئاسا، زەبوون و لاواز نەبێت، دووبارە زەبوون و لاوازو هیچ دەمێنێتەوە.

لێرەشدا دەبینین کە شۆڕشێکی راستەقینە تەنیا کاتێ روو دەدات کە لەگەڵ ئەم گرفتەدا بە شێوەیەکی دروست بجووڵێینەوە. بەرەوڕوو بوونەوەیەکی دروست لەگەڵ گرفت وەها متمانەیەك دەدات بە مرۆڤ کە باوەڕ بکەن کێو لە بن دێنێت، کێوی دەمارگیری مەرجی کرانەکان. کاتێ لە بیرکردنەوەی سەرسەری زەینی خۆتان ئاگاداردەبن، هەوڵ مەدەن قووڵ بیر بکاتەوە. زەینی سەرسەری هەرگیز قووڵایی ناناسێت. زەینێکی وا دەتوانێت زانست و زانیاری زۆری هەبێت و وشەکان دووپات بکاتەوە ـ خۆتان لە تەواوی پێداویستییەکانی زەینێکی سەرسەری چالاك کراو ئاگادارن، بەڵام ئەگەر بزانن کە سەرسەرین، قووڵ نابینن ئەگەر لەم وردبینییە ئاگادار بن و تەواوی چالاکییەکانی بەبێ داوەریکردن و بێ تاوانبارکردن بخەنە ژێر چاودێری، ئەوا تێدەگەن کە ئەم سەرسەری بوونە بەبێ ئەوەی کە لە بارەیەوە چالاکییێك ئەنجامبدەن، بە تەواوی لە نێو دەچێت. شتی وا پێویستی بە سەبرو وشیاری هەیە نە حەزو مەیلی تێکەڵ بە تووڕەیی بۆ ئەنجامو رازیبوون. تەنیا زەینی زەبوون و لاوازە کە چاوەڕێی رازیبوون و ئاکام دەمێنێتەوە. هەرچی زیاتر لەم رەوتە ئاگادار بن، زیاتر لە چالاکییەکانی زەین شارەزا دەبن، بەڵام دەبێت روانین و چاودێریی ئێوە هیچ کۆشش کردنێکی تێدا نەبێت بۆ دیاریکردنی خاڵێکی کۆتایی، چونکە هەر کە ویستتان بڕۆن بەدوای ئەنجامدا، ئەوا دووبارە لە دووفاقی "من"و "نە، من"دا کە بەردەوام بوون بە مەسەلەکە دەدات، گرفتار دەبن.

## ٣٤ـ دەربارەی بێقەدری

**پرسیار: زەین دەبێت بە چ شتێکەوە سەرقاڵ بێت؟**

**کریشنا مورتی:** ئەمە نموونەیەکی باشە دەربارەی ئەوەی کە چۆن ناکۆکی ساز دەبێت. ناکۆکی لە نێوان ئەوەی کە دەبێ ببێت و ئەوەی کە هەیە. سەرەتا ئێمە ئەوەی کە دەبێ ببێت واتە ئیدەئال، دەچەسپێنین و دواتر هەوڵدەدەین بە پێی ئەو نموونە ژیان بکەین. دەڵێین

که زەین دەبێت لەگەڵ شتە مکوم و پایەدارەکان، نەبوونی خۆپەسەندی، دڵاوایی، دڵسۆزی و خۆشەویستیدا سەرقاڵ بێت، بەمە دەڵێین سەرمەشقو نموونە، باوەڕ، ئەوەی کە دەبێتو پێویستە، هەروەها هەوڵدەدەین لە سەر ئەو بنەمایە ژیان بکەین. کەواتە، زنجیرەیەك ناکۆکی لە نێوان رەنگدانەوەی ئەوەی کە دەبێ ببێت و راستی، واتە ئەوەی کە هەیە، لە گۆڕێ دایە و ئێمە ئاواتەخوازین کە لە رێگای ئەم ناکۆکییەوە ئاڵوگۆڕ بەسەرماندا بێت، تا ئەو کاتەی کە لەگەڵ ئەوەی کە دەبێت لە تێکۆشان داین، هەست بە پارێزکاری و پاکیو لێهاتوویی دەکەین، بەڵام کامەیان گرنگترە: ئەوەی کە دەبێ ببێت یان ئەوەی کە هەیە؟ زەینی ئێمە لەگەڵ کامەیان سەرقاڵە، ئەڵبەت بە شێوەی پراکتیك نە بە شێوەی ئیدئۆلۆژیکی. لەگەڵ شتە بێقەدرەکان، جیا لەمەیە؟ لەگەل دووڕوویی تاکەکان، مەزنخوازی، چاوچنۆکی، بەخیلی، خراپەوێژی و زوڵم. زەین لە دونیایەکی پڕ لە نزمیو بێقەدریدا ژیان دەکات و زەینێکی بێقەدریش کە نموونەیەکی مکوم و پایەدار دەخولقێنێت، دیسان بێقەدرە. پرسیار ئەوە نییە کە زەین دەبێت سەرقاڵی چ شتێ بێت، بەڵکو پرسیار ئەوەیە کە ئایا زەین دەتوانێت خۆی لە چنگی نزمی و بێقەدرەکان رزگار بکات؟ ئەگەر هەموومان وشیارو لێکۆڵەر بین، بێقەدرییەکانی خۆیان دەدۆزینەوە. وەك: زۆربێژی، چەنەبازیی بەردەوامی زەین، نیگەرانی ئەمو ئەوبوون، تاقیبی ئەوەی کە خەڵك چ دەکەن و چ ناکەن، هەوڵدان بۆ گەیشتن بە ئەنجام، گەورەکردنەوەی کارەکان و شتێ لەم چەشنە. ئێمە بەمانەوە سەرقاڵین و ئەمەش بە چاك دەزانین. ئایا دەتوانین ئەمە بگۆڕین؟ گرفت ئەمەیە، وانییە؟ ئەم پرسیارەی کە زەین دەبێت سەرقاڵی چ شتێ بێت، پرسیارێکی هەڵسەنگێندراو نیە.

ئێستا ئەگەر زەینی من تووشی نزمی هاتبێ و مژوڵی کاری بێقەدر بێ، ئایا دەتوانێت خۆی لەم وەزعە رزگار بکات؟ئایا خودی زەین بەم نێوەرۆکەوە کە هەیەتی بێ قەدر نیە؟ زەین، شتێ جگە لە بەرهەمی بیرەوەری نیە، بەڵام بیرەوەری چ شتێ؟ بیرەوەری شێوازی زیندوو مانەوە، زیندوو مانەوە هەم بە شێوەی جەستەییو هەم رۆحی، ئەڵبەت لە رێگای باش بوونی برێ لە چۆنایەتییەکان، پارێزکاری، کۆکردنەوەی ئەزموون و پایەدارکردنی زەین لە چالاکییە تایبەتییەکانی خۆیدا. ئایا ئەمە بێقەدری نیە؟ زەین کە بەرهەمی بیرەوەری و زەمانە، خۆی لەگەڵ بێقەدری دایە، بۆ رزگاری لەم بێقەدرییە چ دەتوانێت بکات؟ ئایا شتێکی لەدەست دێت؟ تکایە سەرنجی بایەخی ئەم بابەتە بدەن. ئایا زەین وەك چالاکییێك کە خۆی ناوەندەکەیەتی، دەتوانێت خۆی لەم چالاکییانە ئازاد



بکات؟ گومانێك نییە کە ناتوانێت، هەر کارێکی دیکەش بکات دیسان بێقەدرییە. دەتوانێت دەربارەی پەروەردگار لێکۆڵینەوە بکات و بیر بکاتەوە، دەتوانێت سیستەمی سیاسی دابڕێژێت، دەتوانێت خەریکی داهێنانی باور بێت، بەڵام دیسان لە چوارچێوەی زەمان دایە و گۆڕانی تەنیا لە بیرەوەرییەکەوە بۆ بیرەوەرییەکی دیکە، هێشتا لە ناو تۆڕی بەربەست کارییەکانی خۆیدایە. بەڵام ئایا ئەم بەربەست کارییە لە کاتی ئارام بوونی زەین و چالاك نەبوونیدا، هەروەها ئەو کاتەی کە بێقەدری خۆی دەناسێت، ئێستا جیاوازییەك نییە کە چەندە بێقەدری بۆخۆی گەورە کردۆتەوە، لە نێو دەچێت؟ بەڵێ، کاتێ زەین، زەینێ کە بێ قەدرییەکانی خۆی دەبینێت و بە تەواوی لێیان ئاگادار دەبێت، سەرئەنجام ئارام دەبێت، تەنیا لەم کاتەدا دوور ڕشتنی ئەم بێقەدریانە مەیسەر دەبێت. تا کاتێ کە پرسیاری ئێوە ئەمەیە کە: زەین دەبێت بە چ شتێکەوە سەرقاڵ بێت، زەین خۆی بە شتی هیچ و پووچ و بێقەدرەوە مژوڵدەکات، ئێستا چ کلێسا ساز بکات، چ دوعا بکات یان بۆ زیارەتی شوێنە پیرۆزەکان بڕوات.

خودی زەین هیچ و زەبوونە و تەنیا بە گوتنی ئەوەی کە زەین لاوازو زەبوونە، لاوازبوونەکەی لە نێو نابەن. دەبێت لە زەین تێبگەن و زەینیش دەبێت چالاکییەکانی خۆی بناسێت و لە ماوەی ئەم ناسینەشدا، بە ئاگاداربوون لە شەڕی خۆی لەگەڵ کاروبارە بێقەدرەکاندا کە ئەڵبەت خۆی ـ وشیارانە یان ناوشیارانە ـ دروستیکردووە، ئارام دەبێت. لەم ئارامییەدا دۆخێکی داهێنان هەیەو ئەمە هۆکارێکە کە دەبێتە هۆی ئاڵوگۆڕ.

## ٣٥ـ دەربارەی ئارامیی زەین

**پرسیار: بۆچی لە ئارامیی زەین قسە دەکەین؟ ئارامیی زەین چییە؟**

**کریشنا مورتی:** ئایا بۆ ئەوە کە هەموو شتێ تێبگەین، ئارام بوونی زەین پێویست نیە؟ ئەگەر گرفتێکمان هەبێت بۆی نیگەران دەبین، وانییە؟ دەسدەکەین بە لێکۆڵینەوەو قووڵ بیرکردنەوە لەو بارەیەوە و گرفتەکە شیدەکەینەوە بۆ ئەوەی کە بەشکو سەرِی لێ دەربکەین. راستی ئایا لە رێگای کۆشش، راڤە، بەراوردکردن یان هەر جۆرە کۆششێکی زەینی، دەکرێ بە تێگەیشتن بگەین؟ بێگومان، ئەم کارە تەنیا کاتێ مەیسەر دەبێت کە زەین ئارام بگرێت.

دەڵێین کە هەرچی زیاتر لەگەڵ گرفتی برسیەتی، شەڕ یان هەر گرفتێکی دیکەی مرۆیی خۆمان دەرگیر بکەین، زیاتر بە ناکۆکی دەگەین و چاکتر لێی تێدەگەین. ئایا ئەمە راستە؟

سەدەهایە کە شەڕەکان بەردەوامن، ناکۆکیی نێوان خەڵك، گرووپەکان و شەڕەکانی ناوەوەو دەرەوە هەمیشەو بە شێوەی بەردەوام درێژەیان هەبووە. ئایا ئێمە دەتوانین ئەم شەڕو ناکۆکیانە بە هەوڵی زیاترو کۆششی زیرەکانەو ناکۆکیی زیاتر بنبڕ بکەین؟ یان ئەوەی کە کاتێ لە گرفتەکە تێدەگەین کە راستەوخۆ لە بەرامبەریدا راوەستین و لەگەڵ هەقیقەتدا رووبەڕوو ببینەوە. ئێمە تەنیا کاتێ دەتوانین لە بەرامبەر هەقیقەتدا راوەستین کە هیچ ورووژێنەرێك لە نێوان زەین و هەقیقەتدا نەبێتە بەربەست. دیوار، کەوابوو، ئەگەر بڕیار بێت کە ئێمە بە تێگەیشتن بگەین، ئایا ئارام بوونی زەین بایەخی نیە؟ ئێوە ناچارن بپرسن: "چۆن دەکرێ زەین ئارام بکەین؟" ئەمە دژکردەوەیەکی خێرایە، وانییە؟ دەڵێن: "زەینی من وروژاوەو ئێستا بۆ ئارام کردنەوەی دەبێ چ بکەم؟" ئایا هیچ سیستمێك دەتوانێت زەین ئارام بکاتەوە؟ ئایا فورمۆڵ یان ئیسمێك هەیە کە زەین ئارام بکات؟ بەڵێ دەکرێ، بەڵام کاتێ زەین ناچار کەن کە نەجوولێت، ئایا ئەم ئارامییە دیسان ناوی نەجووڵانە؟ یان ئەوەی کە زەین تەنیا لە چوارچێوەی ئیدەیەکدا یان لە دەروونی فورمۆڵو قاڵبێکدا سنووردار کراوە؟ زەینێکی بەم جۆرە، زەینێکی مردووە. لەبەر ئەم هۆیە کە زۆربەی ئەو کەسانەی کە تێدەکۆشن ئەخلاقی ـ بەناو ئەخلاقی ـ بن، کەسانێکی مردوون، چونکە ئەوانە زەینیان فێرکردووە کە ئارام بێت، ئەوانە لەبەر ئەوەی کە ئارام بن خۆیان زیندانی فورمولەکان کردووە. روونە کە زەینێ واینە هەرگیز ئارام نیە، بەڵکو تەنیا سەرکوت کراوەو لە بن دەستیدا راگیراوە.

کاتێ زەین ئارام دەگرێت کە لەم راستییە تێبگات، ئەویش ئەوەیە کە تەنیا کاتێ دەتوانێت بە تێگەیشتن بگات کە ئارام بێت. ئەگەر بڕیار بێت من لە ئێوە تێبگەم دەبێ ئارام بم، ناتوانم دژی ئێوە دژکردەوەیەکم هەبێت، نابێت دەمارگرژ بم، دەبێت تەواوی دەرئەنجام و ئەزموونەکانی خۆم وەلاوە بنێم و لە گەڵتان رووبەڕوو ببمەوە. تەنیا لەو وەزعەدا بە تێگەیشتن دەگەم، واتە کاتێ کە زەین لە مەرجی کرانی من رزگار بێت. کاتێ من هەقیقەتەکەی تێبگەم زەین ئارام دەبێت و ئیتر پرسیاری وەك: چۆن زەین ئارام بکەین؟ نامێنێتەوە. تەنیا هەقیقەت، زەین لە ئیدەپەروەری خۆی رزگار دەکات، بۆ دیتنی هەقیقەت زەین دەبێت بەم راستییە بزانێت کە تا کاتێ پەشۆکاوو نائارامە بە تێگەیشتن ناگات. هێمنی و ئارامیی زەین شتێك نییە کە بە هێزی ئیرادەو ئەوەی کە ئارەزووی دەکات پێکبێت، ئەگەر وابێت ئەوا زەین داخراوو گۆشەگیرە، زەینێکە مردوو، هەربۆیە



توانایی یەکسانبوون و نەرمی نواندنی نییە و لە کردەوەشدا خێرایی لەدەسداوە. زەینێکی لەم جۆرە توانایی داهێنانی نیە.

کەواتە پرسیاری ئێمە ئەوە نییە کە چۆن زەین ئارام بکەین، بەڵکو ئەوەیە کە چۆن دەکرێ راستی هەر گرفتێك هەر بەو جۆرەی کە لە بەرامبەر ئێمەدا رادەوەستێت، ببینین. شتێکی وا لە حەوزێك دەچێت کە دوای وەستانی بە ئارام دەبێت. زەینی ئێمە لەبەر ئەوە پەشۆکاوە کە ئێمە گرفتاری گرفتەکانین و بۆ دوورکەوتنەوە لە گرفتەکان زەین ئارام و هێمن دەکەینەوە. هەنووکە زەین ئەو گرفتانەی بەرجەستە کردووەو هیچ گرفتێك دوور لە زەین نابینرێت و تا ئەو کاتەی کە زەین خەیاڵە وروژێنەرەکان بەرجەستە دەکات و بەدوای تاقیکردنەوەی هەموو جۆرە ئارامییەکەوەیە، هەرگیز بە ئارامی ناگات. ئەگەر زەین بزانێت تەنیا بە ئارام بوون بە تێگەیشتن دەگات، ئەوا ئارام دەبێت. ئەم ئارامییە سەپێنراو نییەو رێكوپێك نەکراوە، ئارامییکە لە رێگای زەینی پەشۆکاوەوە تێگەیشتنی مەیسەر نیە. زۆرێك لەو کەسانەی کە دەگەڕێن بە دوای ئارام بوونی زەیندا خۆیان لە ژیانی چالاك دوور خستۆتەوەو روو لە گوندەکان، پەرستگەو کێوەکان دەنێن یان ئیدەکان دەکەنە پەناگەی خۆیان، خۆیان لە باوەڕێکدا زیندانی دەکەن و لەو خەڵکەی کە دەردی سەریان بۆ ساز دەکەن، دووری دەکەن. ئەم جۆرە گۆشەگیرەی ناوی ئارامیی زەین نیە. بوونی زەین لە چوارچێوەیەکدا ئیدەیەکە، دوورکردنیشی لە خەڵك کە دەبێتە هۆی دژواربوونی ژیان نابێتە هۆی ئارامیی زەین. زەین تەنیا کاتێ ئارام دەبێت کە رەوشی گۆشەگیری لە رێگای کۆکردنەوەوە لە بیر بچێتەوە و لە جیاتی ئەوە، تێگەیشتنی تەواو لە تەواوی شێوازی پەیوەندییەکانی هەبێت. کۆکردنەوە، زەین کۆنە دەکات، تەنیا کاتێ کە زەین تازەیەو لە رەوشی کۆکردنەوەش دوورە دەکرێ بە ئارامی بگات. زەینێکی وا مردوو نیەو لە چالاکترین بارودۆخ دایە. زەینی ئارام، چالاکترین زەینە، بەڵام ئەگەر تاقیبکەنەوە و لێکۆڵینەوەی قووڵی لەسەر بکەن، بۆتان دەردەکەوێت کە لەم ئارامییەدا رەنگدانەوەیەك لە هزر نابینرێت. روونە کە فیکر لە تەواوی ئاستەکاندا دژکردەوەی بیرەوەریەو ناتوانێت لە حاڵەتی ئەفراندندا بێت. لەوانەیە بتوانێت ئەفڕاندن ئاشکرا بکات بەڵام هزر خۆی لەخۆیدا هەرگیز ناتوانێت داهێنەر بێت. کاتێ بێدەنگی دێتە ئاراوە، ئارامی زەین کە ئەڵبەت بەرهەمیش نیە، خۆی نیشاندەدات، ئەوکات دەبینین کە لەم ئارامییەدا، چالاکییێکی بێ وێنە و کردەوەیەکی سەرسووڕهێنەر هەیە کە زەینی شڵەژاوی دەست هزر، نایناسێت. لەو ئارامییەدا شتێ بە ناوی دیسیپلین، ئیدە یان بیرەوەری نابینرێت، ئەو ئارامییە دۆخێکی خوڵقێنەرە کە تەنیا

کاتی فام کردنی مەیسەر دەبێت کە بە تێگەیشتنی تەواوی "من" گەیشتبێتن. ئەگەر وا نەبێت ئارامی مانای نیە. تەنیا لە ئارامییێکی لەو چەشنەدا کە ئەڵبەت بەرهەم نیە، نەمری کە بەدەرلە زەمانە ، ئاشکرا دەبێت.

## ٣٦ـ دەربارەی مانای ژیان

**پرسیار: ئێمە ژیان دەکەین بەڵام نازانین بۆچی بەڕای زۆربەی ئێمە ژیان هیچ مانایەکی نییە، ئایا دەکرێ بڵێین ماناو ئامانجی ژیانی ئێمە چییە؟**

**کریشنا مورتی:** باشە، بۆچی ئەم پرسیارە دەپرسن؟ بۆچی لە منتان دەوێت کە ماناو ئامانجی ژیانتان پێ بڵێم؟ مەبەستی ئێوە لە ژیان چییە؟ ئایا ژیان ئامانج یان مانایەکی هەیە؟ ئایا ژیان خۆی لە خۆیدا مانای خود نیە؟ ئامانجی خود چییە؟ بۆچی خوازیاری زیاترین؟ چونکە ئێمە لە ژیانی خۆمان بە هیچ جۆر رازی نین، ژیانمان زۆر پووچە، روالّەت کارییێکی بێهوودەیە، دێوەزمەیەکی زۆر گەورەو کردەوەیەکی دووبارەکراو و نەگۆڕە. ئێمە خوازیاری لەمە زیاترین، شتێ زۆر زیاتر لەوەی کە ئەنجامی دەدەین، لەبەر ئەوە ژیانی رۆژانەی ئێمە زۆر پووچ و بەئازارەو زۆر بێماناو ماندووکەرەو بە شێوەیەکی تەحەمول نەکراو و گەمژانەیە، دەڵێین کە ژیان دەبێت مانایەکی تەواوتری هەبێت و لەبەر ئەم هۆیە ئێوە پرسیار دەپرسن. بێگومان مرۆڤێ کە ژیانێکی بەشکۆی هەیەو کاروبارو رووداوەکان بەو جۆرەی کە هەیە دەبینێت و لەوەی کە هەیەتی رازییە، تووشی شێواوی و ئالۆزی نەهاتووە، ئەو روونی و پاکی هەیە، کەواتە ناپرسێت ئامانجی ژیان چییە؟

بۆ ئەو خودی ژیان هەم دەسپێکەو هەم کۆتایی. لەبەر ئەوە ژیانی ئێمە پووچە، هابین بە شوێن ئامانجێکەوە بۆ ژیان و تەقەلایشی بۆ دەدەین، گرفتی ئێمە ئەمەیە. ئامانجێکی واینە بۆ ژیان تەنیا دەتوانێت نیشانەی زیرەکیی رووتی زەین بێت و هیچ هەقیقەتێکی نەبێت. کاتێ زەینێکی گرمژەو لاوازو دڵێکی خاڵی بەدوای ئامانجەوەن بۆ ژیان، بێگومان، ئەو ئامانجەش خاڵیو پووچ دەبێت. کەواتە ئامانجی ئێمە ئەوەیە کە چۆن دەتوانین ژیانمان دەوڵەمەند بکەینەوە، نە بە پارەو کارێ لەم چەشنە، بەڵکو لە دەروونەوە دەوڵەمەندی بکەینەوە، شتێکە رازو نهێنیی تێدا نیە. کاتێ دەڵێن ئامانجی ژیان خۆشحاڵ بوون و پەیداکردنی خوایە، بێگومان بە دڵنیاییەوە ئەم حەزو ئارەزووە بۆ پەیداکردنی پەروەردگار



جۆری دەربازبوونە لە ژیان و خوای ئێوە تەنیا شتێکی ناسراوە. رێتان بەرەولای شتێك دەبڕن کە بۆ ئێوە ناسراوە. ئەگەر بۆ گەیشتن بە شتێك کە ئێوە ناوی خوای لێدەنێن، پلیکانێك دروستبکەن، گومانێك نییە کە شتی وا خوا نیە. هەقیقەت تەنیا لە ژیانکردندا فام دەبێت نە لە هەڵاتندا. کاتێ لە ژیندا بەدوای ئامانجێکەوەن، لە راستیدا هەڵدێن و لەوەی کە ناوی ژیانە تێناگەن. ژیان پەیوەندییە، ژیان کردەوەیە لە پەیوەندیدا، کاتێ من لە پەیوەندی شتێ تێنەگەم یان پەیوەندی بشێوێت، ئەو کاتە من بە دوای مانایەکی تەواوتردا دەڕۆم. بۆچی ژیانی ئێمە ئەوەندە پووچە؟ بۆچی ئێمە ئەوەندە هەست بە تەنیایی و بێمرادی دەکەین؟ چونکە ئێمە هەرگیز لە دەروونی خۆمان ورد نەبوینەتەوە و شارەزای خودی خۆمان نین. ئێمە هەرگیز بەلای خۆمانەوە دانمان بەوەدا نەناوە کە ئەم ژیانە هەمووی ئەو شتەیە کە ئێمە دەیناسین و کەواتە دەبێت بە تەواوی لێی تێبگەین. ئێمە بە باشتری دەزانین لە خۆ دەربازبوون و هۆکارەکەیشی ئەمەیە کە ئێمە، بەدوور لە پەیوەندی، بەدوای ئامانجی ژیانەوەین. ئەگەر ئێمە بەرەبەرە لە پراکتیك تێبگەین کە بریتییە لە پەیوەندییەکانی ئێمە لەگەڵ خەڵك، ماڵو دارایی، باوەڕو ئیدەکان، ئەوا تێدەگەین کە پەیوەندی پاداشتی خۆی لەگەڵ خۆیدا دێنێت. ئێوە پێویستان بە هەوڵدانێك نیە. شتێکە وەك تێکۆشان بۆ ئەڤین. ئایا ئەڤین بە هەوڵدان و گەڕان بە دوایدا پەیدا دەبێت؟

ناکرێ ئەڤین پەروەردە بکەین. ئەڤین تەنیا لە پەیوەندیدا پەیدا دەبێت، نە بەدەر لە پەیوەندی، هۆکاری ئەوەی کە خوازیاری ئامانجێکین لە ژیاندا ئەوەیە کە لە دەروونی ئێمەدا ئەڤین پەیدا نابێت. کاتێ ئەڤین هەیە، ئەڤینێ کە نامرێ، ئیتر هەوڵدان و گەڕان بەدوای خوادا پێویست ناکات، چونکە ئەڤین خوایە.

هۆکاری ئەوەی کە ژیانی ئێمە تا ئەو ئاستە پووچەو ئێمە لە دەرەوەی خۆمان بەدوای ئامانجێکدا دەگەڕێین، ئەوەیە کە، زەینی ئێمە پڕە لە شتی تەکنیکیو ئەو چەنەبازیانەی کە لە ئەفسانە دەچن. بۆ تێگەیشتن لە ئامانجی ژیان دەبێ لە دەرگای خۆمانەوە بچینە ژوورەوە. ئێمە ـ چ وشیارانەو چ ناوشیارانە ـ لە بەربەرەکانی لەگەڵ کاروباری لەو جۆرە کە خۆمانین، خۆ دەدزینەوە، هەربۆیە داوا لە خوا دەکەین دەرگایەك کە ئێمە دەستمان پێناگات، بۆمان ئاوەڵا بکات. ئەم پرسیارەی سەبارەت بە ئامانجی ژیان لە لایەن کەسانێکەوە باسدەکرێن کە ئەڤین لە دەروونیاندا نیە. تەنیا لە پراکتیکدا کە هەمان پەیوەندییە، دەکرێ ئەڤین پەیدا بکەین.

## ۳۷ـ دەربارەی پەرێشانی زەین

**پرسیار: مـن گـوێم لـە هـەموو قـسەکانی ئێـوە گرتـووە و تـەواوی کتێبـەکانی ئێـوەم خوێندۆتەوە. بەوپەڕی جدییەتەوە لێتان دەپرسن ئامانجی ژیانی من چییە؟ ئەگەر بەو جـۆرەی کـە ئێـوە دەڵـێن بڕیـار بێـت هـەموو هزرەکـان راوەسـتن، زانـستەکان سـەرکوت بکـرێن و بیرەوەرییەکان لە بیر بچنەوە؟ ئێوە ئەم وەزعەی کە هەیە ـ ئێستا بە باوەڕی ئێوە هەرچی دەبێ ببێت ـ چۆن لەگەڵ دونیایەکدا کە تێیدا دەژین، پەیوەندی دەدەن؟ شتێکی وا چ پەیوەندییەکی لەگەڵ دەروونی نەخۆش و خەمینی ئێمەدا هەیە؟**

**کریشنا مورتی:** دەمانەوێت بزانین ئەم بارودۆخە کامەیە،کە ئەگـەر زانـست و جیاکـەرەوە نەبێت ئەو هەیە، دەمانەوێت بزانین چ پەیوەندییەك لە نێوان ئەم بارودۆخە لە لایـەك و دونیـای چالاکی و ئۆگرییەکانی رۆژانی ئێمە لە لایەکی دیکەوە هەیە. دەزانین کە ژیانی ئێمە هەنووکـە چۆنە، خەمبار، بەئازار، ترسی بەردەوام، شتە کاتییەکان، ئەمە بە باشی دەزانین. دەمانـەوێت بزانین ئەم بارودۆخەی دیکە لەگەڵ ئەودا چ پەیوەندییەکی هەیە، ئەگەر زانـست وەلاوە بنـێین و لە چنگی بیرەوەری و شتانیتر رزگار ببین، ئامانجی ژیان چ دەبێت؟

ئامانجی ژیان، بەو جۆرەی کە ئێستا دەیبینین، چییە؟ ـ ئەڵبـەت نـە بـە شـێوەی تئـۆری، بەڵکو بە شێوەی پراکتیك. تەنیا بۆ زیندوویی، وانیە؟ ـ بە تەواوی بەڵاو خەم و پەرێـشانییەوە و بە تەواوی شەڕو وێرانی و شـتانی لـەم جۆرەیـەوە. ئێمـە دەتـوانین تئۆرییـەکان بخـولقێنین، دەتوانین بڵێین: "ئەمە نابێ ببێت، بەڵام شتێکیتر دەبێ ببێت." بەڵام ئەمانـەش هـەر تئـۆرین، ئەمانە وەك هەقیقەت ناناسرێن. ئـەوەی کـە ئێمـە دەیناسـین پەرێـشانییە و ئـێش و ئـازارو دوژمنایەتیی بێکۆتایی. ئەمەش هەر دەزانین بە مەرجێکە ئاگادار بـین کـە ئەمانـە چـۆن روو دەدەن. ئامانجی ژیان، ئامانجی چرکە بە چرکەی ژیـان بریتییـە لـە بەزانـدن و چەوسـاندنەوەی یەکتر، بە شێوەی تاك یان بە شێوەی کۆ. لەم تەنیاییو ماڵوێرانیـەدا خۆمـان هەوڵـدەدەین لـە یـەکتر کـەڵك وەربگـرین، هەوڵـدەدەین لـە رێگـای سـەرقاڵی، ئـەو بتانـەی کـە بـۆ خۆمـان دروستیدەکەین، زانست، باوەڕی جیاوازو رەنگاوڕەنگ و دیاریکردنی شوناس، لە خۆمـان دوور بکەینەوە ـ هۆشیارانە و ناهۆشیارانە ـ بەو جۆرەی کە ئێستا دەژین، ئامانجی ئێمـە ئەمەیـە، ئایا جگە لەمە ئامانجێکی قووڵترو بەرینتر کە لەمە ئەولاتر بڕوات، پەرێـشانی تێـدا نـەبێت و بەرهەمی کۆکردنەوە نەبێت، نیە؟ ئایا ئەو وەزعەی کە پێویستی بـە هـەوڵ و تێکۆشـان نییـە لەگەڵ ژیانی رۆژانەی ئێمەدا پەیوەندی هەیە.



بە دڵنیاییەوە شتی وا بچووکترین پەیوەنـدی لەگـەڵ ژیـانی ئێمـەدا نیـە. چـۆن دەتوانێـت پەیوەندی هەبێت؟ ئەگەر زەینی من پەرێشان بێت و تووشـی ئـازارو تـەنیایی هاتبێـت، چـۆن دەتوانێ لەگەڵ شتێکدا پەیوەندی هەبێت کە لە خۆی نیە؟ راسـتی چـۆن دەتوانـێ لەگـەڵ درۆو وەهمدا پەیوەندیی هەبێت؟ ئێمە نامانەوێت شتی وا قەبووڵبکـەین، لەبـەر ئـەوە هیـواداری و شێواویی ئێمە، ئێمە ناچار دەکات بە شتێکی گەورەترو پایەدارتر کە دەڵێن پەیوەنـدی لەگـەڵ ئێمەدا هەیە، باوەڕمان هەبێت. ئێمە لە کاتی بێهیواییدا، پەنا بـۆ هەقیقـەت دەبـەین و بـەو هیوایەی کە پەیداکردنی بێهیوایمان لە نێو بچێت.

کەوابوو، دەزانین کە زەینێکی پەرێشان، زەینێ کە کەیلـە لـە کەسـەرو لـە پـووچ بـوون و تەنیایی خۆی ئاگادارە، ناتوانێت ئەوەی لە خۆی بەدەر بێت، تێبگـات. ئـەوەی کـە لـە زەیـن بەدەرە، ناتوانێت ئەوەی لە خۆی بەدەر بێت، تێبگات. ئەوەی کە لە زەین بەدەرە، تەنیا کاتـێ ئاشکرا دەبێت کە هۆکاری پەرێشانی و خەم فام کرابێت یـان دوور خرابێتـەوە. ئـەوەی کـە تـا ئێستا گوتوومە یان دەربارەی باس و گفتگومان کردووە، ئەمەیە کە چۆن دەکرێ بـە خۆناسـی بگەین، لەبەر ئەوە بەبێ خۆناسی، ناسینێکی دیکە نییە یان ئەگەر هەبێت خەیاڵێکـەو بـەس. ئەگەر بتـوانین لـە رەفتـاری گـشتی و چـرکەبە چـرکەی خۆمـان تێبگـەین، دەبیـنین کـە بـە ئاشکرابوونی پەرێشانی خودی ئێمـە ناسـینێکی دیکـە دێتـە دی. ئـەوجا بـە تاقیکردنـەوەی ناسینی خۆمان، بە تاقیکردنەوەی ناسینی دووەم دەگەین، بەڵام ناسـینی دووەم پەیوەندییـەکی بە خۆناسییەوە نیە. کاتێ ئێمە لەم دیوی دیوارو لەتاریکیدا بین، چۆن دەتـوانین روونـاکی یـان ئازادی ئەزموون بکەین؟ بەڵام ئەگەر هەقیقەت بە یەکجاری تاقیکرایەوە، ئەوا دەتوانن لەگـەڵ ئەو دونیایەی کە تێدا دەژین پەیوەندی بکەن.

ئەگەر هەرگیز عەشقمان نەناسیبێت و تەنیا کێشمەکێشی بەردەوام و بەڵاو ناکۆکیمـان ناسیبێت، چۆن دەتوانین ئەشق کە هیچ کام لەمانە نییە تاقیبکەینەوە؟ بەڵام ئەگەر جارێـك ئەمە ئەزموون بکەین، ئیتر پێویست ناکات بـۆ تێگەیـشتن لـە پەیوەنـدیی خۆمـان ئـازار بدەین. ئەوکات ئەڤین، واتە ناسین، کارەکە، ئەنجامدەدات. بەڵام بۆ ئەزمموونی ئەم وەزعـە، دەبێت تەواوی زانیاری، بیرەوەریی کۆکراوەو ئەو چالاکییانەی کە هی خودن، راوەسـتن، بـە جۆرێ کە ئارەزووی رەنگدانەوەی شتەکان لە زەیندا بنبڕ کرابێت. ئەو کاتە بە ئەزموونێکی واوە دونیا دەبێتە مەیدانی کردەوە.

سەفەرکردن بۆ ئەوپەڕی ئەو چالاکیانەی کە ناوەندەکەیان لە زەین دایە، بێگومان دەبێت بە ئامانجی ژیان. بە تاقیکردنەوەی ئەم بارودۆخە کە بۆ زەین ناپێوڕێت، جۆری شۆڕشـی درۆینانـە روو دەدات. سەرئەنجام، ئەگەر ئەڤین هـەبێت هـیچ چەشـنە گرفتێـك، یـەك لەوانـەش گرفتـی کۆمەڵایەتی، نابێت.

گرفتە کۆمەڵایەتییەکانی ئێمـە و ئـەو سیـستەمە فەلـسەفییە تایبەتییـەی کـە کـاری بەربەرەکانی لەگەڵ گرفتەکانە، لەبەر ئەوە بوونیان هەیە کە ئێمە شێوازی ئەڤینداری نازانین. ئەوەی کە من دەڵێم ئەمەیە کە هیچ چەشنە سیستەمێك ـ چ چـەپ، چ راسـت، چ نـاوین ـ هەرگیز ناتوانێت ئـەم گرفتانـە چارەسـەر بکـات. تـەنیا کاتـێ پەرێـشانی، وێرانـی و خـۆ فەوتاندنی ئێمە چارەسەر دەبێت کە ئێمە بتوانین ئەو بارودۆخ و وەزعـەی تاقیبکەینـەوە کـە لە لایەن خودەوە بەرجەستە نەکرابێت.

## ٣٨ـ دەربارەی گۆڕان

**پرسیار: مەبەستی ئێوە لە گۆڕان چییە؟**

**کریشنا مورتی:** روونە کە شۆڕشێکی بنچینەیی پێویـستە. قـەیرانی دونیـا شـتێکە وا دەخوازێت. ژیانی ئێمە خوازیاری شتی وایە. رووداوەکانی رۆژانەی ژیـانی ئێمـە، ئـۆگری‌و شلەژانەکان خوازیاری شتی وا هەن، بۆ گرفـت و گرفتارییـەکانی ئێمـە پێویـستە. بـەڵێ، دەبێ شۆڕشێکی بونیادی و بنچینەیی روو بدات، چـونکە هـەموو شـتەکانی دەوروبـەرمان لێك هەڵوەشاوە. گەرچی بەڕواڵەت رێكوپێکی هەیە، بـەڵام لەڕاسـتیدا جـۆرێ گەنـدەڵی‌و وێرانکردنی خاوو لەسەرەخۆ رێگای رووداں دەپێـوێ و شـەپۆلی رووخێنـەر بـە شـێوەیەکی بەردەوام دەیهەوێ وەپێش شەپۆلی ژیان بکەوێ. کەوابوو، دەبێ شۆڕشێك روو بدات. بـەڵام نە شۆڕشێك کـە لەسـەر پایـەی ئیدەیـەك پایـەدار بێـت. شۆڕشـێکی لـەم چەشـنە تـەنیا بەردەوامبوونی هەمان ئیدەیە نە گۆڕانێکی بنەڕەتی. شۆڕشێك کە بنەماکەی ئیـدە بێـت، دەبێتە هۆی خوێنڕێژی، تێکچوون و قەیران. ناتوانن لە بشێوی و ئاڵۆزی رێکـوپێکی سـاز بکەن، ناتوانن بە ئەنقەست ئاڵۆزی ساز بکەن و سەرئەنجام هیواداربن لە دڵی ئەم بشێویەدا رێکوپێکی بخولقێنیت. ئێوە لە لایەن خواوەندەوە دانەنراون کە ببنە خۆڵقێنەری رێکوپێکی لە شێواوی و نارێکی. ئەمە شێوەیەك بیرکردنەوەی چەوتە لە لایـەن کەسـانێکەوە کـە بـۆ



رێکخستنی کاروباران، خوازیاری شێواویی زیاترو زیاترن، چونکە لە سـەردەمی ئێـستادا، دەسەڵاتیان بەدەستەوەیەو خەیاڵ دەکەن تەواوی شێوەکانی دابینکردنی رێکوپێکی دەزانن. بە سـەرنجدان بـە هـەموو ئـەم بەڵایانـە ـ بـەردەوام دووبارەبوونـەوەی شـەڕەکان، نـاکۆکی نەپچڕاوی نێوان چینەکان، خەڵك، نەبونی یەکسانی پڕ لە ترسـی ئـابووری و کۆمـەڵایـەتی، نەبوونی بەرابەریی تواناییەکان و شیاوی، بوونی کەلێنی گـەورەی نێـوان ئەوانـەی کـە زۆر بەختەوەرو ئاسوودەو ئارامن و ئەوانەی کـە تووشـی نـاکۆکی‌و بێـزاری و بـەڵا هـاتوون ـ بەڵێ، بە سەرنجدان بە هەمووی ئەمانە دەبێ شۆڕشێك سەرهەڵبدات، دەبـێ گـۆڕانێکی پـڕ بە پێست روو بدات، ئایا جیا لەمەیە؟

ئایا ئەم گۆڕان و شۆڕشە بنچینەییە، شتێکی کۆتاییە یـان چرکەبەچـرکەیە؟ دەزانم کـە دڵمان کەڵکەڵەی شتێکی کۆتایی دەکات، لەبەر ئەوە هزرین لەسەر بنـەمای ئـەو شـتانەی کە لە دوورا لەبەر چاو دەگیردرێن زۆر ئاسانترە. سـەرئەنجام ئێمـە دەگـۆڕدرێین، سـەرئەنجام ئێمە بە بەختیاری دەگەین و هەقیقـەت پەیـدا دەکـەین، هاوکـات، وەرن بـا رانەوەسـتین. بێگومان، زەینێکی وا کـە لەسـەر بناغـەی داهـاتوو بیردەکاتـەوە، بڕسـتی کـردەوەی لـە ئێستادا بڕاوە، هەربۆیە وەها زەینێك بە دوای گۆڕانـەوە نیـە، بـەڵکو دوورەپـەرێزی لـێ دەکات. مەبەستی ئێمە لە گۆڕان چییە؟ گۆڕان لە داهاتوودا نیەو هەرگیزیش لە داهاتوودا نابێت. تەنیا لە ئێستاو چرکەبەچرکەیە. کەوابوو مەبەستی ئێمە لە گۆڕان چییە؟ بێگومان زۆر سادەیە: دیتنی درۆ وەك درۆو راست وەك راست. دیتنی راسـت لـە درۆداو دیتنـی درۆ لە ئەوەیدا کە وەك راست وەرگیراوە. دیتنی درۆ وەك درۆو راست وەك راست، ناوی گۆڕانە، لەبەر ئەوە کاتێ شتێك بەڕاشکاوی تەواوەوە وەك هەقیقەت ببینن، ئەو هەقیقەتە رزگـاری بەخشە. کاتێ بزانن کە شـتێ درۆیـە، ئـەوەی درۆیـە لـە نێـو دەچـێت. کاتـێ بـزانن کـە رێورەسم، ئەو شتە بێ‌قەدرانەن کـە دووبـارە دەبنـەوە، کاتـێ هەقیقـەتی باسـەکە بـزانن‌و رەوایی پێ نەدەن، گۆڕان رووی داوە، چونکە بەم شێوە گرفتـارێکی دیکـە لـە نێـو بـراوە. کاتێ دەبینن کە جیاوازیی چینایەتیی چەوت دەبێتە هۆی ناکۆکی، بەڵاو جیایی لـە نێـوان خەڵك، کاتێ بەم هەقیقەتە دەزانن، هـەر ئـەم هەقیقەتـە، رزگـاری بەخـشە. تێگەیـشتنی رووتی ئـەو هەقیقەتـە، نـاوی گۆڕانـە. ئەیوانییـە؟ هەقیقـەت، نـاکرێ کـۆی بکەینـەوە، چرکەبەچرکەیە. ئەوەی کە بکرێ کۆی بکەینەوە، بیرەوەرییـە و ئێـوە نـاتوانن هـەرگیز لـە

ڕێگای بیرەوەرییەوە بە هەقیقەت بگەن، چونکە بیرەوەری بە زەمانەوە پەیوەندیی هەیە، زەمان یانێ ڕابردوو، ئێستاو داهاتوو بوون. لەبەر ئەوە زەمان بەردەوامبوونە هەرگیز ناتوانێت ئەوەی کە هەمیشەیی و نەمرە، پەیدا بکات، هەمیشەیی لە چرکەو ئێستا دایە. ئێستا نە ڕەنگدانەوەی ڕابردووە، نە بەردەوامبوونی ڕابردووە لە ڕێگای ئێستاوە بۆ داهاتوو.* زەینێکە خوازیاری ئەوەیە لە داهاتوودا گۆڕان ڕوو بدات یان وەك کۆتاییێکی یەکجای بۆ گۆڕان دەڕوانێت، هەرگیز بە هەقیقەت ناگات، چونکە هەقیقەت شتێکە کە دەبێت چرکەبەچرکە بێتە دی و لە سەرەتاوە پەیدا ببێت، هیچ پەیداکردن و ئاشکرابوونێك لە ڕێگای کۆکردنەوەوە نایەتە دی. چۆن دەبێ لە حاڵێکدا باری قورسی کۆن هەیە تازە ئاشکرا ببێت؟ تەنیا کاتێ کە ئەم بارە گرانەی "کۆن" ڕاوەستێت، ئێوە دەتوانن تازە پەیدا بکەن. بۆ پەیداکردنی تازەو هەمیشەیی لە ئێستاداو لە چرکەیەکەوە بۆچرکەیەکیتر، مرۆڤ پێویستی بە زەینێکی لەڕادەبەدەر وشیار هەیە، زەینێ کە بەدوای دەرئەنام و کرانەوە نیە. زەینێ کە لە حاڵی کران دایە هەرگیز شەوقو ئارەزووی ڕازی بوون بە تەواوی ناناسێت. مەبەست لەم قایلبوونە، ڕەزامەندی لە ماددەی هۆشبەرو گەیشتن بە ئەنجامێك نیە، بەڵکو ئەو ڕەزامەندییەیە کە زەین لە دیتنی ڕاستی لە ئەوەیدا کە هەیە و درۆ لە ئەوەیدا کە هەیە، بەدەستی دێنێت. تێگەیشتنی ڕاستی یان هەقیقەت چرکەبەچرکەیەو ئەم تێگەیشتنە لە لایەن چرکەوە کە دەیکات بە قسەو وشە وەدوا دەکەوێت.

گۆڕان، کۆتایی ئەنجام نیە، ئەنجام ئاماژە بە پاشماوە دەکات و پێویستی بە هۆو بەرهۆ هەیە. لە هەر کوێ پەیوەندی هۆو بەرهۆیی هەیە، بە ناچار بەرهۆیەك هەیە. بەرهۆ تەنیا بەرهەمی داخوازیی ئێوەیە بۆ گۆڕان. کاتێ ئێوە ئاواتەخوازن ئاڵوگۆڕتان بەسەردا بێت، دیسان لەسەر بنەمای کران بیر دەکەنەوە، ئەوەی کە لە قۆناغی کران دایە، هەرگیز ئەوەی کە لە قۆناغی بوون دایە، ناناسێت. هەقیقەت، بوونی چرکەبەچرکەیەو ئەو خۆشییەی کە بەردەوام دەبێتەوە، ناوی خۆشی نیە. خۆشی دۆخێ لە بوونە کە لەگەڵ زەمان بێگانەیە. کاتێ ناڕازی بوون زۆر هەبێت، ئەم دۆخە جیا لە زەمانە دروستدەبێت، ئەڵبەت نە ئەو نارازی بوونە کە ڕێگایەکی بۆ هەڵاتن پەیدا کردووە، بەڵکو جۆرێك ناڕازی بوون کە ڕێگا دەربازبوونێك ناناسێت و ڕێگا هەڵاتنێکی نیە، ئەوەی کە ئیتر بە دوای ڕەزامەندییەوە نیە. تەنیا لەو کاتەداو لەو دۆخەیدا کە ناڕازی بوونی گەیشتووەتە چڵەپۆپی خۆی،



هەقیقەت دەتوانێت ئاشکرا بێت. ئەم هەقیقەتە نە کڕیارییە و نە فرۆشیاری و نە دەکرێ لە کتێبەکاندا فامی بکەیت، دەبێت چرکەبەچرکە لێی تێبگەیت، لە دوو تۆی بزەکاندا، لە ناخی فرمێسکدا، لە ژێر سینگی گەڵایەکی ژاکاودا، لە بیری وێڵو ئاوارەداو لەوپەڕی خۆشەویستیدا.*

ئەڤین و ڕاستی جیاوازییێکیان پێکەوە نییە. ئەڤین دۆخێکە کە لەودا ڕەوتی بیرکردنەوە وەك زەمان، بە تەواوی ڕاوەستاوە. لە هەر کوێ ئەڤین هەیە، گۆڕانیش لەوێدایە. بەبێ ئەڤین، شۆڕش بێمانایە، چونکە ئەگەر وانەبێت، شۆڕش یانی تەنیا وێرانکردن، گەندەڵی، بەڵاومال وێرانی ڕوو لە هەڵچوونی زیاترو زیاتر. لە هەر کوێ ئەڤین بێت، شۆڕش هەیە، چونکە ئەڤین واتە گۆڕانی چرکەبەچرکە.